# ئیسلام و
# بانگەوازە ڕووخێنەرەکان

**نووسینی**

أنور الجندی

**وەرگێڕانی**

نهاد جلال حبیب الله

# پێشەكی نووسەر

قورئانی پیرۆز سەرنجی موسڵمانان رادەكێشێت بۆ بانگەوازە زیان بەخشەكانو مەزهەبە رمێنەرەكان، بنەرەتە چەسپاوەكانی بەرنگاربوونەوەی گومانەكانیشی داناوە، پیلانی تەنگپێهەڵچنین و پاشكۆیەتیو دەستكاری كردن و بەلارێدابردنی بنەرەتە چەسپاوەكانیشی خستوەتەڕوو، موسڵمانانی ئاگاداركردوەتەوە لە شوێنكەوتەیی ناموسڵمانانو سۆراخ نەكردنی ئەوەی لای ناموسڵمانان هەیە.

خوا دەفەرموێت(وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّاراً حَسَداً مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ) (البقرة:١٠٩).

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوَاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقاً مِّنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ ﴿آل عمران : ١٠٠﴾

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيباً مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿آل عمران : ٢٣﴾

هەروەها خوای گەورە راستی هەڵوێستی مرۆڤایەتی بەرامبەر بە زانست خستوەتەڕوو، باسی كردووە چۆنخەڵكانێك لایانداوەو بەدوای رێبازێكی جیا لە رێبازی خوادا دەگەڕێن.

كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ وَمَا اخْتَلَفَ فِيهِ إِلاَّ الَّذِينَ أُوتُوهُ مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ بَغْياً بَيْنَهُمْ فَهَدَى اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ لِمَا اخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِهِ وَاللّهُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿البقرة : ٢١٣﴾

هەر لە کۆنەوە هەوڵەکانی بانگەوازە ڕمێنەرەکان بەرەو ئامانجی کێشراوی خۆیان هەنگاو دەنێن تا گومان بخەنەڕوو و ڕاستیەکان ساختە بکەن و لەڕێی چەند مەزهەبێکەوە بکەونە وێرانکاری کە ناو و ڕەنگێکی بریقەداریان هەیە، بەگشتیش لەسەر ئەو بنەمایە ڕاوەستاون کە ژەهرو ساختە بخەنە بیری مرۆییەوە تا لە یەکخواپەرستیو مۆرکە مرۆییەکەیو سەرچاوە پێغەمبەریەکەیو کتێبە ئاسمانیەکانەوە بیانبەن بۆ ئەو پیلانە داڕێژراوانەی کە تلمودیەتی کۆن داینراوەولەسەر بنەمای فرەخودایيو ماددیگەری دایمەزراندووە.

لەسەردەمی نوێیشدا چەند زانستێك دەرکەوتون کە هەمان ئەو گومانانەیان هەڵگرتونو هەوڵ دەدەن وەك بنەماو بڕیاری زانستی بیانسەپێنن، ئەو هەولآنە توانیویانە لە ڕێی زانستی بەراوردی ئایینەکانەوە ئەوە بکەن کە دەیانویست کە ئەویش بریتیە لە ساختکردنی ڕاستی و مێژووی ئایین، وەك ئەوەی دەڵێت مرۆڤایەتی زوو فرەخودایی بووەو دواتر پەرەی سەندووە بۆ یەکخواپەرستی، هەروەك توانییان لە ڕێی زانستی ڕەگەزە مرۆییەکانەوە ئەو چەمك و واتایە دابنێن کە دەڵێت ڕەگەزو خوێن باڵابوون دیاری دەکات تا ئەو بنەرەتە چەسپاوەی ئیسلام تێکبشکێنێ کە ڕاوەستاوە لەسەر یەکبوونی ڕەگەزی مرۆیی.

چەند بیردۆزەیەکی جیاجیا هەن کە هەموویان لە بنەڕەتدا بۆ دژایەتی ئایین خراوەتەڕوو تا یەکخواپەرستی دارمێنن، چەند مەزهەبێك هەن کە ئامانجیان دارماندنی ئەخلاقو خێزانە لەڕێی بەرنامەی خوێندنگە کۆمەلآیەتیەکانەوە، هەروەها ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو بەرچاودەکەوێت، بیردۆزەکانی فرۆید سەبارەت بە جنس و بیردۆزەکانی لیڤی برێل سەبارەت بە ڕێژەیی بوونی ئەخلاق بەرچو دەکەون.

بەگشتی لێرەدا هەوڵێکی گەورە هەیە تا بیری مرۆیی لە بواری ڕەسەنایەتی فیترەتەوو مەنتیقی عەقڵو رێگەی یەکخواپەرستیو مۆرکی ئیمانەوە بگوازێتەوە بۆ بواری ملهوڕی و بێ رەوشتیو فرەخودایيو ماددیگەرایی، ئەم بانگەوازانە لە بنەرەتدا پلانی پرۆتۆکۆلاتی دەسەڵاتدارانی صەهیۆنن کە ئەمانەش نوێکەرەوەی پیلانەکانی تلموودن.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە قورئانی پیرۆز بە تەواوەتی هەموو ئەو پیلانانەی ئاشکرا کردووەو ئەو دەستەو کۆمەڵانەشی ئاشکراکردووە کە بیرێکی پێچەوانەی بیری سەرچاوەیی یەکخواپەرستی بەسەر خەڵکدا دەچەسپێنن، پەیامە خواییەکان یەك دوای یەك هاتون بۆ راستکردنەوەی ئەو چەمك و واتایە، ئیسلامیش کۆتای پەیامەکان بوو بۆ تێکشکاندنی ئەو چەمکو واتا لارێکەرەانەو ئاشکراکردنی ساختەکانیان بەوپەڕی روونی و بەڵگەخوازی حەقەوە، ئیسلام رێنموونی دروست و تیشکی ئاشکراکەرە بۆ هەر کەس کە وەری بگرێت.

ئێستاش هەوڵی جوولەکایەتی تلموودی لە چوارچێوەی ئەو رێبازەدا بەڕێوە دەچێت کە بە درێژای سەردەمان بانگەوازی بەرنگاربوونەوەی فیترەت و بانگەوازی ئاسمانی لەخۆگرتووەو لە هەوڵدایە بۆ ملکەچکردنی هەموو جیهان بۆ رێبازی سووخۆری(بەجیهانی کردنی سوو)، ئەمەش ئێستا بەرەو ئەو دەرونانە ڕێ دەبڕێت کە بێئاگان لە حەقو رووناکی حەقیان بەرناکەوێت.

خوای گەورە موسڵمانانی هەڵبژارد تا بەرامبەر بەو ناراستی و لاسارییە ببنە هەڵگری پەیامی باوەرداری و بەرەو خوا چوون، بۆیە ئەرکی تێکشکاندنی ئەو گومانانە لەسەر موسڵمانانە، هەروەها بەرگری کردن لە

حەق و ئاشكراكردنی ساختەكاریەكان نەوە دوای نەوەو سەردەمدوای سەردەم لەسەر شانی موسڵمانانە.

بێگومان ئەو بانگەوازە رووخێنەرانە زاڵ بون بەسەر بیری رۆژئاواییدا و تەنگیان پێهەڵچنیوەو ئەمڕۆش وا بەرەو رووی ئیسلام دێن بەنیازی سەركەوتن بەسەر ئیسلامدا، بەڵام ئیسلام بەهۆی چەمك و واتای دروستی خۆی و قورئانی پیرۆزو وەستانی لەبەردەم رووداوەكانو بەرنگاربوونەوەی بەهێزی بەرامبەر هەموو بیرێكی هاوردەكراو یان هەر مەزهەبێكی ساختە بەردەوام توانای ئەوەی هەیە مەترسیەكان بەرپەرچ بداتەوەو رووی راستی نیشان بدات و ناراستیەكان لەكاربخات، بێگومان بیری تلموودی ماددیگەری فرەخودایی بیرێكی بریقەدارەو هەوڵ دەدات درۆو ئەفسانەكانی وەك راستیەك بەرامبەر بە رەورەوەی راستی بچەسپێنێت.

بە تەنها روانینێك بۆ ئەو مەزهەبانە دەردەكەوێت هەموویان پەیامی كۆنی بتپەرستی ژێر داروپەردووی فەلسەفە هیلینی و غەنووصی و مەجووسیەكانو جادوو و ئەفسانەكانی پێشوون كە هەوڵ دەدەن لەشێوازێكی نوێدا خۆ بنوێننەوە، كاتێ ئەم بانگەشانە دەركەوتن كە ئایین لە كەشوهەوای رۆژئاوادا توانای بەخششی نەما، كاتێ ئەخلاق لە ئایین جیاكرایەوەو چەمك و واتاكانی پەیوەستی ئەخلاقی و بەرپرسیارێتی تاكەكەسی لەناوچوون، ئەم بیردۆزانە كە لەم سالانەی دواییدا پووچی و ناراستیان دەركەوت.

گۆڕانی ئەو رووداوانە كاریگەری زۆری هەبوو لەسەر بەستوویی و بارگرژی رۆژئاوا، ئەمە وایكرد خاوەنانی ئەو بیردۆزانە سەرلەنوێ چاوبخشێننەوە بە بیردۆزەكانیاندا و بەرگی نوێكارییان بەبەردا بكەن،

فرۆیدی و مارکسی و بووگەرایی لێکهەڵوەشان چونکە لەسەر بنەمای ناراستی وەستابوون و پێچەوانەی ڕەوتەکە بوو و لەگەڵ سروشت نەیار و دژ بوون، ئەوانەش ئەو بیرۆ و بانگەوازانەیان لە کەشوهەوای ئیسلامیدا دەخستەروو بیریان چووبوو کە ئەو بانگەوازانە لە کەشی تایبەت بە خۆیاندا سەریانهەڵداوە، بۆیە بە کەشوەوای تر گونجاو نین، بیروباوەڕی ئیسلامی بەهاو بنەرەتی ڕەسەنی خۆی هەیە کە ئایین لە ئەخلاق جیاکردنەوەی پێ قبووڵ نیە، نکووڵی لەوە دەکات مرۆڤ تەنها ماددە بێت، جیاوازی دەکات لە نێوان یاسا مرۆیەکان و یاسا خوداییەکاندا، هەریەك لە خودا و مرۆڤایەتی و جیهان بە جودا لەیەك دەزانێتو نکووڵیش دەکات لە بوونی نێوەند لە نێوان خودا و خەڵکیدا، نەمانی ئەرك و بەرپرسیارێتی بۆ هیچ موسڵمانێك قبووڵ ناکات با لە هەر ئاستێکی ئیماندا بێت، نەیاری ئەو بانگەوازەیە کە بانگەواز دەکات بۆ ململانێی نەوەکان یان ئازادی ڕەهای دوور لە هەر لێپێچینەوەیەك، یان ڕازی نیە بە دژایەتی جیهانی غەیب و زیندووبوونەوەو ڕۆژی پاداشت وەرگرتنەوە، ئیسلام پێی وایە لادان لە هەموو ئەمانە تەنها بۆ ئەوەیە دیواری بەهێزی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا و مرۆڤ و ئایینی حەق بڕووخێنێت تا نەوە دوای‌نەوە وابن و لە کۆشی کۆیلایەتیەکی قورس‌و مەترسیداردا بەرەو دارمانیان بەرێتو بیانکاتە کۆلەی پیلانە تلمودیەکان تا دوای نەمانی بەها و ئەخلاق و توانای نەوەکان تلموودیەت دەستبگرێت بەسەر جیهاندا، ئەمەش مەترسیدارترین پیلانی دژ بە مرۆڤایەتیە کە لەم ساڵانەی دواییدا دەیان بانگەواز و مەزهەب و فەلسەفەی گومڕاکەری ڕووخێنەر خراونەتەروو، هەموویشیان لەمرۆدا مەبەستیان لێدانی ئیسلامە، چونکە ئیسلام تاکە هێزێکە کە دەتوانێت بەرامبەر بە ملهوڕی و مادیگەری و بتپەرستی و بێ ڕەوشتی بوەستێت،

هەمیشە موسڵمان ئامادەن بۆ بێداری و بەرنگاربوونەوەو و وەستان بەرمابەر بە هەر هێزێك کە هەوڵ بدات بازووی موسڵمان نەهێڵێ و پشتیان بشکێنێ یان بنەماکانیان بشێوێنێ یان مەعنەویاتیان داڕمێنێ.

یەکەم ئاماژەی بێداری موسڵمانیش تێگەیشتنە لەو بانگەوازانەو زانینی هەڵوێستی ئیسلامە بەرامبەریان، ئەمەش ئەو شتەیە کە ئێمە لەم توێژینەوە نەوازشیەدا کاری لەسەر دەکەین.

**سەرچاوەکانی مەزهەبە ڕووخێنەرەکان:**

١- غەنووصیەت(فەلسەفەی کۆنی ڕۆژهەلاتی).

٢- لارێی بیروباوەڕی سەبەئیەت.

٣- مەزهەبە ڕووخێنەرەکان و ملهوڕی.

٤- خودا لە پەیامی ئیسلامدا.

٥- بیروباوەڕی زیندوو بوونەوە.

# یەکـــــــەم

## غەنووصیەت( فەلسەفەی کۆنی ڕۆژهەلاتی )

غەنووصیەت چەمکێکی بلاوە کە بەکاردێت بۆ ئەو فەلسەفە ڕۆژهەلاتیەی کە لەپێش هاتنی ئیسلامدا هەبوو و بە گشتی لەسەر تێگەیشتنێکی مرۆیی دامەزرابوو و بیردۆزەیەکی تێکەڵەی چەند بیروباوەڕو مەزهەبێکی لەخۆدەگرت، بە تەواوەتی دژی چەمكو واتای ئیسلامو یەکخواپەرستی یەك بوو کە لەسەر فیترەت راوەستاوە، غەنووصیەت کە بە (Gneso) هاتووە لە چەند مەزهەبێکی جیاجیا پێکهاتووە، لەوانە: مەجووسیەتو مانەویو زەردەشتیو دیصانیو مەزدەکیو مەندائیو مەرقەوی، پەیامی ئەم ڕێبازەش لەمانەدا کۆدەبێتەوە:

پەرستنو پیرۆز راگرتنی ئاگر.

داننان بە دوانە خودابیدا، خوای چاکەو خوای خراپە، یان ڕووناکی و تاریکی.

ڕەواکردنی ەرماکراوەکانو بانگەواز بۆ هاوبەشەکی لە ئافرەت و سامانداو ڕەواکردنی هاوسەرگیری خوشك و برا و خۆشۆردن بە میز.

بەرپەرچدانەوەی سەربرین و نەڕشتنی خوێنی سەربڕاو و خۆدوورگرتن لە خواردنی گۆشت و دەستنەدانە ئاوی پاك.

بێگومان ئەو بیرە کۆنە ڕۆژهەلاتیەی کە لە میصری و فارس و ئاشووری و بابلی و هیندی و چینیەکانەوە دەرکەوت و لەسەر بنەمای

فرەخودایی و دوانە خودایی و سیانەخودایی دامەزرابوو، ئەمە بەرهەمی ئەو بەریەککەوتنە بوو کە روویدا لەنێوان بیری خواپەرستی و پەیامی پێغەمبەران و ئاسمانە ئایینیەکان و نێوان هەوڵی بیری مۆییدا بۆ دەرچوون لە یاسا و سنووو بەها رەوشتیەکان و شەریعەتی خوای گەورەدا.

بۆیە یەکێك لە مەترسیدارتین مەسەلەکان ئەم قسەی هەر توێژەرێکە کە دەڵێت: مرۆڤایەتی سەرەتا فرەخودایی بووە، دواتر یەکخواپەرستی ناسیوە بە دابەزینی سێ ئایینەکە(جوولەکایەتی و مەسیحیەت و ئیسلام)، بەڵام قورئانی پیرۆز ئەمەی تۆمار کردووە(وَمَا كَانَ النَّاسُ إِلاَّ أُمَّةً وَاحِدَةً فَاخْتَلَفُواْ)، (وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ إِلاَّ مِن بَعْدِ مَا جَاءهُمُ الْعِلْمُ بَغْياً بَيْنَهُمْ).

غەنووصیەت لە بیری کۆنی رۆژهەڵاتیدا هاوتای هیلینیەتە لەبیری کۆنی رۆژئاواییدا، غەنووصیەت جەخت دەکاتەوە لە ئیشراق و مەعریفە لەرێی رۆح و بەصیرەتەوە، لەکاتێکدا هیلێنیەت جەخت دەکاتەوە لەسەر عەقڵ و مەعریفە لەرێی مەنتیقەوە، هەرکەس چۆراوەی بیری مرۆیی و پوختەی فەرهەنگی کۆن بخوێنێتەوە دەبینێت چۆن چەندین بیرو دیدی نەگونجاو و شێواو و خراپ پەرتەوازەو بڵاو کەوتون کە لەسەر بنەمای بێرەوشتی و گومان نانەوەو گومرایی و بارگرژیو پێککەوتن دامەزراون.

بۆ نموونە دەهریە باس لە قەدەمیەتی(پێشینەبوونی تەواوی) جیهان دەکات و دەڵێت جیهان بێ دروستکەر و بێ پەرستراو و خوایەکە.

سروشتیەکان دەڵێن خۆڵو ئاوو ئاگر و هەوا بنەڕەتی هەموو شتێکن.

دوانەخوداییەکان دەڵێن دروستکەری جیهان دوانن(چاکەو خراپە) یان تاریکیو رووناکی کە هەردووکیان کۆن و پێشینەن.

بەرهەمیەکان دەڵێن دەبێت ئاگر گەورە و پیرۆز ڕاگیرێت و ڕێ نادەن بە سەربڕینی ئاژەڵ و ڕێ دەدەن بە ڕەوایی زینا و بڕوایان هەیە بە تەناسوخی[1] ڕۆحەکان و سیانەخودایی و تەجەسود.[2]

فەیلەسووفان دەڵێن جەستەکان زیندو نابنەوەو ڕۆحەکانیش بە ئەبەدی دەزانن.

صابیئیەکان دەڵێن دەبێت فریشتەکان وەك خوا دابنرێن و بپەرسترێن.

مەجووسیەکان دەڵێن دەبێت ئاگر بپەرسترێت و نوێژ بکرێت بۆ خۆر و وەك بەگەورەدانانوپیرۆز سەیرکردنی ئاو ڕێ نادەن بە خۆشۆردن بە ئاوو لەبری ئەوەبە میزی گا خۆیان دەشۆن.

بانگەوازە ڕووخێنەرەکانیش وەرگیراوی مەزهەبە گومڕاکەرەکانن، قەرمەتیەکان باس لە هاوبەشەکی ئافرەت و سامان دەکەن کە ئەمەش بانگەوازی مەزدەکی بوو، باتینیەکان نکووڵییان دەکرد لە زیندووبونەوەو پاداشت وەرگرتن ، سەبەئیەت باسی وصایەو ڕەجعە دەکەن، بەوجۆرە هەموو زادەی بانگەوازە کۆنەکانن.

یەکێکلە مەترسیدارتین بانگەوازەکانی ئەو مەزهەبانە بۆ دژایەتی ئیسلام بانەوازە بۆ نەمانی ئەرك و بەرپرسیارێتی سەرشان و لەکارخستنی پەیوەستی ئەخلاقی و بانگەواز کردن بۆ نەهێشتنی فەرزەکانی ئیسلام و ڕەواکردنی قەدەغەکراوەکان و ڕۆژوون لە ئارەزوو و چێژەکان و لەناوبردنی

---

[1]- گوازرانەوەی گیانێکە لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر.

[2]- نکوولّی دەکەن لە بوونی خوا گەورە و ڕۆژی دوایی‌چونکە هیچکام هەستپێکراو نین.

جیاوازیە روونەکانی نێوان چاکەو خراپەو لەخواترسان و پارێزکاری و بێرەوشتی و بەرزی و پەستی.

دکتۆر عەلی سامی نەشار چەمك و واتاو مێژووی غەنووصیەتی خستوەتەروو و ئاماژەی بەوە کردوە وشەی غەنووص(gneso) واتای مەعریفە دەگەیەنێت، بەڵام هێندەی نەبرد واتایەکی تری وەرگرت کە بریتی بوو لە چوون بەرەو گەیشتن بە مەعریفەی باڵا بە جۆرێ لە کەشفکردن یان هەوڵی چەشتنی راستەوخۆی مەعریفەی خودایی کە راستەوخۆ بچێتە ناو دەروونەوە، هەروەها ئاماژەی بەوە داوە غەنوصیەت چۆڕاوەی چەند مەزهەبێکی فارسی و سریانی و ئەفلاتوونی و فیساگۆرسییە و جۆرە پەیوەندیەکیشی هەیە لەگەڵ مەسیحیەت و جوولەکایەتی و زەردەشتی و مانەویدا.

**دکتۆر نەشار دەڵێت:**(مەسیحیەت بە سەختی بەرنگاری غەنوصیەت بوویەوە، بەڵام غەنووصیەت توانی بەسەختی لێی بدات و سەرکەوێت، ئیتر زاڵ بوو بەسەر دەستەیەکی گەورە بیریارانیدا، لەپێش هەموویشیانەوە قەشە ئۆگەستینۆس، بەڵام ئیسلام بەرامبەر غەنوصیەتی زەردەشتی و مانەوی و دوانەخودایی وەستا، ئەو بیروباوەڕانە لە شێوەی چەند دەستەیەکی تایبەتدا دەرکەوتن کە ناسرابوون بە باتینیەکان یان قەرمەیەکان.

هەروەها دکتۆر نەشار ئاماژە دەدات بەوەی غەنوصیەت توانی سێبەری خۆی بسەپێنێ بەسەر فەلسەفەدا بەتایبەت فەلسەفەی صۆفیگەرایی کە پەیوەستە بە بیردۆزەی فەیض یان عەقڵی یەکەم یان رووناکیەوە.

حەلاجو سوهرەوەردی کوژراو بە قوربانیانی غەنووصیەت دادەنرێن کە سنووری پەیام و واتای ئیسلامیان بەزاند لە مەسەلەی ژیانی باڵادا کە ئەوەشیان دەدایەوە پاڵ هەڵسوکەوتی باتینی دوور لە ڕێبازی ئیسلام سەبارەت بە مەعریفە کە لە قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوەی دەگرت.

## زیندووکردنەوەی باتینیەتی کۆن

زیندووکردنەوەی باتینیەتی کۆن بۆ بەجێگەیاندنی هەمان ئەو ڕۆڵەیە کە پێشتر هەیبووە، دەهریەکان لە باتینیەتی کۆنەوە ئەوەیان وەرگرت کە دەیانویست بۆ هەڵگەرانەوە لە ئیسلامو بڕێ زێدەکارییان بۆ کرد بۆ توانای زیاتری ساختەی ڕووداوەکان و نیشاندانی وەك شەوق و درەوشاوەیەکی بەرچاو کە بەمەش دەتوانن ملهوڕی و بێرەوشتی لە ژێر پەردەی عەلمانیەتدا بڵاو بکەنەوە.

دیارە باتینیەتی کۆن لەلایەن کەسێکی جوولەکەی کۆنی ناسراوەوە بنەرەتی دانرا کە ئەویش عەبدوڵای کوڕی سەبەئە کە ناسراوە بە ئیبنوسەودا، ئەم کەسە پێی وابوو خوا لەناو هەندێ بەندەیدا حلول دەکات و پاش مەرگی ڕووکەشیان دەگەڕێنەوە، لەم کەسەوە دەستەکانی سەرکەشان دەرکەوتن، دواتریش لە سەدەی چوارەمدا لەسەر دەستی پاشماوەکانی مەجوسیەتی داڕماو بیرە باتینیەکان بەرچاو خرانو لەچەند دەستەیەکی جیاجیادا دەرکەوتن کە یەك ئامانج پێکەوەی دەبەستنەوە، ئەویش لەناوبردنی ئیسلام و شەریعەتی هەتایی ئیسلام بوو.

یەکێ لە بیرە هەرە مەترسیدارەکانی باتینیەت کە تا ئەمڕۆش مەزهەبە ڕووخێنەرەکان دەیخەنە ڕوو بریتیە لەو تەئویلکردنەی کە فرەڕوانینی

لێدەکەوێتەوە بێ ئەوەی پشت ببەستن بە یاساو بنەمایەکی دیار، ئەمەش شوێنکەوتنی ئارەزووبازیەکە کە هاودەم بەوە حەقیش لەناو دەبات یان هیچ نا مەشخەڵەکانی حەق دەشێوێنێت، بۆیە زیانی باتینیەت بۆ سەر ئیسلام زۆر زیاترە لە دوژمنە ناسراوەکانی ئیسلام، چونکە باتینیەکان هەموو ئارەزوویەکیان ڕەواکردووە بۆ شوێنکەوتەکانیان‌و فەرزی پەرستشەکانیان لەسەر نەهێشتون‌و تەئویلکردنی پایەکانی شەریعەتیشیان بۆ ڕەوا کردون.[1]

زانایانی ئیسلام لە وەرگێڕاوی نووسینەکانی یۆنانەوە زانستی سروشتی‌و بیرکارییان قبووڵ کرد، هاوکات مەسەلەکانی ئیلاهیات‌و میتافیزیقیای یۆنانییان بەرپەرچ دایەوەو وتیان لەو بوارەدا زانستی خۆمانمان هەیەو پێویستمان پێی نیە.

ئەوەش سەلما ئەو ئیلاهیاتەی یۆنانیەکان تەنها زانستی بتەکانەو چۆڕاوەی بیرو واتای فرەخودایی نەتەوەییە کە وەریانگێڕاوە بۆ زمانی فەلسەفە و ڕەنگێکی هونەرییان پێ بەخشیوە.

مەسەلەی باسی عەقڵەکان‌و گەردوونەکانیش هێمای بتپەرستی ئیغریقی کۆنە، کردار و جووڵەو هەڵسوکەوتیشیان عەقڵیەتێکە کە نەوە دوای نەوە گەیاندوویانە بە یەکتر و بتپەرستیەکی پێچەوانەو نەیار بە یەکخواپەرستیە و شوێنی بیروباوەڕی سیفەتە خودابیەکانی گرتوەتەوە.

لە ڕوانگەی ئەم چەمك و واتایانەی ئیلاهیاتی یۆنانیەوە دژایەتی کردنی یەکخواپەرستی و پێغەمبەرایەتی و سروش و زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی‌و

---

[1] - الإسفراييني: التبصر بالدين.

پاداشت وەرگرتنەوە دەردەکەوێت کە بنەرەرتی رەسەنی ئیسلامن‌و هەرکەس نکوولّییان لیّ بکات بە دەرچوو لە ئایین ئەژمارد دەکرێت.

دوژمنانی ئیسلام و دەولّەتی ئیسلامی بلاّوکردنەوەی ئیلاهیاتی یۆنانییان کردە پێناوێك بۆ دارماندنی ئیسلام لەسەر بنەرەتی ناسراوی (دارماندن لە ناوخۆوە)، چونکە نەهێشتنی ئەرك و نکوولّی کردن لە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پابەندی ئەخلاقی و پاداشتی رۆژی دوایی دەرگایەکی فراوان وەالاّ دەکات لەبەردەم ئازادی ئارەزووبازی‌و بانگەوازکردن بۆ بیّ رەوشتی و جەستەپەرستی، ئەمەش ئەو ئالاّیانە بوون کە بانگەوازی باتینی بە هەموو لایەنەکانیەوە و لەژێر ناوی جۆراوجۆردا بەرزی کردبوویەوەو دەروازەیەکی ساختەشیان بۆ ئەو ئامانجەیان دانابوو کە دەیانوت شەریعەت بە نەزانیەکان پیس بووەو هیچ هیوایەکی شۆردن و پاکبوونەوەشی نەماوە تەنا بە فەلسەفە نەبێت.

زانای پایەبەرز ئەبولحەسەنی نەدەوی دە لێت:(هەستیان بەوەکرد کە ئیسلام لە مەیدانی جەنگدا شکست ناخوات و موسلّمانان بانگەواز بۆ ملهوڕییان پیّ قبوولّ نیە، چونکە ئەوە غیرەتی ئایینیان کلّپە پیّ دەدات، بۆیە بۆ گەیشتن بە ئامانجیان ئسلوبێکیان گرتەبەر کە موسلّمانان بێزار نەکات‌و نەیانورووژێنێت، ئەویش جیاکاری نێوان رووکەش و ناخە، ئەمەش لەرێی پەیوەندی نێوان وشەو چەمکە ئایینەیکان و واتاکانیان.

چونکە لەرێی ئەو چەمکانەوە پەیوەندی نێوان موسلّمانان بە رابردوو و سەرچاوە پاك‌و پوختەکانیانەوە راوەستاوە، جا ئەگەر ئەو پەیوەندیەی نێوان وشەو واتاکانیان پچڕا و ئیتر وشەکان واتایەکی دیارو تایبەت

نەگەیەنن ئەوکات گومان و راجیایی لەسەریان دەردەکەوێت و ئوممەتی ئیسلامیش دەبێتە نێچیرێك بۆ هەر بانگەواز و فەلسەفەیەك.

ئەو لادەرانە دەڵێن لەپشت رووکەشی قورئان و فەرموودەوە ناخ و شاراوەیەك هەیە کە وەك کرۆك‌و توێکڵ وان، ئەم روانینانە بۆ نەزانان وێنەیەکی جوان و بۆ ژیرانیش چەند هێما وئاماژەیەك دادەنێت بۆ چەند راستیەکی شاراوە، هەرکەس بیری نەخاتەکار بۆ رۆچوون لە نهێنی و شاراوەکاندا و رازی بێت بە رووکەشی شتەکان، ئەوە هەر کۆتکراوە بە تەکلیفاتی شەرع، بەڵام هەرکەس بەرزبێتەوە بۆ ئاستی زانستی ناوەکی(باتینی) ئیتر ئەرکی لەسەرشان نامێنێت.

بڕیاری ئەوە دەدەن کە هەموو وشەو واتایەکی شەرعی رووکەش و ناخی هەیە، ناخەکەش بریتیە لە کرۆکەکە، بەپێی ئارەزووی خۆیان دەنەونە لێکدانەوەی ناوەکی بۆ ئەو چەمکە شەرعیانەی کە بە تەواتور واتایان هاتووە، دەڵێن شەریعەتکان باتینێکیان هەیە کە تەنها ئیمام دەیزانێت یان مەگەر نوێنەری ئیمام بیزانێت، سەبارەت بە رۆژی دوایی و مەسەلەکانی تریش هەروا دەڵێن، هەموویان نموونەو هێمان بۆ شتانێکی باتینی، بۆ نموونە واتای خۆشۆردن واتای نوێکردنەوەی بەڵێنە بۆی، واتای زوهور دوورەپەرێزی گرتنە لەهەر مەزهەبێك کە پێچەوانەی باتینیەت بێت، واتای تەیەموم وەرگرتنی زانستە لە مۆڵەت دراوەوە، واتای نوێژ نزاکردنە بۆ ئیمام، واتای زەکات بڵاوکردنەوەی زانستە بۆ کەسی بە تەزکیە، واتای حەج زانستخوازیەکە کە عەقڵ هەوڵی بۆ دەدات.

بانگەوازی باتینی لەسەر دوو بنەرەت وەستاوە، بنەرەتی یەکەم جیاکاری نێوان رووکەش و باتینە، بنەرەتی دووەم بەچاکتردانانی باتینە،

ئیتر هێندە کەوتنە سوکککگرتنی ڕووکەش تا ئەوەی کردیانە جێی گاڵتەو گەمە، پێشەوایانیان خوێندکارە باڵاکانیان وا فێر دەکرد کە ڕووکەش نەگونجاو و پەکککەوتەیە و زانستیش چڕوپڕەو تەقلیدێکی تەواوی وایە کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە و هیچ ژیانی تێدا نیە و کەسانێ کە بە ڕووکەش کار دەکەن بێباوەڕن بەڵکو هاوەڵ دانەرن.

باتینیەت لەسەر بنەمای فەلسەفەی لاهووتی یۆنانیو سروشتگەرایی دامەزراوە، ئەوان چەمك و بیری فەلسەفەی یۆنانیو بیروباورەی یۆنانیەکانیان لە ئەدەب و ڕاڤەی بیروباوەڕی خۆیاندا بەکاردەهێنا، دکتۆر زاهید عەلی ئاماژە دەدات بەو واتایەو دەڵێت: بڕوامان وابوو هەموو ئەو بیردۆزانەی کە لە زانستی کۆنی هەیئەتو زانستی سروشگەراییو ئیلاهیاتدا هاتون دروستن و هیچ کومانیان لەسەر نیە، بۆیە بۆ سەلماندنی بانگەوازمان پشتمان پێ دەبەستن، بانگخوازانی باتینیەت سوورن لەسەر ئەوەی خەڵکی بەو شتە لەخشتەبەرن کە حەزیان لێیەو لەرێی ئارەزوو و خواستەکانیانەوە قسەیان بۆ بکەن، مێژوونووسان گوتارەکەی رێبەری قەرمەتیەکانیان هێناوە کە تیایدا دەڵێت: بانگەوازی خەڵکی بەوجۆرە بکە کە لەرێی خواستو حەزەکانیانەوە لێیان نزیك بیتەوە و هەرکامیان وا تێبگەیەنە کە تۆ یەکێکیت لەوان، لە پێگەیشتنی هەرکامیان دڵنیا بوویت پەردەیکەی بۆ لابەرەو ڕاستیەکەی پێ بڵێ، ئەگەر بەسەر کەسی فەلسەفیدا سەرکەوتیت بیپارێزە چونکە بارمان لەسەر شانی ئەوان وەستاوە.

باتینیەت هەوڵیدا ئەو چەمكو واتا ئیسلامیانە بشێوێنێت کە قورئان باسی کردونو موسڵمانانیش یەکدەنگن لەسەر واتاکانیان وەکپێغەمبەرایەتی و پەیامی خوا و فریشتەو زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوای و

بەهەشت و دۆزەخ و شەریعەت و فەرز و واجب و حەلال وحەرام و نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج، ئەوان بۆ هەرکام لەو چەمکانە واتایەکی پێچەوانەی ئەو راستیە بنەرەتیانە داناوە کە هەیانە، مامۆستا نەدەوی وا وەسفی بانگەوازی باتینیەت دەکات کە شۆڕشێکە بەسەر پێغەمبەرایەتی موحەممەدیدا، چونکە نکوولّی دەکات لەو واتاو چەمکە ئایینیانەی کە ئوممەت یەکدوای یەك وەریانگرتووەو راڤەی وشە شەرعیەکان و چەمکە ئاینیەکان دەکات بەپێی ئارەزووی خۆیو جیاکاری دەکات لەنێوان رووکەش و ناوەڕۆکدا، تا ئەوەی باتینیەت پێی وایە تەنزیل جەستەیە و تەئویلیش رۆحە، وەك توێژەران و مێژوونوسانیش ئاماژەیان پێداوە ئامانجیان رون و راشکاوە کە لەناوبردنی شەریعەتی ئیسلامیە کە خۆی دەبینێتەوە لە دەولّەتی ئیسلامیدا تا بتوانن کۆمەلّگەیەکی نویّ دابمەزرێنن کە لە پەیامەکانی ئیخوانوصەفا وتاقمەکانی تریشدا بە هێماو نیشانەگەلێك ئاماژەیان پێداوە، چونکە دەلّێن دەسەلاتێك پەیوەشت بێت بە هەموو خەلّکی سەردەم و هەموو دنیای لەژێر دەست بێت جەستەو پێناو و سەرباز و لاشەی هەیە و وەك سەر واتە عەقلّ لە جەستدا وایە.

ئەو بانگەشەو بانگەوازانە دووروانو ملهوڕانو چێژویستان کۆدەکاتەوە، لەو بانگەوازە کۆنەوە ئەم بانگەوازە نوێیانە دەرکەوتن(بەهئی، سیۆصۆفی، دەهری، رۆحگەرای نویّ، نەرڤانا، یۆگا)، هەموو ئەمانەش کاردەکەن لەسەر تەئویلکردنی وشە شەرعیە موتەواتیرەکان، تەئویلێك کەلەسەر زمانو قیاس و مەنتیق دانەمەزراوە، بەلّکو نکولّی دەکات لە راستیە غەیبیەکان، ئامانجی بانگەوازی باتینی بریتیە لە: ملهوڕی لە بیروباوەڕدا، لەکارخستنی پابەندی ئەخلاقیو بەرپرسیارێتی تاکەکەسی کە دواجار بریتیە لە پاداشت وەرگرتنەوەی رۆژی دوایی.

بەردەوام بانگەواز کردن بۆ تەئویل یان زانستی ناوەکی لە هەرە مەترسیدارترینی ئەو بانگەوازانەیە کە لە سەردەمی نوێدا بەرەورووی موسڵمانان دەبێتەوەو مەبەستیشی نەهێشتنی ئەرك و بنەرەتەکان‌و ڕژایەتی کردنی سنووری خواو هاندانی خەڵکە بۆ ئارەزووبازی وەك یەك لە فەیلەسووفانی هاوچەرخ (پۆل هازار) دەڵێت(ئایا بەختەوەری وازلێ بێنین بۆ رۆژی دوایی، لەسەرمانە لەسەر زەویدا ئەوە بێنینە دی، خێرا بکەن وا ئێمە لە گالیسکەیەکداین کە هیچ زامنێ نیە بۆ رۆژی دوایی و تەنها ئێستا گرنگە، ئەوەی چاوەڕێی داهاتووە بێئاگایە، با یەکەمجار خۆشگوزەرانیەکی تەواوی مرۆیی زامن بکەین).

دەستەواژەی باتینی واتە ئەو بەرهەمە کۆتاییەی کە هەوڵەکان پێی گەیشتون بۆ دروستکردنی وێنەیەکی هەڵخەڵەتێنەرو لەخشتەبەری بریقەدار، ئەویش ئەوەیە بڵێن هەر واتایەکی ئیسلام و قورئان واتی رووکەش و باتینی هەیە، بۆ هەر تەنزیلێك(ئایەتێك) تەئویلێك دادەنێن، ئەبولعەلای عفیفی دەڵێت:(تەئویلی ئیخوانوصەفا بۆ ئایەتەکانی قورئان‌و فەرموودە بەتایبەت ئەوانەی پەیوەستن بە رۆژی دوایی وەك بەهەشت و دۆزەخ‌و زیندووکردنەوەو حەشری رۆژی دوایی...هتد، ئەو کۆمەڵە تەئویلیان دەکردە پێناوێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجی خۆیان کە سەرواژووکردنی ئیسلام و دارماندنی تەواوەتی بیروباوەڕو بنەماکانیەتی.

## لارێیی بیروباوەڕی سەبەئیەت

یەکێك لە مەترسیدارترین بانگەوازەکان بۆ لارێکردنی بیروباوەڕو دەرکردنی لە بنەرەتە قورئانیەکانی لەگەڵ هاواری عەبدوڵای کوڕی سەبەئدا دەستی پێکرد، ئەو بە خەڵکانێکی دەوت: مەگەر شتێکی سەلماو نیە کە عیسای کوڕی مەریەم دەگەڕێتەوە بۆ سەر دنیا؟ بەڵێ، دەی پێغەمبەری خودا لەو فەزڵی زیاترە، دەی ئیتر چۆن کاتێ فەزڵی لەو زیاترەو لە عیسا گەورەترە چۆن نکوڵی دەکرێت لەوەی بێتەوە سەر دنیا؟ هەروەها دەیوت: هەموو پێغەمبەرێك وەصیەکی هەبووەو عەلیش وەصی موحەممەدە کە موحەممەدیش کۆتای پێغەمبەرانە و عەلیش دەبێتە کۆتای وەصیەکان.[1]

ئەمە واتە ئیبن سەبەو بانگەواز دەکات بۆ دوو بنەما کە لە ئایینی خوادا هیچکامیان بوونیان نیەو بەرهەمی لارێیی جوولەکەن، بنەمای گەرانەوە(رەجعت) و بنەمای ویصایە، لە کرۆك و راستی ئیسلامدا موسڵمان شتی وای نیە و دان بە شتی وادا نانێت.

ئیبن سەبەو پیرۆز راگرتنی تایبەت بە ئیمامی عەلی داناوەو بە وەصی و وەلی و مەهدی و پێشەواو پێغەمبەر و خودایش وەصفی دەکات.

تەبەری سەبارەت بە بەسەرهاتی عەبدوڵای کوڕی سەبەو باس دەکات کە چۆن بانگەوازە پڕ مەترسیەکەی بەرەورووی ئیسلام کردوەتەوە لە ماوەی خیلافەتی گەورەمان عوسماندا رەزای خوای لێ بێت، ئێمە دەزانین لە ئیسلامدا وەصی و تەناسوخی رۆح بوونی نیە، هەمو ئەمانە زادەی بیری

[1]- تا الطبري: ج٣، ص٣٧٨.

کونی مەجووسیەتن، ئەمەش یەکەم دەنگۆ و بەزمێ بوو کە بەرەو ڕووی ئیسلام هەڵگیرسا.

ئەو توێژەرەی بە وردی توێژینەوە دەکات لە کاریگەری عەبدوڵای کوڕی سەبەئو بزاڤەکەی لە میصر و کووفەو شام و حیجازدا، بەروونی بۆی دەردەکەوێت بیروبۆچوونەکانی تەنها بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی بون لە سەردەمی گەورمان عوسماندا ڕەزای خوای لێ بێت، ستەمیش بووە بەرامبەر بە گەورەمان عەلی ڕەزای خوای لێ بێت کە ئەم کارە بوو بە سەرچاوەی ئەو فیتنەیەی لەو قۆناغەدا تووشی موسڵمانان بوو و دواتریش زۆرێك لە ڕووداوەکان پەیوەست بوون بەو فیتنەوە.

**مامۆستا موحەممەد سەعید ئەفغانی دەڵێت:** ئەوەی هەندێ مێژوونووس سەبارەت بە هەندێ هاوەڵ دەینوسن وەك عەلی و تەلحەو زوبەیرو عائیشە، ئەمە وەك هەنگاوی دووەم دێت، بەڵام هۆکاری گەورە کە بەزو و ئاشوبی نایەوە پیلانێکی فراوانی تونجوتۆڵ بوو کە چەند شەیتانێکی شارەزا شەونخوونییان بۆ کێشا و لە هەموو ناوچەکانەوە کاریان بۆ کرد تا بەرهەمی خۆی دا، بەڵام مێژوونوسان زۆر گرنییان نەداوە بەو پیلانەو بە جوانی روونیان نەکردوەتەوە، سەری گەورەی ئەو پیلانە عەبدوڵای کوڕی سەبەو بوو کە ناسراوە بە ئیبن سەودا، من تەواو بڕوام بەوەیە ئەگەر هەموو ئەو هەوڵانەش نەبوونایە کە باسکراون ئەوا ئیبن سەودا بە تەنیا خۆی بەس بوو بۆ گەیشتن بەو مەرامە پیس و شوومە.[1]

توێژەران لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئیبن سەبەو گەورەو پێشرەوی دەستەو کۆمەڵێکی تایبەتی شاراوە بووە کە نیازی لەناوبردنی دەوڵەتی

---

[1] - من بحث عن الصهیونی الأول، عبدالله بن سبأ.

ئیسلامی بوو و خودی ئیسلامیش بووە، ئەم کۆمەڵەش لە بەرژەوەندی دەوڵەتێکی بیانیدا کاری کردووە کە ئەویش دەوڵەتی رۆمانیە، چونکە موسڵمانان لە چەند ساڵێکی کەمدا دوو بەشی گەورەی دەوڵەتی رۆمانییان لێسەندبوو کە بریتی بوون لە میصر و شام.

ئیبن سەبەئی دامەزرێنەری ئەو کارە مەترسیدارە بوو بە دامەزرێنەر بۆ بزاڤێ کە دواتر بزووتنەوەی باتینی لێ دەرکەوت و بانگەوازی رۆژئاواگەری و شالاوی رۆشنبیری سەردەمی نوێیش درێژکراوەی ئەو بزاڤەیە.

ئەمهەوڵە بۆ ئەوە بوو تا بیروباوەڕی ئیسلامی لە بنەڕەتەوە لەناوبەرێت‌و شتێکی بخاتە ناو کە تیایدا نیە، ئەوەی پێی دەوترێت رەجعە و ویصایە بەرهەمی ئەم کارەو ئەو کەسەیە، توێژەران جەخت لەوە دەکەنەوە ئیبن سەودا موسڵمانانی دا بەگژی یەکدا و هۆکارێکی دووبەرەکی نێوان موسڵمانان‌و پەرتکردنی یەکریزی شوێنکەوتوانی یەك ئایین بوو، ئەو هاوەڵانی خۆی بانگ دەکردو دەیوت: لەم کارەدا لێ بنەون و بیجووڵێنن و بنەونە تانەدان لە سەرکردەکانتان‌و وا نیشان بدەن فەرمان دەکەن بە چاکەو رێگری دەکەن لە خراپە تا سەرنجی خەڵکی بە لای خۆتاندا رابکێشن‌و خەڵکیش بانگ بکەن بۆ ئەمە.[1]

بێگومان بانگەوازەکەی ئیبن سەبەء بۆ تێکدانی بیروباوەڕ دەستێ بوو بۆ شێواندنی ئیین و دووبەرەکی نێوان موسڵمانان و گاڵتەکردن بە مێژوو و بە کەمگرتنی بنەرەتەکان و دابەزاندنی شان‌و شکۆی ناوو سیفاتی خودا و خراپکردنی رەوشتی خەڵك و سەرسام بوون و شانازی کردن بوو بە هەر مەزهەب و رێبازێکی بیانی، لەم خاڵەوە بزووتنەوەکانی دارماندن لەناو

---

[1]- الطبري: ج٣ص٥٠٧-٥٠٨.

موسڵماناندا دەرکەوتن، هەریەك لە قەرمەتیەکان و زەنج و راوەندی و موقەفەعی خوراسانی و بابەکی خورەمی و مازیار و ئەفشین دەرکەوتن، هەندێ لە مێژوونووسان کەعبی ئەحبار و وەهب بن منبە و عەبدوڵای کوڕی سەلامیش دێننە پاڵ ئیبن سەبەو، بەڵام لەراستیدا کەعبی ئەحبار ئەو کاهینە بو کە لەسەردەمی عومەردا بە مونافیقی موسڵمان بوو و هێندە زیرەك بوو توانی وابکات هەندێ هاوەڵ چەند فەرموودەیەکی لێوە بگێڕنەوە کە دابوونیەوە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)، لەوانە فەرموودەی(الأرضون السبع على صخرة و الماء على الريح و الريح على الهواء).

دواتر رۆڵی عەبدوڵای کوڕی موقەفەعی فارسی مەجووسی دێت کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد موسڵمان بووە، ئەو ناوی رۆزبە بوو ولە گەورەترین دوژمنانی لێزان و سەرسەختی ئیسلام بوو، ئەو بیری مەجووسی گواستەوە بۆ سەر زمانی عەرەبی،بیری مانی و مەزدەکی و جگە لەوانەشی هێنایە ناو بیری موسڵمانان، ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ وەرگێڕانی فەرهەنگی ئیلاهیاتی بتپەرستی ئیغریقی و فارسی.

لە دیارترین ئەو کتێبانەی ئیبن موقەفەع وەریگێڕانە سەر زمانی عەرەبی کتێبی دیستاو بوو کە کتێبی بیروباوەری مەزدەك بوو، هەروەها کتێبی (الدرة اليتيمة)ی بۆ دژایەتی کردنی قورئان کرد بە عەرەبی، هەروەها کتێبی کلیلەو دمنەی کرد بە عەرەبی، لەو کتێبەدا بەشێك هەیە بەناوی (برزویە)[1] کە باس لە خاڵە نەگونجاوەکانی نێو ئایینەکان دەکان، قسە لەسەر ئەوە دەکات گەیشتن بە یەقین و دڵنیایی نیە، هاوکات تەنها عەقڵ بە گەورەترین‌و چاکترین پێناوی مەعریفە دادەنێت.

---

[1] - د. علي سامي النشار: مناهج البحث عند مفكري الإسلام.

ئەوەش کە ئەمڕۆ دوژمنانی ئایینان و ناحەزانی ئیسلام دەیڵێن هەمان ئەو قسانەیەو پاش هەزارو دووسەد ساڵ دووبارەیان دەکەنەوە.

ئیبنولموقەفەع هەوڵی دەدا ملهوڕی بڵاوبکاتەوەو ئیسلام بە تایبەت و جیا لە ئایینەکانی تر لێکهەڵوەشێنێ، ئەمەش لا بەیرونی روونە و لە کتێبەکەیدا(تحقيق ما للهند من مقولة) دەڵێت: ئیبنولموقەفەع خۆی سەرچاوەی قسەکانی کتێبی کلیلەو دمنەیە.

حەزم دەکرد بمتوانیایە کتێبی (سنج سنتر) وەربگێڕم کە ناسراوە بە کلیلە ودمنە، چونکە لەنێوان فارسیو هیندیدا هەیە، دواتر لەنێوان فارسیو عەرەبیشدا لەسەر زمانی خەڵکانێ ئاڵوگۆڕی پێکراوە کە تەنها ئیبن موقەفەع گەیاندوویەتی بەوان ولە وبەشە زیادەیدا (برزويه) تیایدا گومان دروست دەکات بۆ ئیمان لاوازنو تێکیان دەشکێنێت تا بانگیان بکات بۆ مەزهەبی مانەوی، ئەگەر لە زیادەکاریەکەیدا تۆمەتبار بێت ئەوا لە نەقڵ و وەرگێڕانەکەیدا چۆن بە ساغی دەردەچێت؟، بەوجۆرە بیرونی زانا گەورە ئاگادار بووە بە باری ئیبنولموقەفەعو خەلیفە مەهدیشی لەوە ئاگادار کردوەتەوەو وتوویەتی: چی کتێبێکی زەندەقەکانم بینیوە دەبینم بنەرەتەکەی ئیبنولموقەفەعە،[1] هەروەك قاسمی کوڕی ئیبراهیمی زەیدی کە لە ساڵی ٢٤٦ کۆچی وەفاتی کردووە کتێبێکی داناوە بە ناوی (الرد على الزنديق العين ابن المقفع)، (وەڵامدانەوەی زندیقی نەفرەتی ئیبنولموقەفەع.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێشتا بەرهەمەکانی ئیبنولموقەفەع لە پەیمانگەکانی جیهانی ئیسلامیدا وەکدەق و نموونەی ئەدەبی عەرەبی

---

[1]- ابن خلكان: وفيات الأعيان، ج١، ص١٨٧.

دەخوێنرێن بێ ئەوەی لایەنە مەترسیدارەکانی ئەو کەسە بۆ گەنج روون بکرێنەوە تا ئەو کەسە بخەنە تەرازووی دادگاوە.

کاتێ وەرگێڕانی فەلسەفەی یۆنانی دەستی پێکرد موسڵمانان حەزیان لەوەبوو زانستە سورشتی و بیرکاریەکان وەربگێڕن، دواتر لە ژێر کاریگەری چەند هۆکارێکی بەهێزدا وەرگێڕانەکە برا بەرەو وەرگێڕانی فەلسەفەی ئیلاهی.[1]

ئیبنولموقەفەع‌و حنین بن ئیسحاق و هاوشێوەکانیان لەو کەسانە بوون کە هەڵگری ئاڵای ئەو کارە بوون‌و ئامانجێکی زۆر مەترسیداریشیان هەبوو کە ئەویش بریتی بوو لە گواستنەوەی مەزهەب و ئایینی ئەوێ بۆ ناو بیری ئیسلامی، تا ئێستایش مەسەلەی وەرگێڕانی ئەو کاتە مەسەلەیەکی گەورەیە کە توێژەران قسەی لەسەر دەکەن‌و دواتر گەیشتوونەتە رایەکی روونی راشکاوانە، دیارە تێکەڵیەکی گەورە لە نێوان نووسەراندا روویداوەو چەند کتێب بە ناوی ئەفلاتوونەوە وەرگێڕاون کە لە بنەرەتدا هی ئەرستۆ یان کەسانێکی ترن کە ئەوەش تێکەڵیەکی گەورەو گرژیەکی سەختی دروست کردووە.

ئەوەی مەترسیدارترە ئەوەیە کە بەشی گەورەی ئەو وەرگێڕانە لە سریانیەکان‌و کەمینەیەکی کەمی جوولەکە بون، ئیتر بەپێی ئارەزوی تایبەتی خۆیان چییان ویستووە دایانناوە، زۆربەی وەرگێڕەکان مەبەستیان گەڕان نەبووە بە دوای راستیدا، بەڵکو زۆربەیان مەسیحی نستوور و یەعقووبی بون، گەورەترین ئامانجیان باگەواز کردن بووە بۆ هەوادارانیان و رازاندنەوە ئارەزووە ئایینیەکانیان، بۆیە گۆڕانکارییان

---

[1] - التفسير الإسلامي للفكر البشري.

دەکرد لە دەقەکانی بەردەستیاندا تا بە ویستو ئارەزووی خۆیان بە کەمو زیادکردن لەو دەقانەدا خزمەتێك بکەن بە ئامانجە ئایینی و بیروباوەڕیەکانیان.[1]

ئەو وەرگێڕانە شوێنەواری خراپی هەبوو، شوێنکەوتوانی مەئموون لەو بوارەدا ڕۆڵی کارایان هەبوو، ئامانجی یەکەمی موسڵمانان سوودوەرگرتن بوو لە زانستی گەردووناسی و پزیشکی و بیرکاری و ئەندازیاری و کیمیا، هەنگاویشیان دەنا تا ڕێبازی خۆیان لەو بوارەدا دابنێن کە قورئانی پیرۆز بانگەوازی بۆ دەکرد(قل انظروا ماذا في السموات و الأرض) ئیتر لەسەریان بوو بچن بدوای ئەو بیرەیانداو تۆماری کردەیی بۆ بکەن تا لەسەر بنەمایەکی دروست لە چەمكو واتای ڕەسەنی ئیسلامیەوە هەنگاو بنێن و پێشرەوی بکەن، لەو بوارەشدا قۆناغێکی باشیان بڕی، بەڵام سەردەمی مەئموون دەرگای والآ کرد لەبەردەم وەرگێڕانی فەلسەفەی ئیلاهیدا کە بریتی بوو لە زانستی بتپەرستی یۆنانیەکان.

لێرەوە دەرد و بەڵا هات و ڕەشەبا هەڵیکرد، ئەمەش هەرەشەیەکی خراپو سەرەتایەك بوو بۆ مەترسی گەورەکانی دواتر کە ڕوویانکردە موسڵمانان.

با ڕێ بدەین مامۆستا خەلیل هنداوی وەڵامی ئەو پرسیارەمان بداتەوە: ئایا وەرگرتنی فەلسەفەی یۆنانی خێر و سوودی تێدا بوو بۆ موسڵمانان؟ ئەو سوودانە چی بوون کە دەستیان کەوتن؟ لە وەڵامدا دەڵێت: وەرگرتنی فەلسەفەی یۆنانی و فەلسەفەکانی تریش هیچ سوودیان نەبوو بۆ موسڵمانان، بەڵکو سەرەتایەکی شومی لێکەوتەوەو هەنگاوێ بوو بۆ

---

[1] - عبدالرحمن مرحبا: الفلسفة الإسلامية.

ئاوابوونی دەسەڵاتی ئیسلامی، وەرگرتنی فەلسەفەش لەسەردەمی مەئموونندا زۆر گەشەی سەند کاتێ مەئموون بوو بە خەلیفەی عەبباسیەکانو گرنگی دا بە فەلسەفەو بایەخی زیادی پێدا.

مەئموون هەوڵیدا مەزهەب و بیرە جیاجیاکان وەربگێردرێن، رێی دەدا بە ئاشکرا هەموو رایەك بوترێت، ئیتر لە سەردەمی ئەودا گومان بڵاو بوویەوەو نارەوایی بایەخی پەیدا ردو رەشەبای بێڕەوشتی و ارەوایی هەڵیکرد کە تۆوی مەزهەبە جیاجیاو نەیارەکانی هەڵگرتبوو، دەستەو تاقمانێکدەرکەوتن کە خەریك بوو بە ویست و بیروباوەڕەکەیان ئایینێکی نوێیان دەهێنایەروو، هەرکامیان هەوڵی دەدا بدات لەوی تریان، ئیتر دەوڵەتی ئیسلامی زۆر نەمایەوە تا شالاوی تەتەر و مەغۆلان رووی تێکرد و بارگەوبنەی پێچایەوە، زۆربەی شوێنکەوتوانی ئەو مەزهەبانە هاوکاری شالاوبەران بوون تا ئەو ئامانجەی خۆیان بەدیبهێنن، ئیتر سەکۆ و کورسی شارستانیەتی ئیسلامی نەما، ئیتر فەلسەفە چ سوودێکی هەبووە بۆ موسڵمانان.

مەگەر سوودەکەی ئەوە بووبێت ئەزموونیان وەرگرت بۆ کوشتنی کات و عەقڵو سەرمەست بوون بەو کاسەی کە سۆفستائیەکان دەیانبەخشی تا گەلە بەهێزەکان لە لووتکەی بەهێزیدا لەناوبەرن، بەرامبەر بەوەش کە موسڵمانان ئیمانی سروشتیو بیروباوەڕی پوختی خۆیان لەدەستدا هاوکات واجبەکانیان پشتگوێ خستنو کەمتەرخەمییان نواند لە ئایینیاندا، سوودەکەیان هەمان ئەو سوودە بوو کە یۆنانیەکانو گەلانی پێشوو دەستیان کەوت کە بریتی بوو لە لەناوچوون.

ئیخوانوصەفا بەرهەمی فەلسەفەی ئیلاهیاتی یۆنانی و هیندی و فارسیی کۆن بوو، ئەوان هەموو ئەوانەیان تێکەڵ دەکردن و شتێ لە چەمك و واتی ئیسلامییان بۆ زیاد دەکردو ڕێبازێکی جیاوازیان دادەنا کە هەوڵیان دەدا بەو ڕێبازە ئیسلام لەناوبەرن، ئەویش بەوەی واتای ڕوستی ئیسلامی لابەرن و لەبری ئەوە چەند چەمکو واتایەکی نامۆ بە ئیسلام بێننە ناو ئیسلامەوە، کۆی ڕاوبۆچوونی پەیامەکانی ئیخوانوصەفا بریتی بوون لە:

**یەکەم:** چەند وبیروڕایەکی پەرت کە تیایدا گەڕانەوەو دووبارەیەکی نامۆ و تێکەڵ بە فەلسەفەی تەقلیدی هەیەو زانستە بیرکاری و سروشتیەکان تێکەڵ بە خورافەی جادوو و فاڵچێتی و ئەفسانەی هەزار و یەك شەوەو چیرۆکی کلیلەو دمنە دەبینیت، ئەبوحەییانی تەوحیدی وەك خورافە وەسفیان دەکات، توێژەرانیش فەرهەنگیان دەگێڕنەوە بۆ فەرهەنگی کاهینان وەك نهێنی ئەستێرەکان و ژمارەکان و فاڵ و جادوو و بڕوا بە هەڵهاتنی ئەستێرەکان و کاریگەرییان و مۆسیقاو ئاوازی گەردوونەکان.

**دووەم:** ئیسلامیان تێکەڵ دەکرد بە ئایین و بیروڕا و دیدە جیاوازەکان و بانگەوازی ئەوەیان دەکرد کە مەزهەبەکەیان هەموو مەزهەبەکان لەخۆدەگرێت، وەك ئەوەی بیانەوێت ئایینێکی عەقڵی دابنێن کە لەسەروو هەموو ئایینەکانەوە بێت و بتوانن بنەرەتەکانی ئیسلام بگۆڕن، ڕوانینی ئەوان بۆ خوای گەورە ڕوانین و خوێندنەوەیەکی خراپ و هەڵە بوو بەتایبەت سەبارەت بە ڕەحمەتی خوای گەورە، ئەوان نکووڵیان دەکرد لە زیندووبونەوەی جەستەکان و دۆزەخ و بەهەشت و ڕۆژی دواییان بە واتایەکی تر لێکدەدایەوە کە پێچەوانەی ڕا گشتی موسڵمانان و تێگەیشتن لە دەقە یەکلاکەرەوەکان بێت، نکووڵییان دەکرد لەو ڕوانینەی کە

موسڵمانان هەیانە بۆ شەیتان، بۆ بێباوەڕی و سزاش ڕاڤەیەکی باتینی فەلسەفییان هەبوو.

**سێیەم:** گەورەترین شتێ کە بەڵگەی خراپی نیازیان بوو ئەوەبوو ناوی خۆیان دەشاردەوەو دەترسان ڕایانبگەیەنن، جا ئەگەر ئەوان لە بانگەوازیاندا ڕاستگۆ و دڵسۆز بوونایە دلێرانە بەرامبەر ڕای گشتی دەوەستان.

**چوارەم:** ئەو پەیامانە ئامانجیان بوو نیزامێکی نوێ دابمەزرێنن کە شوێنی شەریعتی ئیسلامی بگرێتەوە،ئەو نیزامەش بیروباوەڕی باتینی لەخۆدەگرت تا دەروون و عەقڵەکان ئامادە بکات بۆ دەوڵەتێکی نوێ.

**پێنجەم:** بانگەوازکردن بۆ تەئویل و هەوڵدان بۆ تەفسیرکردنی باتینی قورئان و کتێبە دابەزیوەکانی تر کە پێچەوانەی ڕووکەشی دەقەکەی بێت، ئەوان دەیانوت ئایەتەکان تەئویلی شاراوەی ناوەکییان هەیە.

ئەم بانگەوازە بۆ بەلاڕێدابردنی بیروباوەڕ دەرکەوتنی بزووتنەوە وێرانکەرەکانی لێکەوتەوە، پێشڕەوی ئەوانەش قەرمەتیەکان و بزووتنەوەی زەنج بوون کە هەوڵیان دەدا لەژێر ناوی دادوەری کۆمەڵایەتیدا دەوڵەتی ئیسلامی لەناوبەرن و سیستمانێکی نوێ دابمەزرێنن.

هەوڵی دامەزراندنی ئەو سیستمەی کە ئیخوانوصەفا بانگەوازی بۆ دەکرد بە سەختی شکستی هێنا، دەرکەوت کاری ئەو فیتنەو ئاشووبە لەبەرژەوەندی بانگخوازانی بزاڤە باتینیەکاندا بووە، ئەوانەی هەوڵیان دەدا

لەرێی گۆڕینی بیرکردنەوەی عەقڵی و هێنانەی رۆشنبیریەکی نوێوە کە گەنجانی سەردەمەکەیان وەریبگرن نیزامی سیاسی سەراوژوور بکەن.[1]

ئەو بزاڤەو هاوشێوەکانی کە هەموویان لە مێژووی ئیسلامیدا لەهەوڵدا بوون بۆ دژایەی رۆح و مۆرك و خودێتی تایبەتی ئیسلام هەموویان شکستیان هێنا، جۆڵد سیهەر و کارۆنۆڤا کە دوو رۆژهەڵاتناسن دان بەوەدا دەنێن کە بیروراکانی ئیخوانوصەفا بیرورای باتینی بوون، ئەو بزووتنەوانە

---

[1] - بەڵگەنامەو توێژینەوە وردە زانستیەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئامانجێکی سیاسی لە پشت ئەو بزووتنەوانەوە بووە(مانەوی، مەزدەکی، خورمەی، قەرمەتی، ئیخوانوصەفا، بانگخوازانی ملهوڕی و ئیتیحاد و وەحدەتولوجود)، ئامانجێ کە هەوڵدان بوو بۆ گۆڕینی نیزامی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامی و هەوڵدان بۆ دامەزراندنی نیزامێکی تر کە کەمینەیەکی دژ بە ئیسلامو کۆنە فەرمانڕەوا کەنارخراوە پەرتە مەجووسی و ئەفلاتونیو ئگریپەرستی و بانگخوازانی تەناسوخی رۆحەکان و ئەسینیە بتپەرستیە یۆنانی و خاوەن بیرە تلموودیەکان وێنایان دەکرد، ئەمە هاوکات بە نیشاندانی مۆرکێکی لەخشتەبەری هەواداری بۆ ئالویەیت و بوونی چەند سیستمێکی نهێنی کە تیایدا بە فێڵی بانگەوازی بریقەدار خەڵکیان کۆدەکردەوەو دواتر لەسەر کینەو دژایەتی و حەزی تۆڵەسێنی پەروەردەیان دەکردن. نامەکانی ئیخوانوصەفا بەرنامەی بانگەوازیان بوو کە چەند بڕگەیەکی ئاماژەبەخش بە بتپەرستییان لەخۆدەگرت، تیایدا چەند چەمك و واتایەکی جیاوازی ئیغریقی و بابلی و ئاشووری و جگە لەوانەش کۆکرابوونەوە کە خواوەندە بتیەکانیان لەخۆدەگرت وەك زدان و ئەهریمەن و غازیۆن، هاوکات ئیبراهیم و موسا و عیسا و موحەممەدیان دەکردن بە خوا، چەند دەقێکی تریان تێدا بوو کە ئاماژەیان دەدا بە هەسارەپەرستی و خواوەندەکانی مەجووس و بیرەوشتی مەزدەکی لە سامانداری و ژنداریدا و رۆچوون لە ئارەزووبازی و ملهوڕی مانی و بروای تەناسوخ و ساختەی زەردەشتی لە مەسەلەی رووناکی و تاریکی، لەو روانینە فەلسەفیانەوە ئەو ئامانجە سیاسیە دەردەکەوێت کە تلمودیەتی جوولەکەیی و ئامانج و نیازەکانی حەشاردراون.

ـەسەر بنەمای تەئویلو حلوول دامەزرابوون و بیری مەزدەکیان لە هاوبەشەکی بوونی سامان و ژندا پەیڕەو دەکرد، هەوڵیان دەدا هەموو ئایین و فەلسەفەکان بکەنە یەك بیروباوەڕ، هەموو ئەمانە هۆکاری شکست و دڵنیایی خراپەکەی بوون.

بزووتنەوەی قەرمەتی تێکەڵەیەکی مەجووسیەت و جوولەکایەتی بوو، ئەوان هاوسەرگیری لەگەڵ کچ و خوشکیان ڕەواکردبوو، مەی خواردنەوەو هەرچێژێکیان ڕەواکردبوو، کۆتە ڕەوشتی و شەرعیەکانیان هەڵگرتبوون، پێیان وابوو هەمو یاسا و سنوور و دابەکان کە بۆ خەڵك دانراون ستەم دەبەخشن، قەرمەتیەکان پێیان وابوو بەهەشت بریتیە لە دنیاو خۆشیەکانی، بڕێ ئسلوبی زۆر توندیان دانابوو، هەڵگرانی بزافی زەنجی چی تاوانی بێ سنووریان ئەنجام دەدا بانگخوازانی قەرمەتیش هەمان شتیان دەکرد.

## مەزهەبە رووخێنەرەکان و ملهوڕی

سەرچاوەی دایکێتی ملهوڕی بریتیە لە مەزهەبی ماددیگەری و ئەو دیدە ماددیەی کە لەسەر ئەو روانینە هەڵە مرۆییە دروست بووە گوایە مرۆڤ لە نەبوونەوە هاتووەو بەرەو نەمان و نەبوونیش دەچێت، ژیانی مرۆڤ دیاری کراوەو تەنها گیان و ئارەزووی خۆی زاڵە بەسەریدا، بۆیە دەبێت پێش کۆتایی وادەی ژیانی رۆبچێت لە ئارەزووەکانیدا، ئیتر ئەگەر فەلسەفەی وای بەدیکرد ئەم دیدەی پێ رازی بکات و بیکاتە بیانوو بۆ دەروونی خۆی ئەوە وەریدەگرێت، ئەوە هەر لە کۆنەوە سروشتی مرۆڤ بووە و تا ئەمڕۆش هەر وایە.

ئەوەی بڕوانێتە دەهریە و مەزهەبە رووخێنەرەکان، دەبینێت هەموویان جیاکاری ناکەن لەنێوان ملهوڕی و بێرەوشتیدا، واتە جیاوازی ناکات لەنێوان فیکر و کۆمەڵگەدا، ملهوڕیش لە کەش‌وبارێکی نائیسلامیدا گەشەی کرد، ئەمەش لە کۆکراوەی بێزاری لەو ئایین و مەزهەبانەی کە لە بنەرەتی رەسەنی خۆیان لایاندابوو، ئیتر ماوە فراوانەکانیان بەرتەسك کردبوونەوەو رێگەکانیان لە مرۆڤ حەرام دەکردن‌و رێیان نەدەدا حەزو ئارەزووە سروشتیەکانی مرۆڤ تێر بن، بەڵکو داوایان دەکرد ئەو ئارەزوانە سەرکوت بکرێن، یان بیروباوەڕێکیان دەسەپاند کە عەقڵ پێی قبووڵ نەدەکراو لەگەڵ سروشتدا نەدەگونجا، بێگومان بیری مرۆییش لەسەردەمی نوێدا پاش ئازادبوونی لەلایەن ئەو وزە گەورەی کە قورئان بەخشی بە مرۆڤ و کاری کردە سەر هەموو ئایین و بیروباوەڕو بیری گەلان و مرۆڤ و گولانی ئازاد کرد لە پەرستشی جەستەو عەقڵ، ئەم بیرە تا ئێستاش بەرامبەر

هەموو ئەو شتانەی لەگەڵ فیترەتدا ناگونجێن هەڵوێستی دووڵی گرتوەتەبەر، لەکاتێکدا ئاینی دابەزیوی خوا لەگەڵ فیترەتدا ناتەبا نیەو ـەگەڵ عەقڵدا نەیار نیە، ئەمەیە لێکچوونی نێوان هەڵوێستی ڕۆژئاوا لەم ـەردەمەو هەڵوێستی مرۆڤایەتی لەپێش هاتنی ئیسلامدا.

لێرەوە ئیسلام لە بازنە ساکاری و ئاسانیەکەیدا دەبینین، سەلامەتی و ـروستی مەبەستو پەیامی ئیسلام دەبینین، ئەوەتا ئایینی بەدوور گرتووە ـە هەموو کۆت و بیری موجەسسەمەو موشەبەهە، بازنەی پەرستشی لە ـەیکەر و وێنەو هێماو بۆنەو باری تایبەت رزگار راگرتووە، هەموو زەوی کردووە بە شوێنی پەرستش، بەهای سروشتی گێڕاوەتەوە کە وەك میحرابێکی داناوە بۆ نوێژ، ڕۆحی ئایینی لە بازاڕو بازاڕی وەك مزگەوت ـناوە، چینێکی دیارکراوی دانەناوە تا کاروباری ئایین قۆرخ بکەن، دایناوە ـەسەر هەموو موسڵمانێك شارەزا بێت بە ئیسلام، هیچ نێوەندێکی دانەناوە ـەنێوان بەندەو خودایدا.[1]

بێگومان دیدی ملهوڕی دیدێکی کۆنەو لە سەدەی نۆی کۆچی لە وڵاتی یۆنان دەرکەوتووە، دواتر بەردەوام بەپێی سەردەمەکان دەرکەوتنی نوێ کرلوەتەوەو چوەت جەنگی دژیە پەیامی ئاسمانو بیرێ کە سەرچاوەکەی خواپەرستی بووە، ئارەزووبازان و چاوچنۆکانیش دۆست و یارو شوێنکەوتەی ئەو بیرە ملهوڕیە بون.

کاتێ زانستی سروشتی نهێنیەکانی خۆی ئاشکرا کرد بیری مرۆیی دیدی خۆبەزلزانی گرتی و لە جەنگی بیروباوەڕی بەردەمیەوە هەنگاوی نا بۆ ـژایەتی کردنی هەموو ئایینەکان بێ ئەوەی جیاکاری بکات لەنێوان مەودا

---

[1] - محمد فريد وجدي.

دوورەکانی نێوان ئەو بیروباوەڕانەو نێوان ڕاڤەی هەڵەی هەندێ ئایین لەگەڵ ڕاڤەی دروستی ئەو ئایینەی کە سەرچاوەکەی لە هەموو ساختەیەك پارێزراوە.

ئەگەر نیەتەکان پوخت بوونایە و دەمارگیری پێشڕەو نەبوایەو ئارەزووی چاوچنۆکانی بیری بانگەوازی ئایدۆلۆجیای تلموودی لەپشت ئەوانەوە نەبوایە، ئەوا بەدڵنیاییەوە مرۆڤایەتی دەیتوانی بزانێت لە ئیسلامدا لووتکەی هیواو ویستی خوازراوی مرۆیی بونی هەیەو تیایدا فراوانی و کراوەیی و ئیمان و ڕەحمەت و بروابوون بە زانست و پێشکەوتن هەیە، تیایدا مرۆڤ هان دەدات بۆ لێکۆڵینەوە لە خودی خۆیو پەیڕەوی خواستەکانی، ئیسلام دانی ناوە بە خواستەکانیدا و ڕێی داوە لە بازنەی یاساوڕێسا دروستەکاندا بیانهێنێتەدی، بەڵام مرۆڤایەتی تا ئێستاش وا پێنج سەدەیە واتە لە سەرەتاکانی دەرکەوتنی ژیاری نوێوە دەگەڕێت و عەقڵی (کە پێناوێکیەتی) کردووە بە دیدگای تایبەتی، لەکاتێکدا عەقڵ پێویستی هەیە بە ڕووناکی ئیمان، یان بە دەربڕینی زانایانی موسڵمان عەقڵ کرۆکێکی درەوشاوەیە کە خوای گەورە لە مێشکدا دروستی کردووەو ڕووناکیەکەی عەقڵیشی لە دڵدا داناوە)، تا ئێستاش مرۆڤایەتی بێ ئەوەی بگات بە حەق لە گەڕاندایە، کەچی حەقیش لەبەردەمیدا ڕاستاڵ ڕاوەستاوەو پرشنگی زاڵە بەسەر فەلسەفەی غەنووصیدا یان ئاواکەری فەلسەفەی یۆنانیە.

چەمکی ملهوڕی (Atheisme) واتە نکوولی لە بوونی داهێنەری یەکەمی ئەم بوونە، ملهوڕیش وەك هەموو بیردۆزەکانی تر لە هەر کەشوبارێکدا بەپێی شێوازێکی نوێ گۆڕان و پەرەسەندنی بەسەردا دێت، بۆیە سەردەمی نوێ ملهوڕیەك بەخۆوە دەبینێت کە پەیوەستە بە چەند

بانگەوازێکەوە وەك بوونگەرایی و مارکسی و فریدی، بەڵکو دەکرێ بوترێت ملهوڕی و نکووڵی کردن لە بوونی خودا دوو بنەرەتن بۆ هەموو ئەو مەزهەب و بانگەوازانە با لە مەسەلە سەردەمیەکاندا جیاواز بن، هەموو ئەو بانگەوازانە دژی ئایینەکانو پێغەمبەرایەتی و کتێبە ئاسمانیەکانو بە سەختی نکووڵی دەکەن لە زیندووبونەوەو پاداشت وەرگرتنەوەی ڕۆژی دوایی.

ملهوڕی لەم سەردەمە نوێیەدا مۆرکێکی فەلسەفی وەرگرتووەو چەند بیردۆزەیەکی زانستی کردووە بە چەکی دەستی، ئەوەشی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە زۆربەی چەکەکانی ملهوڕی لەڕێی زانستی ئەزموونیەوە شکستیان خواردووە، مەترسیدارترین مەسەلەش نکووڵی کردنیان بوو لە غەیبو ئەو دیو ماددە، دواجار زانستی ئەزموونی دانی نا بە دنیای ئەو دیو ماددەدا، ئەمەش لە ئەنجامی دەرکەوتنی یاساکانی ناوکو کەرتبوونی، بەڵام فەلسەفە تا ئێستاش بەدوای چەکێکی نوێدا دەگەڕێت تا هەڵوێستی خۆی لەسەر ئەو دژایەتیە ناڕەوایە بەهێز بکات.

ملهوڕی نوێ بەرپەرچدانەوەی هێزی بنەرەتیو ڕوونو دروستکەرو کارگێڕی ئەم بوونەیە، دوای ئەوەی زانستە ئەزموونیەکان دیدی بانگخوازانی کۆنی ملهوڕییان بەدرۆ خستەوە ئیتر ئەمان ئەم دروشمەیان خستەڕوو، ئەم دیاردە نوێیە هەڵگەڕانەوەیە لە بوونی خوا تا بتوانن مرۆڤ وەك خوا دابنێن، یان هەوڵێکە بۆ داماڵینی واتای خوایەتی لە خوای گەورە(خوا بەدوورە لەوەی ئەوان دەیڵێن) تا ئەو خوایەتیە بدەن بە مرۆڤ.

ئەوەی نووسینەکانی فرباخ و مارکس و سارتەر و فرۆید بخوێنێتەوە بە ڕوونی ئەو واتاو مەبەستە بەدی دەکات، مارکس دەڵێت: ملهوڕی نکوڵی

کردنی خودایە، بەو نکوولّیەش جەخت دەکەینەوە لە بوونی مرۆڤ، فرۆید هەلّگەڕانەوە لە خوا و هەلّگەڕانەوە لە دەسەلاّتی مەسیحیەت پەیوەست بە یەك دەكات،[1] بێگومان ئەو تێکەلّکردنەی نێوان خودا و مرۆڤ لە لایەکەوەو لەلایەکی تریشەوە پێدانی خوایەتی بە مرۆڤ سەرچاوەیان لە بیری رۆژئاوای مەسیحیدا هەیە.

لە روانگەی ئەم چەمك و واتایەوە شالاّوی دژ بە خودا هەیە، خودا بەو واتایە سنووردارکراوە کە بیری رۆژئاوایی ناسیویەتی نەك بەو وێنا راستیەی کە خوای تاکو تەنها هەیەتی، وێنای رۆژئاوایی تێکەلّیەکی زۆری کردووە لەنێوان خوداو سروشتو نێوان مرۆڤ و خودادا، بۆیە لێرەوە وتەکانی نیتشە سەبارەت بە مەرگی خودا و موتەکانی مارکس سەبارەت بە تلیاکی بوونی گەلان دێن، ئەو ئەگەرانەی کە پێشتر باسکران برێ ئەگەری دوور لە عەقلّ بوونو فیترەتیش قبوولّیان ناکاتو دەروونی دروستیش بە هەر جۆرێکی مەنتیقیو عەقلّی بەو ئەگەرانە ئارام ناگرێت.

## خودا لە پەیامی ئیسلامدا

تەنها روانینێك بۆ چەمك و واتای خودا لە ئیسلامدا دەتوانێت هەموو گومانو دوودلّیەکی سەر دەروونە مرۆییە خاوەن فیترەتە پاکەکان لابەرێت، خوای گەورە دروستکەری بەدیهێنەری وێنابەخشی بەدەسەلاّتە کە هیچ وێنەو نموونەیەکی نیە، چاوەکان درکی پێ ناکەن و ئەو درك بە بینابیەکان دەكات، دروستکەری کارسازە، سیفەتەکانی لە ناوە

[1] – كوسي: إله الإلحاد المعاصر.

جوانەکانیدا خۆیان دەنوێنن، موسڵمان لەو سیفەتانە زیاتر ناڕوات و تەنها بەو سیفەت و ناوانەی خوا سیفەت و ناوی خوا باس دەکات کە خوای گەورە خۆی باسی کردون.

بڕوابوون بە یەکخوایی خوای گەورە پایەی یەکەمی ئیسلامەو سەرچاوەی هەموو قسەیەك و کۆتای هەموو نیازێکە، زاتی خوا عەقڵ درکی پێ ناکاتو هەست پێی ناگات، هەرچیەك عەقڵی مرۆیی درکی پێ دەکات ئەوە شوێنەوارە بۆ ڕێنموونی بوونی خوا.

بڕوابوون بە بوونی خوا پێویستیەکی بنەڕەتی مرۆییە، چونکە مرۆڤ تا کاتێ خاوەن ڕوانینی و بیروبەڵگەخوازی بێت ناتوانێت هەرگیز لەو بیروباوەڕە دەربچێت، لەبەر ئەوەی بنەرەتی هەموو هەستپێکراوێك ئەوەی بۆ هەیە هەموو دروستکراوێك دروستکەرێکی هەیە، بۆیە دەبینیت هەر دەبێت دان بەوەدا بنێیت ئەم بوونە دروستکەرێکی هەیە، مرۆڤەکان هەزاران ساڵ لەسەر ئەو بیروباوەڕە ماونەتەوەو گومانیشی لەسەر نەبووە تا ئەوەی نزیکەی شەش سەدەیك پێش مەسیح فەلسەفە هات و لەگەڵ خۆیدا گومان و دوودڵی سۆفستەگەرایی هێنا.[1]

قورئانی پیرۆز لە چەندین شوێندا ئاماژەی داوە بەو گومانانە(أفي الله شك فاطر السموات و الأرض)، هەروەها نیشانی داوە کە چۆن ماددیگەری نەیتوانیوە بوونی گەردوون بەبێ دروستکەرێکی داناو کارساز پشتراست بکاتەوە.

---

[1] محمد فريد وجدي: دائرة المعارف.

واتای خودا لە ئیسلامدا چەند مەشخەڵ و بنەمایەکی روونی هەن: ئەو داهێنەری حەقیقیە، دروستکەرو کارسازی دوور لە هەر شتێکی داهێنراوی گۆڕاوە کە دەیبینین، خوای گەورە باڵاو شکۆدارە و بەدوورە لەگومانی گومانسازان‌و وێنەبەخشی موجەسەدەکان کە تەجسیدی خوا دەکەن.

هەرچیەك فەلسەفە دەیڵێت و بە کەموکورتی خوای باس دەکات خوای گەورە لە روانگەی ئیسلامەوە بەدوور دادەنرێت لەو شتانە، خوای گەورە لەرووی کەماڵ‌و چاکیەوە لەسەروو ئەوەوەیە کە عەقڵی مرۆیی وێنای دەکات، خوا لەکەس نەبووەو کەسی لێ نابێت، کەسیش، هاوشانی نیە، خۆی ئەوەل و ئەخیرەو یەکەمێك پێش ئەو نیەو دوای ئەویش ئەخیرێك نیە، زاهیرو باتینەو زانستی بە هەموو شتێك هەیە، شتە گشتیەکان و شتە وردو لاوەکیەکانیش دەزانێت، خوا هەردوو رۆژهەڵات و هەردوو رۆژئاوایە، هەر ئەو هەموو یهانەکانی دروست کردووە، جیهانی مرۆڤ، جیهانی جنۆکە، جیهانی فریشتە، ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە بێ هیچ ماندوو بوونێك، مرۆڤی دروست کردووەو بەیان و تێگەیاندنی فێر کردووە، نووسینی فێر کردووە، ئەوەی فێری مرۆڤ کردووە کە پێتر نەیدەزانی، وێنەی خوا لە قورئاندا تەواو جیاو روونە لەوەی کە لە فەلسەفەکان و هەندێ بیروباوەڕدا هاتووە، خوا خوای جەنگ‌و سەربازان نیە، خوای ئوممەتێك نیە جیا لە ئوممەتێکی تر، بەڵکو خوای هەموو جیهانیانە، میهرەبانێکە کە میهری هەموو شتێکی گرتوەتەوە.

ئێمە بروامان بەوە هەیە خوای گەورە دروستکەرەو هەموو بوون دروستکراوی خوای گەورەیە، بەڵام هیچ بۆشایەك نیە لەنێوان خواو ئەو بوونە دروستکراوەیدا، لەبووندا دوانەییەك هەیە، بەڵام لەنێوان دوو لای ئەو دوانەییەدا جیاییەك نیە، مرۆڤ جەستەو گیانە، بەڵام لە ژیانی خودی مرۆڤدا

ئەو دوانە لەیەك جودا نین، مرۆڤدا لە ئاکاریدا لێی شێوا کاتێك بروای وابوو بۆشاییەك هەیە لەنێوان خودا و مرۆڤدا، یان بروای وابوو مرۆڤ جەستەیەو بەس، بروابوون بە خودا بنەرەتی مەعریفەیە، تاكو تەنهایی خودایش بنەرەتەو گونجاوی نێوان ئەو دوو لایەنەش لەم بوونەدا هەیە بەتایبەت لە سروشتی مرۆڤ لەنێوان رۆح و جەستەیدا، لەنێونا تاك و تاکدا، جا گیان زەرورەتەو ئایینیش زەرورەتە، مرۆڤ بەبێ گیانی پەیکەرێکی وشکەڵە، مەعریفە بەبێ ئایین زۆربەکەمی یەقین‌و دڵنیایی لەگەڵە، هەموو بوون لەسەر بنەمای دوولایەنی یان بنەمای بەرامبەرەکی وەستاوە، خوای گەورە بەدوورە لە هەستپێکراوی‌و ماددی بوون، مۆرکی بوون تێکەڵەی نێوان رۆحگەرایی و ماددیگەریە، خوای گەورە رۆحێکی تەواوە کە ئەو سروشت ماددیەی لێوەی دەرکەوتووە بەرامبەریەتی، خوای گەورەش خۆی ئەو سروشتە ماددیەی بۆ دروستکراوەکانی ویستووە.

ئەم بوونە ماددەو رۆحیش لەخۆدەگرێت، تێکەڵەیەکی هەرچیە کە دەبینرێت و بە بینین درکی پێ دەکرێت، لەگەڵ شتێکی تر کە نابینرێت و درکی پێ ناکرێت مەگەر تەنها بە عەقڵ و وێناکردن، دوانەیی لە نێرو مێدا، لە ژیان و مەرگدا، ەم بەرامبەرەکیە یان دوانەییە سوننەتی هەموو بوونەو پەیامی خوا بۆ مرۆڤیش لەم بوونەدا هێنانەدی گونجانی نێوان دوو لای ئەو دوانەییەیە لە ژیانی مرۆڤدا، ئەو گونجانە درەوشاوەیەی کە لە سروشتی مرۆڤدا هەیە لەنێوان جەستەو گیانیدا، لوتکەی ئەو گونجانەش لە بووندا ئەوەیە لەنێوان خوای دروستکەرو دروستکراوەکاندا گونجاو بێت، بروابوون بە خودا ئەنجامێکی پێویستی یاسای سروشتی بوونە، بانگەوازی ئیسلامیش بۆ ئەو گونجانەی نێوان رۆح و جەستەیە بەجۆرێ هەیچکام لەگەڵ ئەودا ناتەبا نیە یان وانیە یەکێکیان بەستن بیگرێت و ئەوی تریش

لە گەشەسەندندا بێت، هەروەك ئیسلام ئەو هەڵەی نیشاندا کە لەسەر حیسابی جەستە ڕۆح بەرزتر رادەگیرا، یان ئەوەی لەسەر حیسابی ڕۆح جەستە بەرز رادەگیرا، چونکە بڕوابوون بەوە مرۆڤ تەنها ماددەیە وەك بڕوابوونە بەوەی بڵێیت مرۆڤ تەنها ڕۆحە، ئەمانە لەگەڵ قانونی ئیسلامیدا نەگونجاون‌و لەگەڵ ئەنجامەکانیدا بەریەکدەکەون، هەموو بوون دروستکەرێکی هەیەو جگە لە خوداش هەموو شتێك دروستکراوی خوایە، بڕوابوونیش تەنها بە بوونی خودا نیە، بەڵکو بڕوابوونیشە بە تاك و تەنهایی خوای گەورە.

بیری یەکخواپەرستی زەقترین بیری ناو ئیسلامە سەبارەت بە خوای گەورە، ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ یەجخواپەرستیەکی پوخت و دوور لە هەر چچڵك و گومانێك، خۆ هاوەڵ دانەریش بڕوای هەیە بە خودا، بەڵام لەگەڵ خوادا کەسی تریش دەپەرستێت‌و چەند خواوەندێکی تر دەکاتە نێوەندو تکاکار تا بگات بە خودا.

عەرەب لە سەردەمی نەفامییاندا[1] بڕوایان هەبوو بە بوونی خوداو لە دروستکردنی بوون و ڕۆزی دان‌و زیندووکردنەوەو مراندندا خودایان بە تەنها و تاکە دەسەڵات دەزانی، بەڵام ئەوان هاوەڵیان بۆ خودا دادەنا لەبەر ئەوەی نەیاندەتوانی بڕوا بهێنن بە یەکخواپەرستی ئولوهیەت واتە یەکخواپەرستی لە پەرستشدا، ئەوان هەمەجۆرەی پەرستشیان هەبوو کە شیاو بە خودای تاك و تەنها بوو وەك نزا و ترس و هیوا و پشت بەستن و پەبابۆبردن، خوای گەورە سەبارەت بەوانە دەفەرموێت(ألا لله الدين الخالص والذين اتخذوا من دونه أولياء ما نعبدهم إلاّ ليقربونا إلى الله زلفى) ،

---

[1] – من كتاب التصور الإسلامي.

(ویعبدون من دون الله ما لا یضرهم و لا ینفعهم)، هەروەها بە ئایەتەکانی یەکخواپەرستی ربوبیەت بەرپەرچی ئەو بانگەشە پووچانە دەداتەوە(قل من یرزقکم)، هەروەها بەڵگەیان لەسەر دادەنێت کە چۆن دان دەنێن بە تەنهایی خودا لە ربوبیەتدا لەکاتێکدا بۆ پەرستشەکە تەنهایی خوداو یەکخواپەرستی پەرستش ناگرنەبەر.

بیری یەکخواپەرستی پوخت لای ئەوان زۆر نامۆ بوو، هەروەك چۆن بیری زیندووبوونەوەشیان لا نامۆ بوو، ئەمە هاوکات بە داننانیان بە بوونی خوای گەورەو رازی بوونیان بەوەی خوای گەورە دروستکەری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشە کە لەنێوان ئەوانەدا هەیە، بەڵام نەیاندەویست دان بنێن بە کرۆك و واتای ئەو تەنهاییەی خودادا ئەویش بەو واتایەی لە ژیان و کاروباریاندا حوکمو بڕیار بەس بۆ خودا بێتو تەنها لەوەوە حەلال و حەرام وەربگرنو هەمو کارێکی دنیاو دوارۆژیان بگەڕێتوە بۆ لای خودای گەورە.

یەکخواپەرستی لە پەیامی ئیسلامدا روون و گشتگیرە، تەواو جیاوازە لەوەی کە لای فیرعەونەکان یان لای جوولەکە یان کەسانی تر سەبارەت بە یەکخواپەرستی وتراوە، ئیسلام یەکخواپەرستی پوختی هێناو ماڵەکانی ئاگر و پەرستگا مەجووسیەکانی کوژاندەوەو پەرستشی خۆری لەکارخست.

لە راستیە روونەکانی ئەو بوارە ئەوەیە ە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە یەکخواپەرست بووە، دواتر چڵکی هاوەڵ دانان بۆ خوای تووش بووە، ئەو بیرۆکەش کە زانستی بەراوردی ئایینەکان دەیخاتەروو و دەڵێت مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتاوە بە بتپەرستی دەستی پێکردووەو دواتر گەیشتووە بە یەکخواپەرستی، ئەم بیرۆکەیە بە حوکمی مێژوو و مەنتیقی هۆشیاری پووچ

و هەڵەیە، چونکە ئادەم کە باوکی مرۆڤایەتیە و بە هەموو زانستێك یەکەم مرۆڤی سەر زەوی بووە یەکخواپەرست بووەو بڕوای بە یەکپەرستراو هەبووە، ئەمە واتە مرۆڤایەتی سەرەتا یەکخواپەرست بووەو دواتر لاڕێ بووە، هەرکات لارێبوونێ ڕوویداوە ئاینی خوایی دابەزیوە تا بیانگێڕێتەوە بۆ یەکخواپەرستی تا ئەوەی دواجار ئیسلام هات کە پەیامێکی جیهانیە و سەرمۆری ئاینەکانە، ئیسلام بە وردی مەسەلەی یەکخواپەرستی و بتپەرستی هێناوەو بە مەنهەجێکی وا چارەسەری کردووە کە دڵ و عەقڵ و ئەزموونی مێژووی پێکەوە کۆکردوەتەوە، لێرەوە قورئانی پیرۆز بوو بە پارێزەری مرۆڤایەتی لە هەڵگەڕانەوە بەرەو بتپەرستی و سەردەمی ئەفسانەیی.

یەکێ لە گرنگترین ئەو شتانەی کە ئیسلام بانگەوازی بۆ دەکات لە یەکخواپەرستی پوختدا بریتیە لە یەکانگیری خودا و جیهان.[١]

زانایانی موسڵمان بەجوانی وێنای بیروباوەری یەکخواپەرستی ئیسلامییان نیشانداوەو وێنەیەکی تەواو و مەشخەڵ و بنەما روونیان بۆ کێشاوە، خوای گەورە دروستکەری هەموو جیهانەو چەند سیفەتێکی چەسپاوی هەن کە تایبەتن بە خوای گەورە، هەموو ڕووداوەکانیش دەبێت داهێنەرێکیان هەبێت، خوای گەورە دێرینەو پێشوەختی نیەو وێنەو جەستەی نیەو شوێنێ نیە بیگرێتەوەو زەمانێ نیە وادەی دیاری بکاتو ئازار و چێژەکان خودا ناگرنەوە، ، بێباکە لە دروستکراوانی و تاك و تەنهایە، خوای گەورە توانای هەیە هەموو شتێك لە نەبوونەوە بێنێتە بوونو زانستیشی ڕتاکەو وەردەکاری هەموو بوون دەزانێت بەبێ هەست و بێ بەڵگەخوازی، بیستنو بینینی خوای

---

[١] - بڕوانە بۆ بەشی وەحدەتولوجود.

گەورە هەموو بیستراو و بینراوێك دەزانن، خوای گەورە بەردەوام بینای خۆیەتی و بیسەری فەرمایشتی خۆیەتی.

ناوو سیفەتەکانی خوای گەورە لە قرئانی پیرۆزو فەرموودە صەحیحەکان و ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامیدا زانراون‌و هەرگیزیش دروست نیە لەرێی قیاس و پێوانەوە ناوی تری لێ بنرێ، ناوەکانی خوای گەورە نەوەدو نۆ ناون‌و سێ بەشن: سیفەتی ئەزەلی(وەك واحد، أول)، سیفەتی ئەزەلی لەسەرخۆ وەستاو(وەك حي، قادر، عالم) سیفەتی پێکهاتە لە کردارەکانی(وەك خالق، رازق، عادل)، باوەرداران لە رۆژی دواییدا خودا دەبینن، لەم جیهانەدا هەرچی روودەدات بە ویستی خوایە، چی بوێت روودەدلت و چی نەوێت روونادات، خوا گەورە زیندووە بێ رۆح‌و بێ نان خواردن، فەرمایشتی خوا سیفەتێکی ئەزەلیەو دروستکراو و داهێنراو و داهێنەر نیە.[1]

## بیروباوەڕی زیندووبوونەوە

یەکێك لە بنەرەتە سەرەکیەکانی ئیسلام بریتیە لە بیروباوەڕی زیندووبوونەوەو بروابوو بە پاداشتی رۆژی دوایی، ئایینە ئاسمانیەکان کۆکن لەسەر بوونی ژیانی پاش مردن کە تیایدا مرۆڤ لەسەر کارو کرداری ژیانی دنیای لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت، ئەمە راستیەکی جەوهەریەو هەرگیز ئیسلام لەکاری ناخات‌و هەمیشە لەبەرچاو و لەبەدەم عەقڵ و هۆشدا دایدەنێت، بێگوومان بروابوون بە پاداشت و زیندووبوونەوە

---

[1] - عبدالقادر البغدادي: الفرق بين الفرق.

پێناوێکی بەهێزی و ئیجابیەو پاڵنەرێکی بنیاد و جووڵەیشە، نەك پاڵنەری چەقبەستوویی و دواکەوتەیی، ئەگەر کارە گەروەکانی ژیانی دنیا نیەتێکی خواپەرستییانَ تیا نەبێت تا بەرهەمی خیان لە دنیادا بدەنو لە رۆژی دواییشدا پاداشتی خۆیان وەربگرن، ئیتر پەیامی مرۆڤ لە ژیاندا هەرواو بێ بنەما دەبێت، ناشکرێت ژیان بێ ئامانج بێت یان بوونی مرۆڤ لەم سەر زەویەدا بێ پەیام بێت، ئەم راستیە گەورەترین بەخششی پەیامە ئاسمانیەکانە، عەقلێ قبووڵی ناکات خوا هەموو ئەم بوونەی بێ مەبەست دروست کردبێت(أفحسبتم أنما خلقناكم عبثا و أنكم إلينا لا ترجعون).

ژیان پەیام و بەرپرسیارێتیە، راستی و شوێنکەوتنە، دواتر زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوەیە، کاتێك دەروونی مرۆیی لەمە دڵنیایە ئیتر ئەو تەنگژەی لەسەر نامێنێت کە هەوڵ دەدات لە دێوەزمەی گومڕاییدا بیخنکێنێت، لە خۆشبەختیدا ئەم زەویە رەسەنایەتی ئاییندارى تیایەو ئایینەکانی بۆ دابەزیون، بێگومان فیترەتی مرۆیی لە قووڵایی خۆیدا دەتوانێت بەرەو ئایینی حەق رێ بگرێتەبەرو پەیوەندی بکات بە دروستکەری تاكو تەنهایەوە، بێگومان ملهوڕی شتێکی کتوپڕە بۆ سەر دەروونی مرۆیی نەك لە سروشتی مرۆیدا بنەرەت بێتو بوونی بوبێت، بێگومان ئاییندارى سروشتێکی قووڵە لە بوونی مرۆییدا کە رێ دەبڕێ بۆ بنیادی تاك و کۆمەڵگەو مرۆڤی رزگاربوو لە گومان و لێکهەڵوەشان و داکەوتن.

ئەوەی فەلسەفەی ماددیگەری دەیڵێت جیهان بەس ماددەیە فیترەت وەریناگرێتو عەقڵیش قبووڵی ناکات، بێگومان بیروباوەڕی زیندووبوونەوە و ژیانی ئەودنیا هۆکارێکی کاریگەری ماوەدوورە لە ژیانی مرۆڤو کردارو ئاکاریدا، بۆیە قورئانی پیرۆز گرنگیەکی زۆر زۆری داوە بە مەسەلەی زیندووبوونەوەو ژیانی رۆژی دوایی، لە چەندین شوێندا زیندووبوونەوەو

یەکخواپەرستی پێکەوە باسکردووەو ئاماژەشی داوە بەو دەردی نکووڵیەی بە درێژایی سەردەمان هەبووەو هەوڵی لەکارخستنی ئەو بڕوایە لە دنیاداو مەسەلەی بەرپرسیارێتی تاکەکەسی کە پاداشتی ڕۆژی دوایی لەسەر وەستاوە، دیارترین ئەو کەسانەی کە بیری زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دوایی بە ڕاست نازانن بریتین لە دەهریە ماددیگەراکان، چونکە بانگەواز دەکەن بۆ بێرەوشتی و ئارەزاووبازی تەواوو ڕۆچوون لە ۆشیەکانی ژیان، ئەم ڕەهاییەش ترسی دەروونی مرۆیی لەسەرە مەگەر کاتێك پێی لەخشتەبرێت‌و ڕاستی لێ شاراوە بێت، بێگومان بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی گەورترین پاڵنەرە بۆ تاك تا بەرەو ەمال و پێشڕەوی هەنگاو بنێت، بێگومان ڕۆژی دوایی ڕۆژی کۆتایی مرۆڤەو ئامانجی خواش لە دروستکردنی مرۆڤ بریتیە لەمە(و أن ليس للإنسان إلا ما سعى، و أن سعيه سوف يرى، ثم يجزاه الجزاء الأوفى)، لە ئایینە جیاجیاکانیشدا تەنانەت لە ئایینی میصریە کۆنەکاندا بیروباوەڕی زیندووبوونەوەی پاش مەرگ هەبووەو ئەو ڕاستیەش تەنها لەلایەن تلموودی‌و بتپەرست‌و دەهریەکانەوە ساختەکراوە، ئەو بیرە ساختەکارەش هەوڵێکە بۆ هەڵگرتنی ئەرك و فەرزەکان‌و لەکارخستنی بەرپرسیارێتی تاکەکەس لە کاروکرداریدا.

# بەشی یەکەم:

# چەند بانگەوازێکی رووخێنەری بەهاو بیروباوەڕەکان

یەکەم: دەهریە.

دووەم: سیۆصۆفی.

سێیەم: بەهائی.

چوارەم: رۆحگەرایی نوێ.

# باسی یەکەم

## ( دەهریە )

دەهریە یەکێکە لەو بانگەوازە رووخێنەرانەی کە قەڵەمڕەوی بیانی لە وڵاتانی ئیسلامیدا بلاوی کردەوە وەك پێناوو هۆکارێك بۆ دارماندنی بنەرەتو بنەماو بەها بنەرەتیەکانی ئیسلام، لە دیارترین ئامانجەکانی داگیرکار بریتین لە: لەناوبردنی ئەو هێزە رەسەنەی کە ئیسلامی لەسەر دامەزراوە کە ئەویش بریتیە لە یەکخواپەرستی، بۆیە لە هەر شوێنێ دەسەڵاتی هەبووە چەمكو واتای ماددیگەریو بانگەواز بۆ دژایەتی بوونی خودای بڵاوکردوەتەوە، ئەو بانگەوازەی دەڵێت ئەم بوونە هەر لەخۆوە هاتوەتەبوون، ئەم مەزهەبەش ناسراوە بە نیشەریی، ئەمەش لەبەر ناوی(Nature)، ئەم بانگەوازە بەشێوەیەکی مەترسیدار لە هیند دەرکەوت، داگیرکاری بەریتانی لەنێو موسڵمانان‌دا بڵاوی کردەوەو سەید جەمالەدینی ئەفغانیش ئاگادار بووە لەو پیلانە، بۆیە ئەو کتێبە بەناوبانگەی خۆی نووسی(وەڵامدانەوەی دەهریەکان).[1]

ئامانجی ئەو بانگەوازەی نیشانداوە کاتێ لەو بارەیەوە دەڵێت: نیشر ناوێکی سروشتە، رێبازی نیشر هەمان ئەو رێگەو تەریقەتەیە کە لە سەدەی چوارەم و سێیەمی پێش لەدایکبوونی مەسیح لە وڵاتی یۆنان دەرکەوت، ئامانجی ئەو خاوەن تەریقەتانە سڕینەوەی ئاینو دانانی بنەڕەتی

[1] - ص٤ من كتاب الرد على الدهريين، تأليف جمال الدين الأفغاني و ترجمة الشيخ محمد عبده، ألفه عام ١٨٨٥.

بێرەوشتیو هاوبەشەکی سامان و دانانی لەبەردەم هەموو خەڵکدایە، بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئامانجەشیان زۆر ماندوو بوون و هەوڵیان داوە، بۆ ئەوەش بە چەندین رەنگی جیاجیا دەرکەوتنو بەچەندین شێواز خۆیان نیشان دا، بچنە ناو هەر گەلو دەستەیەك رەوشتی خراپ دەکەنو بەرەو نەمانو ئاوابوونیان دەبەن.

هەرکەس بچێتە قووڵایی ئامانجی هەڵگرانی ئەو رێبازە، ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە تەنها خراپکردن و شێواندنی شارستانیەت تنها ئەنجامی هەنگاوە بنەرەتیەکانیانەتا بنیادی پەیکەری کۆمەڵایەتی مرۆیی دارمێنن، بێگومان ئایین بەشی سیستمی کۆمەڵایەتیە، هەرگیز بنەرەتی شارستانیەت بەبێ ئایین توندوتۆڵ نابێت، یەکەم رێنماییو وانەی ئەو دەستەیە لەسێدارەدانی ئایینو فرێدانی هەموو بەندێکی ئایینیە، بەلام بڵاونەبوونەوەی ئەو رێبازەو کەمی شوێنکەوتوانی بەدرێژایی سەردەمان هەر لە سەرهەڵدانیەوە لەبەر ئەوەبووە کە نیزامی دڵگیری مرۆیی-کە شوێنەوارێکی حیکمەتی باڵای خوداییە- زاڵتر بووە بەسەر بنەرەتەکانی ئەو رێبازەو شەریعەتە گەیوەو خراپەکەیدا، بەم نهێنیە خوداییە دەروونی مرۆڤەکان دەبووژێتەوە تا شوێنەواری ئەو رێبازە پیسە بسرێتەوە، بۆیە تا ئێستاش ئەو تەریقەتە لارێیە سەقامگیری بۆ نەبووە لە هیچ کاتو ماوەیەکدا.

زانای پایەبەرز صەلاحەدینی سەلجووقی لە کتێبەکەیدا(أضواء على ميادين الفلسفة والعلم واللغة والدين) ئاماژەی داوە بەوەی دروستە ناوی دەهریەکان بەکاربهێنیت بۆ ئەو دەستەو کۆمەڵە جیاوازانە کە نکووڵی دەکەن لە زیندووبوونەوەی رۆژی دوایی، هەروەکئاییینە ئاسمانیەکان باسی زیندووبوونەوەیان کردووە، ئەو دەهریانە دە مەزهەبن: ئەبیقۆری،

ئەرتەقائی، مەزدەکی، باتینی، شوێنکەوتوانی ڤۆلتێر، جان جاك رۆسۆ، مۆرۆن، نەفعیەکان، مودەلیسەکان، ماددیگەراکان.

سەلجووقی دەڵێت: هیندیەکان وشەی نیتشری بەکاردێنن بۆ هەموو ئەوانەی لەرێی حەق لادەدەن، شتێکی دروستە ئەو وشە وەربگێڕین و پێی بڵێین دەهریەکان.

دەهریە واتە دەوڵەتی ئارەزووبازیو گریێ دەروونیەکان، دەهریە دەیەوێت زەبوونی و سووکی و ترسو تۆقاندنو دووبەرەکیو ناحەزی و کینە بڵاوبێتەوە، سەید جەمالەدینی ئەفغانی لە کتێبەکەیدا ئاماژەی داوە بەوەی دەهریە پێگەی رسواییو زەبوونیو سەرچاوەی پشێویو گەندەڵیو هەرچیەتین، هۆکارن بۆ رووخانی تاكو کۆمەڵگە، پاش ئەوەی مێژوی راپەرینی گەلان و ئیمانو بنەماکانیان تۆمار دەکات و باس لە رووخانی قەڵەمرەوی دەهریەکان دەکات کە باوەریان بەخوا نەبووە، دوای ئەوانە دەڵێت دەستەی نیشریەکان دەهریەکان کە بچنە ناو هەر گەلێك ئەو خەڵکە دەشێوێننو کەلێن دەخەنە ناو عەقڵیانەوەو دڵی تاکەتاکەکان بە چەندین فێڵێ دەدزێتو بەچەندین ساختە دڵیان دەبات تا ئەو گەلە تێکدەچیێو رسوایی و سووکی دەیگرێتەوەو دەکەونە ئارەزوو پەرستیو نەترسان لە ناپاکی نواندن، بەردەوام خراپەو گەندەڵی جیێ پێی خۆی دادەکوتێت تا کوژانەوە دەبەخشێت بەو گەلە و ناوی لەبوون دەسڕێتەوە یان زەبونی دەکات یان بە هەمیشەیی نەوەکانی دەکەونە هەژاریو کۆیلایەتیەوە.

هەروەها دەڵێت: بەشێك لەو دەستەیە کار دەکەن بۆ شاردنەوەی ئامانجی بنەرەتی خۆیان ە بریتیە لە بێرەوشتی و هاوبەشەکی بوون، لە

رووکەشدا تەنها نکوولّی دەکەن لە ئولوهیەتو نکوولّی کردن لە رۆژی دوایی رۆژی خستنەڕوو و زیندووبوونەوە.

تەنها ئەو دیدە بەسە تا پەیکەری کۆمەڵایەتی بشێوێنێتو پایەکانی شارستانیەت بلەرزێنێت، لەوە زیاتر چ خراپەیەك هەبێت کە بنەونە سڕینەوەی کارو رەوشتە گەورەکان و خراپەو رسوایی نانەوە، گونجاو نیە کەسێك لە یەککاتدا خەیاڵاتی دەهریەو گەورەیی سپاردەکاری و راستگۆییو ورەبەرزیو تەواوی مەردایەتیشی هەبێت.

## دیارترین پەیامەکانی دەهریە بریتین لە:

**یەکەم:** نکوولّی لە بوونی خوای دروستکەر و دەڵێت بوون بێ خوا و بێ دروستکەرە.

**دووەم:** دەڵێن سەردەم و زەمانە دێرینە.

**سێیەم:** نکوولّی لە زیندووبوونەوەو گەڕانەوە بۆ لای خوا.

ئەم دەستەیە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا دەرکەوتنو لەژێر گورزی چەکوشی راستکردنەوەی ئوممەتی ئیسلامیدا لەناوچوون، دواتر لەم سەردەمەی نوێدا ئەو بیرە شێواوە نوێ بوویەوە، ئەویش بە دەستی داگیرکەری بەریتانی لە هیند نوێ کرایەوە.

بۆ ئەوەی تێبگەین لە لایەنەکانی دەهریە پێویستە چەند چەمكو واتایەك بخەینەبەرباسو لە روانگەی مێژووەوە رامێنین تا بزانین چۆن بانگەوازی باتینی رێی خۆی بڕیوەو تا ئەمڕۆ هاتووە، ئەوەی ئەمڕۆش دووبارەی رابردووە یان دارشتنەوەیەکی نوێی بیری کۆنی روخێنەرە.

# باسی دووەم

# سیۆصۆفی

یەکێك لەو مەزهەبانەی کە بیری نویێ لە بواری دژایەتی کردنی ئایین و دانانی وەك بەدیلی فەلسەفی بۆ شوێنگرتنەوەی ئیسلام دایهێناوە بریتیە لە سیۆصۆفی، ئەم وشەیە یۆنانیە و واتاکەی واتە حیکمەتی خودایی، سیۆس خودا و صۆفیا دانایی دەگەیەنێت، ئەم چەمکە لە سەدەی سێیەمی زاینیەوە بەکارهات، دواتر لەسەدەی شانزەی زاینیەوە دەرکەوتەوە، ئەم مەزهەبە چەمكو واتاکانی خۆی لە فەلسەفەی کۆنی هیندیەوە وەرگرتووەو لە سایەی ئەو بانگەوازەوە دەرکەوت کە هەندێ نوسەری ڕۆژئاوا بە ئاراستەی چوون بەرەو فەلسەفە ڕۆژهەلاتیەکان ڕایانگەیاندن تا هەوڵ بدەن برێ پەیام و ڕێرەو بدۆزنەوە کە شوێنی ئایینەکان بگرنەوە، شۆبنهۆری فەیلەسووفی ئەڵمانی یەکەم کەس بوو هۆشیاری دا بۆ توێینەوەی صۆفیگەرایی هیندی بەتایبەت مەزهەبی بووزی کە بانگەواز دەکات بۆ کوشتنی ئارەزووەکان تا ئەو کاتەی دەروون پاش دژایەتی ئارەزووەکان دەگاتە بارێ کە ئیتر تاسەی هیچ ناکات، ئەمەش ئەو بارەیە کە ناوی لێنراوە نەرڤانا،[1] ئەمە بارێکە کە مرۆڤ پێی گەیشت ئیتر عەقڵ تیایدا ئازاد دەبێت و ئارەزوو یان هەستو سۆزەکان کۆتی ناکەن ئیتر ئەوەی نەیدەبینی دەیبینێت، ئەوکات هەست دەکات بە حەقیقەتی بوون یان ڕەگەزی یەکەمی، ئەم ئاراستەش لە بیری ڕۆژئاوادا بەهۆی ئەو

---

[1] - واتە باری تێربوونی ڕۆحی بەدوورکەوتنەوە لە هەموو دنیا.

ناکۆکیەوە دەرکەوت ە هەر لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە لەنێوان زانست و ئاییندا ڕوویدا، کاتێ فەلسەفە وەك بەدیلی ئایین دەرکەوت، دواتر فەلسەفەی ماددیگەری هات، دواتر فەلسەفە هەوڵیدا سیۆصۆفی بکاتە پێناوێك بۆ گەڕان بەدوای ئەودیو ماددەدا، ئەمەش ناسراوە بە گوازرانەوە لە مەزهەبی عەقڵی ماددیەوە بۆ مەزهەبی باتینی حەدەسی کە لەسەر ئیلهام و بەرچاوروونی وەستاوە، مەزهەبی سیۆصۆفی پشت دەبەستێت بە کتێبەکانی بەرهەمی و بووزیو میصریە کۆنەکانو کەبالای جوولەکەیی[1] و ئەوەی کەسانێ دەیلێن کە بڕوایان هەیە بە موناجاتی ڕۆحەکان،[2] ئەو دیاردەیە بڵاوبوویەوە تا ئەوەی هەندێ نووسەر ناویان نا صۆفیگەرایی نوێ، ئەم ڕەوتە پشتی دەبەست بە هەمان ئەو بنەرەتە کۆنانەی کە صۆفیگەرایی هیندی دەیوت کە ئەویش بریتی بوو لە حلوول(توانەوە)، ئەم بنەمایەش لەلایەن ئەورووپیەکانەوە پێشوازی لێکرا چونکە نزیك بوو لە واتاو پەیامی ئایینی ڕۆژئاواییەوە.

ئەورووپیەکان دەڵێن ئەگەر مەسیح ناوی خۆی بە خوا بردووە لەبەر ئەوەیە کە بڕوای هەبووە مەلەکووتی خوای لێ بەدەر نەبوە واتە حاڵە تیاماندا، ئێمەش وەك ئەو خوداین، گیانەکانی ئێمەش[3] ماوەیەك یان خراپەیەکی ئەو ڕۆحە گشتیە گشتگیرەن ە گەردوون و بوون هەیەتی.[4]

---

[1] - کەبالای جوولەکەیی واتە تەصەوفی جوولەکەیی.

٢ - بڕوانە بۆ بەشی ڕۆحگەرایی نوێ.

٣ - چەمكو واتای خوایەتی لە ئیسلامدا جیایە لەو چەمكو واتایە، هەروەك چەمكو واتای پێغەمبەرایەتیش جیاوازە، لە دیدی ئیسلامەوە خودا حال نیە لەم بوونەدا بەڵکو خوای گەورە خۆی بە زاتی خۆی وەستاوە، هەروەها پێغەمبەریش بەندەو نێردراوی خوایە.

[4] - المجلة الجديدة: ١٩٣٣، سلامة موسى.

ئەو چەمك‌و واتایە لە بیری ڕۆژئاوایدا بڵاوبوویەوەو ئەوەش یەکێکە لە واتاکانی وەحدەتولوجودو حلوول و مەجووسیەتی کۆن، توانیشی لە چەمك‌و واتای بیروباوەڕە ڕۆژئاواییەکاندا خاکێکی بەپیت بەدەست بخات بۆ قبووڵکردنی بەڵام تەواو جیاوازە لە چەمك‌و واتای ئیسلامی، بێگومان پەیامی سیۆصۆفیش لە زۆر شوێندا لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت:

**یەکەم**: لە پەیوەندی نێوان خوداو جیهان‌و بووندا.

لە نەهێشتنی بەرپرسیارێتی تاکەکەسیدا کە بە تەواوەتی بەرپرسیارێتی ڕۆژی دوایی لەسەر مرۆڤ دادەنێت لەسەر کارو کرداری.

سێیەم: لە نکووڵی کردنی زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوەی ڕۆژی دواییدا، ئەوەش بەو بانگەشەی گوایە مرۆڤ نەمرەو داهاتوویشی بەرزی و شکۆیەکی بێسنووری هەیەو پاداشتیش دنیاییە نەك پاداشتی ڕۆژی دوایی.

لە ڕووی مێژووییشەوە دەڵێین کۆمەڵەی سیۆصۆفی دامەزراوە لەلایەن مەدام هیلانە پترۆڤنا بلاخابسکی ڕووسیەوە کە لە ساڵی ١٨٧٥ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لەدایك بووە، دواتر چووە بۆ خوێندنگەکانی هیندو ناوچەی ئەدیار ی کردوەتەوە بنکەی کارەکانی‌و دواتریش سەرۆکایەتیەکەی گەیشتوەتە مسز بیزانتی[1] ئینگلیزی کە دکتۆرای هێناوە لە مافداو تا ساڵی ١٩٣٠ لەو بارەدا ماوەتەوەو بەردەوام لەنێوان هیندو ئەورووپاو ئەمریکادا

---

١ - مسز بیزانت گەورەترین بانگخوازی سیۆصۆفیگەری بووەو ژنی قەشەیەکی ئینگلیزی بووە کە گومان بەرامبەر بە مەسیحیەت لەدڵیدا پەرەی سەندووەو لەگەڵ هاوڕێیەکیدا بەناوی برادلف کەوتوەتە بانگەوازی تەعتیل‌و دواجاریش بەرەو صۆفیگەری چووەو بەگوڕو تینەوە وەریگرتووە، چووە بۆ هیند و لەوێ زمانی هیندی فێر بووەو صۆفیگەری هیندی خوێندووەو لەسەر مەسەلەکانی حلوول و تەجسید کتێب‌و بابەتی نووسیوە.

هاتوچۆی کردووە، وانەو وتاری پێشکەش کردووەو لە بواری فەلسەفەو دەروونناسی و کۆمەڵایەتیو سیاسەتدا بەتایبەت لە سیۆصۆفیگەریدا چەندین نووسینی هەیە.

پۆلس مصوبغ[1] لقەکانی ئەو کۆمەڵەی لە جیهاندا لە ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستدا کۆکردوەتەوەو ئەوانەی هەوادار بون گەیشتوونەتە شەست هەزار کەس، ئەو دەڵێت ئەمە دەستەیەکی تائیفین لە خوازیارانی حەقیقەت کە هەوڵ دەدەن لەسەر بنەمگەلێکی رۆحی خزمەتی مرۆڤایەتی بکەن، هەروەك ئامارەی بەوە داوە گرنگترین ئامانجیان بریتیە لە هێنانەدی بیرێکی برایەتی مرۆی گشتی بێ جیاکاری نێوان رەگەزو مەزهەب و چینو رەنگەکان و تیایدا هەر کەس پەیوەستی ئەو مەزهەبە بێت سەبارەت بە ئایینەکەی پرسیاری لێ ناکرێت،رێش نادرێت دژ بەو رایە بوەستێ و کۆمەڵەکەش بیروباوەڕێکی تایبەتی نیە.

هەندێ لە توێژەران پێیان وایە سیۆصۆفیگەری بەجۆرێ تەماشای هەموو ئایینەکان دەکات کە دیدێکی نیمچە دیموکراتیە لەرووی بەیەکسانی سەیرکردنی هەموویان،[2] ئەمەش زادەی صۆفیگەری هیندیو فارسی کۆنە کە لە پێش هاتنی ئیسلام لە رۆژهەڵاتدا هەبووە.

ئەم بیرە لە وڵاتانی ئیسلامیدا لەلایەن ئەو دەرچووە نێردراویانەوە بڵاودەکرێتەوە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەوە دەستیان گرتووە بەسەر رۆژنامەوانی عەرەبیداو ئاڵای زۆربەی ئەو بانگەوازانەیان هەڵگرتووە، دکتۆر یەعقووب صەروف سەرنووسەری (المقتطف) لە ساڵی

---

١ - الهلال، ١٩٣٠.

٢ - الهلال، م ٣٤، ص٢٣٨.

١٩١٠ سەبارەت بەو مەزهەبانە دەڵێت: سیۆصۆفیگەری جۆرێکی تەصەوفی مەسیحیو رامان و پەیوەندیە بەخواوە بێ ئەوەی پێویست بکات بە کیتابو لەوح، سیۆصۆفیگەری ئێستا تێکەڵ بووە بە تەصەوفی هیندی و باگخوازانیشی چەندین بانگەشەی بەرفراوان و ماوەدرێژیان گرتوەتەبەر.

مەکس میلەی جوولەکە ئەم رێبازە بە ئاییني سریاني وەسف دەکات و پێی وایە لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی بووزیەت و بیری مەسیحی رۆژئاوایەوە هاتووە، زۆرێك پێیان وایە ئەو بنەمایانەی سیۆصۆفیگەری نیاری کردون دەگەڕێنەوە بۆ غەنووصیەتی کۆن، ئەوەش لە رۆژهەلات پێی دەوترێت زانستی رۆحی(ئەتمافیزیا) و زانستی نهێنی(گیتامیزیا) هەر ئەوەیە کە مانی و بووزا و کۆنفۆشیۆس و فیساگۆرس و ئەفلاتوون بانگەوازیان بۆ دەکرد، هەلگرانی ئەو مەزهەبانە بڕوایان هەیە بە حلوول یان بە تەجەسود .

## وەحدەتولوجود

مەرسیدارترین شتێ بیری وەحدەتولوجود بەرامبەر بە بیروباوەڕی ئیسلامی گرتوویەتیە بەر بریتیە لە دژایەتی ئەو بیروباوەڕە یەکخواپەرستیە پوختەی کە خوای گەورە پێغەمبەران و کتێبەکانی بۆ ناردووە، وەحدەتولوجود پێی وایە دروستکراوان خودان و بوونیش هەر خودایە، بەلاّم ئیسلام جیاکاری دەکات لەنێوان خودای دروستکەردا کە هیچ وێنەو نموونەیەکی نیە لەگەڵ بوونی دروستکراودا، جا واجیبولوجود خوای تەنهای دروستکەری بێ هاوەڵە، بەلاّم مومکینولوجود ئەو دروستکراوانەن کە ئێمە بە پێنج هەستەکانمان درکیان پێ دەکەین.

بەڵام هەڵگرانی بیری وەحدەتولوجود پێیان وایە ئەو دوانە یەکن، واتە بون خودی خودایە، ئەمەش واتایەکی بێ بناغەو نارەسەنە لە بیری ئیسلامیداو وەرگیراوی فەلسەفەکانی ترە کە لە بیری یەکخواپەرستی پوختی ئایینەکان و هەمو پێغەمبەران دەرچووەو قورئان‌و ئیسلامیش بە جوانترین و کاملترین شێوە ئەو یەکخواپەرستیەی روونکردوەتەوەو خستویەتیە بەرچاوان.

بەراستی ئیسلام نکوولّی دەکات لە بیروباوەڕی ئیتیحاد و حلوول، نکوولّی لەوە دەکات خالق لەناو مەخلوقدا(دروستکەر لەناو دروستکراودا) بتوێتەوە یان بەپێچەوانە دروستکراو لەناو دروستکەردا نغرۆ بێت، بەڵکو سروشتی هەرکامیان جیایە، ئیسلام وەحدەتولوجودیشی قبووڵ نیە چونکە لە بیروباوەڕی رەسەنی ئیسلامیەوە(لا إله إلا الله) ناچێت بۆ وتەی هەندێ فەیلەسووف کە دەڵێن(لەراستیدا هەر بوونێك هەیە خودایە)، دەرەنجامی هەرکامیان بەرەو کۆتاییەك دەروات کە ئەنجامەکانیان تەواو لەیەك جیاو دوورن.

ئێمە ئەوە دەزانین بیردۆزەی وەحدەتولوجود سەرەتا لە فەلسەفەی یۆنانیەوە هات و لەگەڵ ئەو فیترەتەشدا نەگونجاوە کە ئیسلام بانگەوازی بۆ دەکات و شوێنکەوتوانی هاندەدات تا بیربکەنەوە لە دروستکراوانی خوداو رێ نادات بیربکەنەوە لە خودی خودا، دان بەوەدا دەنێت کە بوون یان کەون لەخۆوە دروست نەبووە، بێگومان زۆربەی توێژەران بێ رێنموونی بەخششەکانی سروش و پەیامە دابەزیوەکان ماوەیەکی زۆریان بڕی ەدوای راستیە گەردونیەکاندا، بەڵام نەگەیشتنە راستی و رێنموونی، دوورترین هەنگاویان ئەوەبوو بە هەستە کورت ماوەکانیان‌و بە عەقڵی سنووورداری مرۆیی گەیشتنە درککردن بە بوونی خوا و ئەودیو سروشت‌و

نەیانتوانی بگەن بەوەی ئەو پێناوانەی هەست و عەقڵ خودی خۆیان کەموکورتن و ناتوانن بیانگەیەننە ئەو ئامانجە گەورەی کە تەنها لەرێی بڕوابوون بە پەیام و سروشی خوایی دێتەدی، ئەو سروش و پەیامەی کە خوای گەورە دایبەزاند بۆ پێغەمبەرانیو زامنی دڵنیایی تەواوی ئەو بوارەیە بۆ مرۆڤو بێباکی دەکات لەو هەوڵانەی ناگەنە شتێکی وا.

ئەوەی دەوترێت خودا بریتیە لە بوون، ئەمە تێگەیشتنێکی تەواوی ماددی بۆ خودا لەخۆدەگرێت کە لەگەڵ عەقڵو فیترەتیشدا ناگونجێت، لەگەڵ ئەوەش ناتەبایە کە خوای گەورە لە پەیامی خۆیدا لە سروشی خواییدا باسی کردووەو دەیەوێت لەو بوارەدا دەروونی مرۆیی ئارام و دڵنیا بکات تا پێویستی بەوە نەبێت بگەڕێت بەدوای شتێکدا کە هەرگیز پێی ناگات، رێگەشی پێ دەدات رامان و بیرکردنەوەی هەبێت لە بواری تردا، بواری بنیاد و دۆزینەوەی نهێنیەکانی ماددەو ئەوەی خوا لەسەر زەویدا دایناوە، رامان لە ئاو و شاخ و بەخششو کانزاکان کە بە مرۆڤی بەخشیوە، هانی دەدات تا بەدوایاندا بگەڕێت و پوخت و جیایان بکاتەوە، ئەمەش وەك ئەوەی پێغەمبەری خودا وێنای کردوە(تفکروا في خلق الله و لا تفکروا في ذات الله فتهلکوا)،[1] (بیربکەنەوە لە دروستکراوانی خودا و بیرمەکەنەوە لە زاتی خودا ئەگەرنا ماڵوێران و رەنجەڕۆ دەبن).

یەکێك لە مەترسیدارترین ئەو شتانەی کە بیردۆزەی وەحدەتولوجود پێی گەیشتووە ئەوەیە دەڵێت بوون بریتیە لە خودا، ئەمەش بۆ نەهێشتنی ئەرك و دارماندنی بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پەیوەستی ئەخلاقیە، جا کە مەزهەبی وەحدەتولوجود لە خودی خۆیدا لەگەڵ ئاینی حەقی خواییدا

[1] - ضعفه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير و زيادته، الرقم ٢٤٧١.

ناگونجێت(ئەو ئایینەی داوا دەکات تەواو جیاوازی بکەیت لەنێوان خودا و جیهاندا)، ڕێبازێ کە لەگەڵ عەقڵی ساغدا ناگونجێت، ئەو عەقڵەی ئەوە پێ قبووڵ نیە خودا جیهانێ بێت کە ئاژەڵو داروبەردی تێدایە، ئیتر وەحدەتولوجود دەبێتە هەڕەشە بۆ بەهایەکی گەورەی بەهاکانی ئیسلام کە ئەویش بریتیە لە ئەخلاق.

بۆیە پەیامی وەحدەتولوجود لەگەڵ ئەو یاسا ئەخلاقیەی ژیاندا ناگونجێت کە بنەرەتی پتەوە، جا چۆن دەگونجێ ئەو مرۆڤە خۆی بەرپرسیاری ئەنجامەکانی کاری بێت؟ لێرەوە ئەو بانگەوازە مەرسیدارە دەردەکەوێت کە مەبەستو ئامانجی بنەرەتی خۆی دژایەتی کردنی ئیسلامە تا ئەرك و بەرپرسیارێتی نەهێڵێت یان حەرامی خوا حەڵاڵ بکات یان سنووری خوا ببەزێنێت، بێگومان ئەوانەی باسی وەحدەتولوجود دەکەن وتەیان بە تەواوەتی دژی بیروباوەڕی یەکلاییو ڕوونو دیاری ئیسلامە.

ئێمە پێویستیمان بەوە هەیە ئاگادار بین لە هەڵەی ئەو چەمكو وتانەی کە دەڵێن هەموو لە یەکدایەو یەکیش لە هەموودایە یان دەڵێن هیچ بوونێ نیە جگە لە خودا و هەموو بوونەکانیش ڕوخساری خودان، هەموو ئەمانە بە تەواوەتی لەگەڵ یەکخواپەرستیدا ناگونجێن وەك ئەوەی قورئان باسی کردووەو موسڵمانان لێی تێگەیشتون.

ئەگەر بیرۆکەی وەحدەتولوجود لەگەڵ سروش و عەقڵ و فیترەتیشدا نەگونجێت و نەیار بێت، ئەوا ژمارەیەکی فەیلەسووفان وای دادەنێن تا ئەوەی شۆبنهۆر دەڵێت وەحدەتولوجود تەنها وێنەیەکی پوختی ڕێبازی ملهوڕیە، چونکە ڕاستی ڕێبازی وەحدەتولوجود لەوەدا بەرتەنگ بوەتەوە

کە نەگونجانی دوانەیی نێوان خودا و بوون دادەڕمێنێو بڕیاری ئەوە دەدات بوون بەهۆی هێزە ناوەکیە تایبەیەکانیەوە هەیە، جا ڕێبازێك کە هەڵگرانی وەحدەتولوجود دەیڵێن گوایە خوا و بوو یەك شتن تەنها پێناوێکی کورتە بۆ بێباك بوون لە خوا یان لەکارخستنی کاری، دیارە فەیلەسووفانی یۆنان هەر لە تالیسەوە کە یەکەم فەیلەسووفیانە تا ئەرستۆ باس لەوە دەکەن خودا لە جیهاندا یان جیهان لە خودادا یەکانگیر و تێکئالاون.[1]

مامۆستا عەبدولمونعیم خلاف دەڵێت: جیاکردنەوەی خوا لە بوون ئەو بیدە سەرەتاییەیە ە زۆربەی کێشەکانی بون چارەسەر دەکاتو بەوەش پێشڕەوی مرۆییمان ڕێکدەخرێو بەرپرسیارێتی و ئەرکەکان دیاری دەکاتو سنورەکان تێکەڵ ناکاتو ئەرکەکان لەناو ناباتو بەهای شتەکان بەفیڕۆ نادات.

نیقۆلا حەداد دەڵێت: سێ ئایینە ئاسمانیەکە بەرپەرچی تەواوی ئەو بیردۆزە فەلسەفیە دەدەنەوە گە پوختەکەی ئەوەیە خواو بووی ماددی دوو شتی جیاوازنو هەرکامیان خودێتی تایبەت بە خۆی هەیە جیا لەوانی تر، خواش واجیبولوجودە کە دروستکەرو بەڕێوەبەری بوونە.

دکتۆر موحەممەدی یووسف مووسا دەڵێت: خودا و جیهان لە هەموو شتدا لەیەك جیان، یەکێکیان بوونی پەیوەستە بە ویستی ئەوی تریانەوە.

مامۆستا بەشبیشی دەڵێت: وەحدەتولوجود ڕێبازێکە کە پوختەکەی ئەوەیە خوا بوونی ڕەهایە و جگە لەوە هەرگیز بوونی نیە، جا ئەگەر

---

١ - دريني خشبة: الرسالة، م١٩٤٤.

بوترێت مرۆڤ بوونی هەیە لای ئەوان واتای ئەوەیە پەیوەستیەکی بە بوونەوە هەیەو مرۆڤ خودی خودایە، هەموو جیهانەکانیش هاودەم بە جیاوازی جۆر و ڕەگەز و کەسیان لە نەبوونەوە هاتون و بوونیان پەیوەستە بە بوونی خوداوە نەك خۆیان هەبووبن چونکە لە نەبوونەوە هاتون، دواتر پەیوەستن بەو بوونەی کە لە هەموەکیدا بوونی هەیە کە ئەویش بوونی خودایە، خوداشیەکەو دابەش نابێتو ەم ناکاتو گواستنەوەو گۆڕانی بەسەردا نایەتو فرەیی نایگرێتەوە، پاشان بۆ چۆنێتیو شوێن و کاتەکان ڕەهایە، ئێمە نکوولّی بوونی بوون ناکەین لەبەر دەسەڵات و ویستی خودا، بەڵام پێویستە جیاکاری بکەین لەنێوان بوونی خوا کە بوونێکی ئەزەلی بێ سەرەتاو کۆتایە، لەگەڵ بووی یهان کە بوونێکی داهاتووی خاوەن سەرەتا و کۆتایە، پاشان بروامان بەوەیە بوونی جیهانەکان هۆکارەکەی لە خواوەیە، بەلام بڕیارمان وایە جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان هۆکار و هۆکار پێدراو و عیللەت و مەعلوولدا.

## حلوول

چەمکی حلوول جیایە لە چەمکی وەحدەتولوجود، چونکە وەحدەتولوجود باس لە یەکبوونی خۆیی دەکات بۆ هەموو شتەکان با لە روکەشدا زۆر بن(ئەمەش ساختەیەکە کە ئیسلام قبوولّی نیە)، بەڵام ڕێبازی حلوول باس لە بوونی دو ڕاستی جیاواز دەکات کە بوونی خوایی و بوونی مرۆییە، یەکەمیان لە چەند بارێکی تایبەتدا دووەمی لەبەردەستە.

لویس ماسنیۆن پێی وایە حلوول مۆرکێکی مەسیحی هەیە و چەند بنەرەتێکی یۆنانی و هیندی هەیەو بە رای قورئان روخێنەری تەنهایی خودایە.

ئیمامی غەزالی دەڵێت خوای گەورە واجیبولوجودەو بەدوورە لە سیفەتکانی حلوول، لوولیش بەدوورە لە خوای گەورە لەبەر چەندین هۆکار، چونکە دێرین جیایە لە تازەهاتنە دنیا لەبەر جیاوازی ماهیەتی هەرکامیان، ئەم جیاوازیەش نەبوونی توانەوەی کۆن لە تازە هاتنەبووندا بە واجب دادەنێت.

پاشان خوای گەورە واجیبولوجودە، ئەم وەسفەش لەگەڵ حلوولدا ناگونجێت چونکە لەباری هاتنە بوونیدا حاڵەکە شوێنکەوتەی ئەوە دەبێت کە تیایدا دەتوێتوە هەروەك دەبێتە مەعوولی ئەو مەحەللەو پێی کاریگەر دەبێت، بەڵکو ناگونجێت وێنا الڵ بکەیت مەگەر بە وێناکردنی مەحەل، بۆیە ئەمجارەش حلوول نەگونجاوە وەك چۆن لە باری یەکەمیشدا نەدەگونجا، پاشان خوای گەورە واجیبولوجودەو واجبیش روخسار و کرۆکی بۆ نیە، ئەگەر توانەوە بریتی بێت لە توانەوەی روخسار لە کرۆکدا ئەوە بۆ خوا گونجاو نیە چونکە خوا لەبەر چاوان نیە، ئەگەریش توانەوە کرۆك بێت ئەوەش ناکرێت چونکە خوا کرۆك نیە.

نووسینەکانی حلوول و وەحدەتولوجود و نووسینانی تر هی سەردەمانی لاوازیو دواکەوتەیی، ئەوەش گرنگترین بوارێکە کە رۆژهەلاتناسان کاریان لەسەر کردووەو هەوڵیانداوە زیندووی بکەنەوەو بلاوی بکەنەوە، ئەمەش بۆ دروستکردنی مونتەلەقێك بۆ بانگەوازە نوێکراوەکانی بێرەوشتی بەئیبەت بوونگەرایی و فرۆیدی و جگە لەوانەش،

هەروەها هەوڵدان بۆ تێکشکاندنی یاسایەکی ڕەسەن کە بریتیە لە زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوە، هەروەها دووبارەوتنەوەی بانگەوازەکە بۆ لەکارخستنی ئەرك و پەیوەستی ئەخلاقی، هەموو ئەمانە پێشەکیەکن بۆ لێکهەڵوەشانێ کە ئامانجی ئەوەیە کار بکاتە سەر فەرزی جیهادی ڕێی خودا.

دیارە بروابوون بە بە حلوول ئەرك و پەیوەستی و سنوورەکانی خودا ناهێڵێتو موسڵمانان بەرەو دەرەوەی بەها بنەرەتیەکانیان پاڵ پێوە دەنێتو بنەرەتەدەروونیەکان بۆ پێشڕەوی بەرەو خۆشگوزەرانی و لێکهەڵوەشان و ئارەزووبازی وێران دەکات، ئەمەش لەڕێی بەرزراگرتنی ئارەزووەکان یان هەنگاونان بەرەو پاشەکشە لە ژیان وەك ژیانی ڕەهبانیەت، هەروەها دژایەی کردنی بنەمای هاوسەرگیری و پێکهێنانی خێزانو دوورگرتن لە ژیانسازی و دژایەتی کردنی ئارەزووەکانی کۆمەڵگەکان.

## ئیتیحاد

بیری ئیتیحاد خراپیەکەی زۆر کەمتر نیە لە هەردوو بیری پێووتر، چونکە ئەمانە پێیان وایە بەندە بووە بە خودا، ئەمەش لەگەڵ خودی خۆیدا ناگونجێت، بەڵکو پێویستە خوای گەورە پاك ناو ببرێ و ژمان لە ئاستیدا لەو جۆرە هەولانە بەدوور بێت، هەنگاوی بەڵگەهێنانەوە بۆ خراپی ئەمانەش لەلایەن غەزالیەوە بە سێ ئەگەر هاتووە:

**یەکەم**: یان هەریەك لەو دوو بوونە هەبن.

**دووەم**: یان یەکێکیان لەناوبچێت و ئەوی تریان بمێنێتەوە.

**سێیەم**: یان هەردووکیان لەناو بچن.

لە باری یەکەمدا: لێرەدا ئیتیحادێك نیە.

لە دووەمدا: چۆن دەبێت بڵێیت ئیتیحاد هەیە لە نێوان بوویەك و نەبوویەکدا.

لە سێیەمدا: جێی قسە نەماوە سەبارەت بە ئیتیحاد، بەڵکو باشتر وایە باسی نەبوون بکەین.

بۆیە نەگونجانی روون لە هەموو ئەگەرەکاندا هەیە.

مامۆستا بەشبیشی دەڵێت: وەك چۆن خوا پاك و بێگەردە لە حلوول هەرواش پاكو بێگەردە لە ئیتیحاد، چونکە ئەگەر وا رووبدات واجبولوجوب لەگەڵ شتی تردا ببێتە یەك ئەنجامی دوو شت دەبێت، یان هەردووکیان بە بوونی بمێننەوە، یان هەردووکیان نەمێنن‌و سێیەم بێتە کایە یان یەکێکیان نەمێنێت‌و یەکێکی تریان بمێنێتەوە، جا لە مانەوەی هەردووکیاندا دوانی جیاواز لە یەکن، ئەو جیاوازیەش واتای نەبوونی ئیتیحادە چونکە ئیتیحاد ئەوەیە ببنە یەك، لە نەبوونی هەردووکیشیاندا ئیتر ئیتیحاد نامێنێت چونکە دوو نەبوو یەکناگرن تا ببنە یەك شت، لەو بارەشدا کە یەکێیان نەبێت دووبارە ئیتیحاد هەر نابێت.

# تەناسوخ

بێگومان چەند لایەنێك هێنراونەتە ناو بیری ئیسلامیەوەو هەوڵیانداوە کار بکەنە سەر چەمكو واتا بنەرەتیەە ئیسلامیە قورئانیەکان، لەوانە تەناسوخی رۆحەکان، بیردۆزەی تەناسوخ لەگەڵ چەمكو واتای فیترەتو عەقڵو ئاییندا ناگونجێتو پەیڕەوی راستی چەسپاوی بەرپرسیارێتی مرۆڤو پەیوەستی ئەخلاقی ناکات، ئەمە وێڕای ساکاری ئەو بیردۆزەی کە دەیڵێت و هەوڵ دەدات بەڵگەی بۆ بهێنێتەوە، ئەویش گواستنەوەی رۆحە لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر، ئەمە پێناوێکە تا دەرفەت دوای دەرفەت بدرێت بە رۆح، ئەو رێبازە فەلسەفیانەی باسی تەناسوخ دەکەن پێیان وایە ژیان کورتەو دەبێت دەرفەتێکی تر هەبێت بۆ رۆح تا لە هەڵەکانی رزگار بێت،لە هیندۆسیدا رۆح راستەوخۆی دوای ژیانی یەکەمی لێپێچینەوەی ناکرێت.

بیردۆزەی تەناسوخ دژی ئەو بەرپرسیارێتیە تاکەکەسیەیە کە هەموو کەسێك دەگرێتەوە بەپێی کاری لە دنیادا، ئیتر رۆحێ چۆن بێت کە پەیوەستی چەندین دەروونە؟ چۆن دەکرێت پاداشتی هەموو مرۆڤێکیان دیاری بکرێت؟ ئەگەر رۆحەکان لەگەڵ ئاژەڵەکانیشدا تەناسوخیان هەبێت ئەوە بارەکە ئاڵۆزتر دەبێت.

شتێك کە باس کراوە ئەوەیە فیساگۆرس پێی وایە تەناسوخی نێوان رۆحەکان لەنێوان مرۆڤو ئاژەڵدا بەو واتایە دەکرێت گیانی مرۆڤ ببێتە گیانی سەگێك یان رێویەك، ئەمەش روانینێکی نامۆیە.

لەم بارەیەوە دکتۆر یەحیا هوەیدی دەڵێت: چۆن دەروون دەتوانێت لە جەستەیەکەوە بگوازرێتەوە بۆ جەستەیەکی تر یان لە بوونێکەوە بچێتە ناو

بوونێکی تر، ئەم گواستنەوەیە یەکەمجار ئەوەی دەوێت تەنهایی بوونی دەروون هەبێت، ئەویش لە بوونێکەوە بچێتە ناو بوونێکی ترەوە، یان ئەو ئەگەرە هەیە دەروون پەیوەست نەبێت بە جەستەیەکی دیاری کراوەوە، ئەمەش ناگونجێت، چونکە ئێمە دەزانین سەرچاوەی تاکی مرۆڤ بریتیە لە دەروون، بۆیە دەروون کەسایەتیو یەکبوونو پێناسی مرۆڤ دەهێڵێتەوەو دەیکاتە ئەو مرۆڤەی کە لەو دەروونە دیاریکراوەو ئەو جەستە دیاری کراوە، جا چۆن ئەوانەی باسی تەناسوخ دەکەن دان دەنێن بە تەنهاییو پێناسی دەروونذا، ئەوەش داننا بە پێناسی جەستەی لێ ناکەوێتەوە بەوپێیەی پێکهاتووە لە دەروونو جەستەش.

ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە بیری تەناسوخ لەسەر پێوانێکی هەڵەی زەمەنی وەستاوە، باس لەوە دەکات ئەو دەرفەتی بە مرۆڤ دەدرێت لە ژیانی یەکەمیدا دەرفەتێکی تەواو بەرتەسکە ئەگەر هاتو بەراوردی بکەین بە زەمەنی ناکۆتای هەمیشەیی ژیانی دەروون دوای ئەو ماوەیە، بۆیە دەبێت ئەو ماوەیە لە چەند ماوەیەکی دوای ئەوەدا درێژتر بکەینەوە تا لەگەڵ ئەو زەمەنە ناکۆتا هەمیشەییەدا بگونجێت کە نەفس دوای یەکەم جیابوونەوەی لە جەستە تیایدا دەژیت، ئەمەش بیرێکە کەلەسەر وەهمو خەیاڵی هەڵە دامەزراوە، چونکە هەرچەندە ماوە درێژ بکەیتەوە بۆ نەفس بۆ لەناوچوونی کۆتای و هەرچەندە ماوەکە زیاد بکاتو سەردەمان بێن، ئەوا هەموو ئەوانە لەگەڵ ئەو هەمیشەیی بوونە پێوانە ناکرێن کە نەفس دوای مردن دەچێتە ناویەوە، بۆیە باشتر وایە یەکژیان بۆ ئەو دەروونە دابنێین لەبری ئەوەی چەند ژیانێکی بۆ دابنێین کە بەدەست نارەحەتی هەموویانوە ئازار بچەژێت.

ئیسلام بیری تەناسوخی بەرپەرچ داوەتەوەو پێی وایە دوای ژیانی یەکەمی نەفس کە پەیوەستی جەستە بووە هەمیشەییەکی نەفس هەیە. بێگومان هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە هەمیشەیی نەفس و زیندووبوونەوەی جەستەکان دیارترین مەنتیقە بۆ بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پابەندی ئەخلاقی لەبەر بوونی موحاسەبە و پاداشتی ڕۆژی دوایی.

دەکرێت لێرەدا تێبینی ئەوە بکەین کە یەکەم کەس دوای هاتنی ئیسلام باسی تەناسوخی ڕۆحەکانی کرد سەبەئیەکان بوون، ئەمەش وەك هەوڵێك بۆ ساختەخستنە ناو چەمك و واتا بنەرەتیەکانی سنووری پەیوەندیەکانی نێوان خودا و پێغەمبەرو عەلی کوڕی ئەبووتالیب، بێگومان بیرۆکەی تەناسوخ چوونە مەزهەبی حلوولی لێ دەکەوێتەوە.

## نەرڤانا

وشەیەکی ئاڵۆزە کە واتاکەی سڕینەوەو وەستان و نەمان و ژیانەوەو حەسانەوە دەگەیەنێت، مەبەستە ڕۆحیەکەی ئەوەیە بارێکی لەدەستدانی هەستە کە لەو بارەدا نەفس هەست بەو ئازارە نامێنێت کە پەیوەستە بە جەستەوە.

نەرڤانا بوونێکی ئیجابی نیە، بەڵام دەرباز بوونە لەو بوونە بەئازارە کە مەقامی بەختەوەری و بەخشش بوونی بۆ دەهێنێت، صۆفیگەرا موسڵمانەکانیش نەرڤانایان بە واتا زمانەوانیەکەی وەرگرتووەو ناویان ناوە فەنا بوون، دیارە فەنابوونی صۆفی جۆرێکی نەرڤانا نیە، بێگومان نەرڤانا دیاردەیەکی سلبیو بیرۆکەیەکی وەرگێڕاوی ڕێبازی ڕەش بینیە، بریتیە لە

رامانێکی دوور لە هەر واتایەك کە ئەو کەسە دەباتە بارێك نەفسی خۆی فەنا دەکاتو هەمو وێنەو نەخشێك باس و بیری نیشان نادەن، ئەمەشیان لەو وتەی بووزا وەرگرتووە کە دەڵێت هەموو شتێك بەتاڵەو هەموویش هیچ کرۆکێکی نیە، هیچ شتێ بوونی نیە، هەموویش دەگۆڕێت، هەموو لە سەیرورەیەکی بی کرۆکدایە، لای ئەم کەسانە تەنانەت مرۆڤ بەرەورووی تەناسوخ یان خولی رۆحەکان نابێت تا بگاتە نەرڤانا، دکتۆر عەبدورەحمان مەرحەبا راست دەکات کە دەڵێت: بیرکردنەوەی هیندی مرۆڤی تێکشکاند چونکە بانگەواز دەکات بۆ بەخوادانانی مرۆڤ.

## ئیشراق

مەزهەبی ئیشراق تێکەڵەیەکی ئیغریقی و فارسیە، لقێکە لە فەلسەفەی یۆنانی و ئەفلاتوونی نوێ، کۆکراوەیەکی نێوان چەمكو واتای رەواقیەکانە، ئەو بوارە ئیغریقیانەی کە هەیەتی لە فەلسەفەی ئەفلۆتین و فەیلوونی جوولەکەوە وەرگیراون، بوارە فارسیەکانیشی وەرگیراون لە مانی و مەزدەکی، ئیشراق کۆکەرەوەی برێ راو رەوتن کە لە ئایینە کۆنەکاندا بڵاو بون، بە گشتی ئەمە پەیامیەتی: سەرچاوەی بوون بریتیە لە رووناکی، بۆیە بە رووناکی باڵا دەربڕی خوا دەکات، جیهاەکان بەو نوورانە وەسف دەکات کە لە نووری یەکەمەوە هاتون، مەعریفەی مرۆی لە دیو روانینی ئیشراقیەکانەوە بریتیە لە ئیلهام کە لە جیهانی باڵادا لەرێی عەقڵی گەردوونەکانەوە دەگات، ئەمەش ناودەبرێت بە دۆزینەوە یان ئیشراق، بە گشتی لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامدایەو دووریشە لە کرۆکی ئیسلامو لەگەڵ یەکخواپەرستیدا نەگونجاوە، بانگەواز بۆ مەزهەبی ئیشراق لە

ئیسلامدا لە سەردەمانی جەنگە خاچپەرستیەکاندا نوێ بوویەوە، لە هەمان کاتە سەختانەدا کە موسڵمانان لە هەوڵدا بوون بۆ بەرگرتن بە دوژمنی شاڵاوهێن.

بیرۆکەی ڕووناکیو تاریکی سەربە مانەوی و مەزەکی و باتینیە. بانگخوازانی ئیشراق کاریگەر بون بە چەمكو واتاكانی مجووسیەت و زەردەشتیو مەسەلەکانی پەیوەست بە هەسارەو ئەستێرەو گەردوونەکان.

ناسینی خوا لە ئیسلامدا بنەڕەتو سەرچاوەی خۆی هەیەو تەواو دوورە لە ئسلووبی غەنووصیو تەنها لەسەر بنەمای ئیلهام یان عەقڵ نەوەستاوە، بەڵکو ڕێبازێکی تەواوو پراوپڕە کە تایبەتمەندیو لایەنە تەواوەکانی هەیە، لە ئیسلامدا مرۆڤ بەرز نابێتەوە بۆ پلەی خوایەتی یان یەکبوونی ناسووت و لاهووت نیە، چەسپاویشە بزاڤی بانگخوازی ئیشراق پەیوەست بووە بە قەرمەتی باتینیو بزاڤەکانی زەنجو جگە لەوانەش کە هەوڵیان دەدا لەڕێی بانگەوازی فیکریەوە دەوڵەتی ئیسلامی بڕووخێننو بە بیردۆزەی فەلسەفی یەکخواپەرستی داڕمێنن.

موسڵمانان لەسەر بنەمای قورئانو سوننەتی صەحیح بیری خۆیان دامەزراندووەو ژیانی پێغەمبەری خوایان کردوەتە نموونەیەکی پەیڕەوی کە تێینەپەڕێننو چاویان لەوە نەبێت زیادەکای بۆ بکەن، بڕوایان بەوە هەیە هەرچیەك قورئان یان پێغەمبەری خوا باسیان نەکردبێت ئەوە لە ئایینی خوادا نیە، پێغەمبەری خوایش هیچی لە ئوممەتەکەی نەشاردوەتەوەو پێغەمبەریش (ﷺ) هاتووە تا ڕەوشتە بەرزەکان تەواوو کامل بکات.

# باسی سێیەم

# بەهائی

بانگەوازی بەهائی بانگەوازێکی کۆنی نوێکراوەیە کە چەند بنەرەتێکی جیاجیای بیری بتپەرستی هێلێنی و تلموودی جوولەکەیی و غەنووصی مەجووسی پێکیدەهێنن، ئەم بانگەوازە یەکێکە لەو بانگەوازانەی کە لە سەروبەندی داگیرکاری بەریتانیدا دەرکەوت بە ئامانجی لەکارخستنی فەرزی جیهاد.

جوولەکە ئەو بزاڤەیان بردە ناو ئێران‌و کردیان بە دیدێکی پەیوەست بە ماسۆنیەت، بەهائیەت هەوڵ دەدات بە دەرچوون لە بنەرەتەکانی بۆ چوونە ناو ئایینێکە نوێ بانگەواز بۆ یەکبوونی ئایینەکان بڵاوبکاتەوە، باسی ئاشتی گشتی و یەکبوونی زمانەکانی جیهان و یەکسانی ژن و پاو دەکات و پەرستش لە کاردا دەبینێتەوە.

بەهائیەت بانگەواز دەکات بۆ یەکبوونی ئایینەکان‌و یەکبوونی گەل و رەگەزەکان، لە روانگەی ئەم بانگەوازە جیهانیەوە رۆحی ئەو پیلانە تلموودیانە ئاشکرا دەبێت کە هەوڵ دەدات لەپشت رۆحیەتی نوێ و سیۆصۆفیگەریەوە ئەو بانگەوازە بڵاو بکاتەوە، هەموو ئەمانە هەووڵن بۆ موژدەدان بە سەردەمێکی نوێی درەوشاوە بەسەر مرۆڤایەیدا، ئەمەش هەموو هەنگاوی پرۆتۆکۆلاتی صەهیۆنە.

بێگومان هەموو بانگەوازێك بانگەواز بکات بۆ یەکبوونی ئایین‌و رەگەزەکان هەوڵ دەدات ئیسلام دارمێنێت، چونکە تەنها ئیسلام تاکە

ئایینە کە هەوڵ دەدرێت یەکانگیر بکرێت لەگەڵ ئەوانی تردا، جیهانی بوونی ئایینەکان تەنها بۆ لەناوبردنی جیهانیبوونی ئیسلامە، هەموو ئەم واتایانە لەبنەرەتدا وەرگیراوی تلموودن، دیارترین واتاو نیازی بەهائیەت لەکارخستنی فەرزی جیهادە، کاتێ ئەم بیرە لەناو موسڵماناندا بڵاوبێتەوە تەنها صەهیۆنیەتی جیهانی سوودی لێ دەبینێت کە سوورە لەسەر وشەو باسی ئاشتی، بەهائیەت بە ڕێنمایی جوولەکە پاڵپشتی سووخواردنیش دەکات، چەندین وتەی بەهاو هەن کە باس لە قازانجی سوو دەکات، بێگومان ئەمە هاوێنەیی تەواو لەگەڵ ئایدۆلۆجیای تلموودی بەهائی ئاشکرا دەکات تا ئەوەی بەهائیەکان بە مەجووسی سەدەی بیستەم دادەنرێن،لە سیستم و ڕێکخستنیشدا زیاتر لە ماۆنیەتەوە نزیکن، کەشی لەبار بۆ بەهائی لە هەر ناوچەیەکە کە تیایدا بێداریخوازی ئیسلامی لاوازە، بەهائیەکان لە تورکیاو عەککا و حەیفا لە سەروبەندی جەنگی جیهانی یەکەمدا نیشتەجێ بون، ئەمەش کاریگەری قووڵی هەبوو لە دامەزراندنی نیشتیمانی نەتەوەیی جوولەکەیی لە فەلەستین و هەستان بە ڕۆڵێکی گرنگی چالاکی دەرکردنی کۆچەران، عەبباس بەها بە ئاکارو هەڵسوکەوتەکانی نمونەیەکی ڕێبەری بەهائی پێشکەش کرد، سەردانەکانی زۆر زۆر بون بۆ سویسرا و فەرەنسا و ئینگلتەرا، هەندێ هەڵوێستی هەبوو کە ڕزگار بوون بوو لە هەموو بەهاو ڕەوشتەکان، وتەکانیشی سەرسامیەکی گەورەیان پێوە دیار بوو بە بیری مەجووسی و بەکەمدانانی بانگەوازی پێغەمبەران، وا وەسفی پێغەمبەرانی کردووە کە خاوەن وەهم وخەیاڵن و بیروباوەڕی ڕۆژهەلاتیان خراپ کردووە.

پیلانەکانی بەهائیەت ڕێبازێکی تەواون بۆ لەناوبردنی ئیسلام.

**یەکەم:** دیارترین پەیامی بریتیە لە تەئویلی ئایەتەکانی قورئان بەجۆرێك لە واتاو مەبەستی زمانەوانیو شەرعی خۆی دەری بکات، بەهائیەت بنەرەتی یەکەمی لەسەر تەئویل وەستاوە هەروەك باری دەستە باتینیە کۆنەکان دوور لە بنەرەتەکانی زمان و سونەنەکان دەستکاری واتای ئایەتەکان دەکات و لە دانایيو ڕێنموونی دووری دەخاتەوەو بەرەو چەند مەبەستێك ئاڕاستەی دەکات کە لە بنەرەتدا لەگەڵ قورئانو تئویلی دەقەکانی شەریعەتدا نەیارە بەجۆرێك ئەرکو بەرپرسیارێتی لەکاردەخات، تەئویلیش هونەرێکی داهێنراوی جوولەکەیە.

**دووەم:** بەهائیەت دەکەوێتە پەرەدان و دەستکاریکردنی شەریعەتو بەپێی ڕ‌ۆرانی سەردەم دەستکاریی شەریعەت دەکات، ئەمەش هەمان ئەو بانگەوازەیە کە ئەمڕۆ بانگەوازەکانی فرۆیدی و بوونگەرایی داوای دەکەنو لە بنەرەتە ڕەسەنەکانی پیلانی تلموودین، ئەوانە درۆ و بوهتانیان لا ئاسانەو دەڵێن شەریعەتی ئیسلامی بۆ ئەم سەردەمە گونجاو نیە، بەرمابەر بەمە دان دەنێن بە یاسا دانراوەکانو نیزامی ڕۆژئاواو جیاکردنەوەی ئایین لە کۆمەڵگە.

**سێیەم:** دژایەتی کردنو بەرنگاربوونەوەی جیهاد تا ئەوەی یەکێکیان دەڵێت موژدەی یەکەم بۆ هەموو خەڵکی جیهان بریتیە لە سڕینەوەی حوکمی جیهاد لە کتێبدا[1](واتە قورئان)، دەنگی ئەو بانگەوازە بەرامبەر داگیرکاری جوولەکە بۆ فەلەستین بۆ ملکەچکردنو زەبوونکردنی موسڵمانان بەرزبوویەوە، هەروەها بەرامبەر بە هاواری سوڵتان

---

1- نبذة من إشراقات بهاء الله، ص١٠٩.

عەبدولحەمید وەستا کاتێ سوڵتان جیهادی ئیسلامی بەرامبەر بە کشانی داگیرکاری دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند.

**چوارەم**: دژایەتی کردنی زمانی عەرەبیو بانگەواز کردن بۆ گۆڕینی زمانی پاراو کە بە زمانی نورا ناوی دەبەن، ئەمەش بە ئامانجی دژایەتی زانی جیهانی ئیسلام کە زمانی عەرەبی قورئانە، تا گومان لەسەر جیانی بوونی زمانی عەرەبی دروست بکەن، زمانی عەرەبی هاوبەشی نێوان عەرەب و موسڵمانانە، زمانی بیر و ڕۆشنبیری و نوێژە، ئامانج لە لێدانی ئەو زمانە پارچەپارچەکردنی پەیوەندی نێوان ئێستای موسڵمانانو میراتی نەمریانە.

**پێنجەم**: بانگەواز بۆ پێغەمبەرایەتیەکی نوێو ئایینێکی تازە کە ئیسلامو هەموو ئایینەکان بسڕێتەوە، بانگەوازکردن بۆ دەرچوون لە ئایینە ڕاوەستاوەکانو چوونە ناو ئایینێکی نوێ، ئەمەش شوێنکەوتەیی بانگەوازی ماسۆنیەت و ڕێبازی جوولەکەو ئایدۆلۆجیای تلمودی هەی بۆ سەپاندنی نیزامێکی جیهانی لەڕێی مونتەلەقی سووخواردن، بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەش لەڕێی مەزهەبێکەوە دەبێت کە هەموو ویستە ئارەزوویی و چاوچنۆکیەکان لەخۆدەگرێت.

**شەشەم**: بانگەواز بۆ ئاشتی گشتی کە بانگەوازی ئیسرائیلە بە ئامانجی مانەوەی بوونی لە خاکی ئیسلامیدا، بانگەوازی صەهیۆنیەتی جیهانیە بۆ دەستگرتن بەسەر جیهاندا.

**حەوتەم**: لەکارخستنی شەریعەتی ئیسلامی و حوکمەکانی سەبارەت بە مەسەلەکانی پەیوەست بە ئافرەتانو بانگەوازکردن بۆ تێکەڵی نێوان ژنو پیاوو یەکسانی نێوانیان بەجۆرێك ئافرەت لە قوامەی پیاو دەرباز بێتو

کردنی ئافرەت بە چێژ و ئامێری دەست، ئەمەش لە ئایەی فەلسەفەی چێژوەرگرتن‌و بەشداری ژن و پیاو لە هۆڵەکانی سەماو یانە شەوانەکان‌و پەیڕەوی ئازادی جنسی رەها، لە ئەنجامیشدا دارمان‌و لێکهەڵوەشانی خێزان.

**هەشتەم**: پەیوەندی روونی نێوان جوولەکایەتی تلموودی‌و بەهائی و شوێنکەوتەیی جوولەکە لە ڕێبازیانداو گەڕانەوە بۆ فەرهەنگی جوولەکە، ئەم دەست لەملانێیەی نێوان بەهائی‌و صەهیۆنیەت لە ئێستادا هاوشێوەی دەست لە ملانێی جوولەکەو مەجووسیەتە لە کۆندا، ئامانجیشی لەناوبردنی ئیسلام و لەرزاندنی پایەکانیەتی، ئەوە لە بەهائەوە باسکراوەو چەسپاوە کە بانگەواز دەکات بۆ کۆکردنەوەی موسڵمانان‌و مەسیحیەت‌و جوولەکەکان لەسەر بنەماکانی موسا پێغەمبەر، واتە دەیەوێت موسڵمانان‌و مەسیحیەکانیش بکات بە جوولەکەو جوولەکایەتی دەکات بە ئایینی زاڵی سەرزەوی، بەمەش دەسەڵاتی هەموو جیهان تەنها بەدەست جولەکەوە دەبێت.[1]

زۆر توێژەر بەرامبەر بە بانگەوازی بەهائی وەستاون‌و ساختەکانی ئەو بانگەوازەیان خستوەتەڕوو، پێشڕەوی ئەوانەش زانا موحەممەد فەرید وەجدیە کە دەڵێت: نیازی بەهائی بۆ ئەوەیە ببێتە ئایینێکی گشتی کە خەڵکی بە جیاوازی رەگەز و ئایینیان بچەناویەوە، ئەمەش جێی سەرسوڕمانە چونکە ئایینێکی ئاسمانی نیەو ئەو بنەماو بنەرەتانەی تێدا نیە کە عەقڵەکان بەلای خۆیدا رابکێشێت پاش ئەوەی دەبینین زۆر زیاد لە سنوور خۆی دەنێنێ بەسەر گەلاندا، ئەوە لەکوێ و ئیسلام لە کوێ کە چەندین گەلی بەهێزو راوەستاوی دامەزراند، چەندین شارستانیەتی باڵای بە

---

[1] - محسن عبدالحمید: حقيقة البابية والبهائية.

درێژایی سەردەمان بنیادناو تا ئێستاش وەك زیندوێتیە یەکەمینەکەەتی تا ئەوەی فەیلەسووفانێکی زۆر لەوانە برناردشۆ پێشبینی ئەوە دەکەن بنەماکانی ئیسلام هەموو جیهان بگرنەوە، ئیسلام لەسەر دوو بنەرەت وەستاوە لە چوارچێوەی گشتگیری و هەمیشەیی بوونیدا: گونجانی لەگەڵ فیترەت‌و پشت بەستنی بە عەقڵ‌و زانست، جا بەهائی لەکوێن لەچاو ئەو هەڵوێستە زانستیە حەقەدا، بەهائیەت لەسەر دوو بنەرەت وەستاوە، یەکەمیان کۆت‌و نارِوون کە کەسانێکی شەیدای چوونە ناو خەیاڵات باسی دەکەن کە وێناکردنی زاتی خوایە بە وێنەی دروستکراوان، دووەمیشیان لادانی وشەکانە لە روکەشیان کە تیایدا دەرفەتێکی فراوان هەیە بۆ گومان‌و دوودڵیەکان.

بەهائیەت بانگەواز بۆ ئەوە دەکات کە بنەرەتی نوێی هێناوە بۆ جیهان کە پێشتر چاکسازان نەیانزانیوەو نەیانهێناوە، تیایدا دەمارگیریەکان نین و رەگەز دیاری نەکراوەو ئاشتی گشتی‌و یەکسانی ژن و پیاو هەیە، ئەوەش کە ناویان ناوە یەکبووی ئایینەکان ئیسلام پێشتر باسی کردووەو لەسەر بەهێزترین بنەرەتەکان دایمەزراندووەو بەهێزترین بەڵگەی لەدەور داناوە، بڕیاری ئەوەی داوە بنەرەتی هەموو ئایینەکان یەك شتەو ناکۆکیەکانی نێوانیان بەهۆی دەستکاریکردنی سەرکردەکانەوە بووە کە گومان و خەیاڵیان بردوەتە ناو ئایینەکانەوە.

ئیسلام پەیامی یەکبوونی ئایینی بە فەرز داناوە لەسەر هەڵگرانی‌و فەرمانیان پێ دەکات بروایان هەبێت بە هەموو پێغەمبران بێ جیاوازی دانان لەنێوانیاندا.

مرۆڤایەتی پێویستی نیە بە ئایینێکی نویّ لە دوای ئیسلام، چونکە ئیسلام هەموو مەرجەکانی ئایینی گشتی لەخۆگرتووە.

هەرچەندە بەهائیەت نیو سەدە یان زیاتر بەسەر بانگەوازیدا تێدەپەڕێت، کەچی نابینین توانیبێتی یەك ئامانجی خۆی بەدیبهێنێت لەیەکخستنی رۆژهەلآت یان رۆژئاوا یان یەکخستنی ئاینەکان یان نەمانی جەنگەکان، هەرچیەك کە لێی بینراوە ئەوەیە کە شەپۆلێکی ساختەی بێرەوشتیو ملهوڕیە کە هەموو بەزمەکانی باتینیەتی کۆنی لەخۆگرتووەو جارێکی دی گەرم کراوەتەوە بۆ مرۆڤایەتی.

یەکێك لە دیارترین ئامانجی ئاشکرابووی بەهائیەکان ئەوەیە کە لە دیارترین چەمكو واتا هاوبەشەکان لەگەلّ بانگەوازە رووخێنەرەکانی تردا هاوبەشی دەکەن.

**یەکەم:** نکوولّی لە زیندووبوونەوەو بەهەشت و دۆزەخو هەموو ئەوانە تەئویل دەکەنو لەوەشدا لاسایی دەستەی باتینیەکان دەکەنەوە.

**دووەم:** بانگەوازی پێغەمبەرایەتی بۆ هەندێ رێبەری رەوتو رێبازەکەیان.

**سێیەم:** چەکداماڵینو نکوولّی لە جیهادو بلاّوکردنەوەی بانگەوازی ئاشتی گشتیو نەهێشتنی دەمارگیریە ئایینیەکان.

**چوارەم:** نکوولّی لەوەی قورئان موعجیزە بێتو لە خواوە بێت.

**پێنجەم:** خراپی بیروباوەڕیان سەبارەت بە پێغەمبەرانو سکاڵاکردن لە دژیان گوایە پێغەمبەران راستیەکانیان شاردونەتەوە، نکوولّیش دەکەن لە موعجیزەکانی پێغەمبەران.

# بنەمای تەئویل

ئیسلام ئەو واتای تئویلەی پێ قبووڵ نیە کە کاری سووککردنی ڕێسا ئەخلاقیەکان بێت یان شان‌و شکۆی ڕێسا ئەخلاقیەکان کەم راگرێ، چونکە ئەو ڕێسایانە کۆتی بێ بنەماو پووچ نین یان کۆتی سەپێنراو بەسەر مرۆڤدا نین.

ئیسلام لە کرۆکی خۆیدا لەسەر چەسپاوی‌و چەمك‌و واتای دروست راوەستاوە(آيات محكمات هن أم الكتاب)(فأما الذين في قلوبهم زيغ فيتبعون ما تشابه منه ابتغاء الفتنة وابتغاء تأويله وما يعلم تأويله إلا الله و الراسخون في العلم يقولون آمنا به ل من عند ربنا).

هەوڵی نوێکراوەی تەئویل بۆ ئەوەیە تا ئیسلام هەموو شتەکانی شارستانیەتی نوێ بە لق‌و بەشەکانیەوە قبووڵ بکات لەوانەش بێرەوشتی‌و سووخۆری‌و دزی کردن.

لەراستیدا ئیسلام بڕێ بەهای چەسپاوی نەگۆڕی هەن، پەرەسەندنەکەی ناو ئیسلام لە لقەکانیدایە نەك دەستکاری کردنی بنەرەتەکانی، هەرگیز ناوترێت ئیسلام پێشڕەوی دەکات تا لەگەڵ سەردەم‌و پێشکەوتنی ماددیدا بگونجێت، بەڵکو کۆمەڵگەکان دەبێت لەگەڵ بنەرەتە چەسپاوەکانی بیروباوەڕو زیندوویووەوەو پابەندی ئەخلاقیدا خۆ ڕێکخەن، ئایینە مرۆییەکان و ئایدۆلۆجیاو ڕێبازەکان دەگۆڕێن تا بتوانن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ گۆڕانی نوێ‌و کەش‌و بارەکاندا، چوکە ئەو ڕێبازانە جیهانی نین، تەنها ئیسلامە کە مۆرکی جیهانیبوونی هەمیشەیی هەیە، بۆیە ڕێبازە دانراوەکان دەبێت بەرامبەر بە گۆڕان خۆیان یەکلا بکەنەوە.

بەڵام ئیسلام لە بنەرەتە رەسەنە چەسپاوەکانیدا پێ بنەمای گشتی داناوە کە هەڵدەکەن لەگەڵ گۆڕانی سەردەمان یان شوێن‌و بارودۆخەکان، بەلام ئەوەی ئیسلام ببێتە بارێکی هەڵکردوو بۆ سەلماندنی دروستی ژیارو کۆمەڵگەکان ئەوا ئەمە پەیام‌و ئامانجی ئیسلام نیە.

زانای پایەبەرز نەیسابووری دەڵێت: بزانە داخوازی ئایینداری ئەوەیە موسڵمان شتێ لە واتای قورئان‌و فەرموودە تەئویل نەکات بەجۆرێ ئەو شتانە لەکار بخات کە پێغەمبەری خوا(ﷺ)و سەلەفی صالح راڤەیان کردون.

دیارترین هەڵەی تەئویل لەوەدا خۆی دەنوێنێت کە هەوڵ دەدات بڵێت سزای دۆزەخ سزایەکی مەعنەویەو مەبەست لەمەش بۆ بڵاوبوونەوەی بێرەوشتی و تاوانە[1] تا بیری سزا رۆژی دوایی لە دڵ‌و دەروونی خەڵکیدا نەمێنێت، لەکاتێکدا بیری بوونی سزای دۆزەخ لایەنێکی گرنگی زیندوو راگرتنی ویژدان‌و بەرگرتنە بە ئارەزووبازی و خراپەویستی، بانگەواز بۆ بێرەوشتی رەهاو لێکهەڵوەشاندنی رێسا بەرزە دەروونی و جنسیەکان بووە بە ئامانجی ئایدۆلۆجیای هەندێ فەلسەفەی هاوچەرخ وەك بوونگەرایی و هاوڕێنەکانی.

ئەوانەی دەڵێن سزای رۆژی دوایی بوونی نیە بە لێزانی خۆیان کاردەکەن تا ئەو فەلسەفە وێرانکەرانە دزە بکەن تا رۆحی گەلان لەناوبەرن و بنەرەتە دەروونی و بیروباوەڕیەکانیان بشێوێنن، ئەمەش زۆر پێویستە کاری بۆ بکرێت کە ململانێیەکی جەنگی یەکلاکەرەوەی پاراستنی ئەو بنەرەتانەیە کە سەرچاوەی وزەی خەباتی گەلانن، ئەم ئاراستەیە دەبێتە

---

[1] - الدكتور محمد سعاد جلال: قرآن و سنة.

هۆی لەکارخستنی رەهای پرسی پاداشتو سزاو بەدوای ئەوەشدا ئەرکە شەرعیەکانو پابەندی کارپێکردنیان لەکاردەخات چونکە ئیتر پاداشتو سزایەك لایان نامێنێت، ئەگەر حەقیقەتی پاداشتو سزا لەسەر کردنو نەکردنی ئەرکەکان نەما ئیتر خودی حەقیقەتی ئەرکە شەرعیەکان نامێنێت، دەی ئیسلامیش جگە لەم فەرمانانەی فەرمانو رێگری پی ترە، ئەگەر وابێت هەموو ئیسلام لەکاردەکەوێت.

# باسی چوارەم

# ڕۆحگەرایی نوێ

یەکێکی تر لە بانگەوازە بازاڕ بۆ گەرمکراوەکانی صەهیۆنیەت و داگیرکەر بریتیە لە بانگەوازی ڕۆحگەرایی نوێ، کۆمەڵەکانی ئەم ڕێبازە ئسلووبی ماسۆنیەتیان گرتوەتەبەر، ئەمانە لەسەر بنەمای نهێنی و هێما دامەزراون‌وچەند پلەیەکیان هەیە کە تیایدا ئەندام ئەو پلانە دەبڕێت تا دەگاتە بەرزترین شوێن، بێگومان ئەو قسەی دەڵێت دەکرێت ڕۆحی مردوان بگەڕێتەوە بۆ ئەم جیهانەمان و قسە بکات، ئەمە بانگەشەیەکی بێ بەڵگەی زانستی یان عەقڵیە، چونکە جیهانی ڕۆح جیهانێکی غەیبیەو مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت ئەو سنوورە ببڕێت، هەرچیەکیش سەبارەت بەو جیهانە دەیزانێت ئەوەیە کە لە کتێبە دابەزیوەکاندا هاتووە، لەپێش هەموویشیانەوە قورئانی پیرۆز.

زۆرێك لە هەوادارانی ئەو کۆمەڵانە ئاستی خراپی ئەو ڕێبازەیان خستوەتەڕوو کە داهێنەرانی ئەو پیشەیە هەوڵی بۆ دەدەن‌و خەڵکی لەخشتە دبەن‌و بە شێوازی جۆراوجۆر دەچنە ناو دەروونی ئەو خەڵکەوە، ئاستی ساختەی ئەو پەیامانەشیان نیشانداوە کە تەنها کەسە سادەو ساکارەکان پێی لەخشتەدەبرێن.

ئەزموونی تەواوی کەسێکی ڕۆشنبیری ئاست بەرزمان لەبەردەمدایە کە ئەویش دکتۆر موحەممەد موحەممەد حوسەینە لە کتێبەکەیدا (ڕۆحگەرایی مەدەنی–ڕاستی و ئامانجەکانی) ئاستی ئەو ساختەیە ئاشکرا دەکات کە

دوای تێپەڕ بوون بەو تاقیکردنەوانەدا بۆی روون بوەتەوەو خوا گەورە ڕووناکی بینایی رووەو حەقیقەتی پێ بەخشیوە، ئەم کەسە رەخنەی گرتووە لە زۆر بواری بازنەکانی رۆحگەرایی نیێ(ئامادەکردنی رۆحەکان) ئیتر ئەوەی پەیوەستە بە ئسلووبی فنجان یان سەللە یان نێوەندی خەواندنی موگناتیسی، هەموو ئەوانەش لە تاریکیداو لەژێر تیشکێکی سووردا دەبێت کە ئەو کەسە ناتوانێت ئامادەبوان بە جوانی جیا بکاتەوە، هاودەم بەوەش دەنگی زەنگو چەند شێوازی تری خەڵەتاندن دێت کە ترس‌و بیم لە دەروونی کەسە سادەکاندا دروست دەکات.ئەوەش دەرکەوتووە ئەوانەی دەچنە ئەو بازنانەوە لەوانەن کە کەسانی ئازیزیان لەدەستداوەو دەیانەوێت بە پەیوەندی کردن پێیانەوە تاسەی دووریيان بشکێنن، یان ئەو کەسانەن کە کەوتوونەتە تەنگژەوەوو دەیانەوێت رۆحی کەسانێکی نزیك یان کەسایەتیە گەروەکان ببینن‌و ئامۆژگارییەکانیان ببیستن، یان ئەوانەن کە بە دوای چارەسەری نەخۆشیەکانیاندا دەگەڕێن، لەم ساڵانەی دواییدا چەندین شتی گومڕاکەر بڵاوبوونەوەوە، لەوانە دەڵێن رۆحی مردووەکان شتانێکی نووسراو دەدەنە زیندووەکان، یان دەڵێن ئەحمەد شەوقی بەردەوام لە جیهانی رۆحەوە شیعرەکانی دەنێرێت، بانگخوازانی رۆحگەرایی نوێ بە چەند دەقێکی ئاسمانی پاڵپشتی بانگەوازەکەیان دەکەن کە تەئویلی ئەو دەقانە بەپێی ئارەزووی خۆیان دەگرنەبەر یان لە واتای خۆیان دەری دەکەن، هەروەها ئەو دەقە ئەسەریانەی ە لە پێشینانەوە هاتون تەئویلیان دەکەن و دەیانکەنە بەڵگە.

ئەوانەی لە توێژینەوە رۆحیەکاندا کاردەکەن‌و تیایدا رۆچون جەخت لەوە دەکەنەوە ئەو ئەزموونانە لەسەر ئەو شێوازەی کە لە ئەورووپا و ئەمریکا پەیڕەو دەکرێت بە ناوی (Spiritualism)و تامەزرۆیان‌و

بازارگەرمکەرانی وەریدەگێڕن‌و دەیهێننە ناوچەکان، لەژێر کاریگەری چەند دەستێکی وێرانکەردایە کە هەوڵ دەدەن بیکەنە ئایینێکی نوێ تا بنەرەتەکانی کۆمەڵگە دارمێنێ‌و بە گومانننانەوە لەسەر هەموو بڕیارە ئایینی و رەوشتیەکان پشێوی لە کۆمەڵگەدا بنێتەوە، ئەم گۆوپە لقێکی ئەو بانگەوازە تۆقێنەرانەیە کە لەهەموو لاوە خەڵکی دەبات‌و جۆرەها بەرگی جیاواز لەبەر دەکات‌و لەژێر ناوی جۆراوجۆردا راستی خۆی دەشارێتەوە، وەك ناوی زانست و ئاشتی و رەحمەت یان دژایەتی کردنی ملهوڕی و ماددیگەری،[1] بەڵام پێداچوونەوەیەکی ورد بۆ بیروباوەڕی بانگخوازان‌و شوێنکەوتوانی مەرسیداری و شوێنەوارە قووڵەکانی ئەم رێبازە بۆ لەناوبردنی ئیسلام‌و یەکخواپەرستی ئاشکرا دەکات.

**یەکەم**: رێنماییەمانی رۆحگەرایی نوێ لەسەر بنەمای وەحدەتولوجود وەستاوە(خودا و جیهان یەك شتن)، هەروەها لەسەر بنەمای تەناسوخی رۆحەکان و هەتایی بوونی جیهانی ئێستامان وەستاوەو دەڵێت دنیا هەرگیز فەنا نابێت و لەناو ناچێت‌و رۆژی زیندووبونەوەو لێپێچینەوەی گشتی نیە، پەرستشە بڕیارلەسەردراوەکانیش لای ئەوان هیچ قورساییەکیان نیە، هەروەها نکووڵی ئەوە دەکەن خوا بوونی دروست کردبێت‌و بازارگەرمیش دەکەن بۆ بیری دێرینەبوونی جیهان و نکووڵی کردن لە کۆتایی جیهان‌و بوون، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە هەموو ئەو بانگەوازانە بە کۆن‌و نوێوە لەسەر ئەو بنەما سەرسوڕهێنەرە وەستاون، ئیتر بەهائی بێت یان سیۆصۆفیگەری یان دەهریە، بەڵکو بانگەوازەکانی فرۆیدی و بوونگەرایی‌و هیبیەش لەوەدا گەیشتوونەتە ئاستێك کە هیچ سنوورێکی زیاتر لەوەی

---

[1] - دکتور محمد حسين: الروحية الديثة.

نەماوەو بانگەوازیان گەیشتوەتە ئەوپەڕی قۆستنەوەی بوارەکانی زانستو ئسلووبی توێژینەوەی فەلسەفی وەك حەزێك بۆ بەدیهێنانی گەورەترین رێژەی لەخشتەبردنو هەڵخەڵەتاندن، دیارە بیری تەناسوخی رۆحەکان و هەمیشەیی بووی دنیاو نکووڵی زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوە هەمان ئەو بنەما ماسۆنیانەن کە لە شێوازێکی نوێدا دارێژراون.[١]

دیارە بیری موژدەدان بە پێغەمبەرێك یان پێشەوایەك یان رێنموونی کارێك لایەنێکی رەسەنی ئەو جۆرە بانگەوازانەیە، چونکە هەڵگرانی ئەو بیرە رێخۆشکەری بۆ دەکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجێك لە قۆناغی دواتردا، بۆیە بە وردی چاویان لەسەریەتی.

هەروەها ئەو بانگەوازانە موژدەی بیری جیهانیبوون یان بوونگەرایی دەدەن، ئەمەش نیازێکی تری بانگەوازە روخێنەرەکانو ئامانجێکی بنەرەتی ماسۆنیەتە بۆ خزمەتی صەهیۆنیەتی جیهانی.

**دووەم**: رۆحگەرایی نوێ لەسەر دژایەتی ئاینەکان دامەزراوە بەتایبەت دژایەتی کردنی ئیسلامو مەسیحیەت، لە زۆر ئاماژەیدا ئەوە دەدەکەوێت کە پەیوەندی هەیە بە جوولەکایەتی تلموودیەوە، بۆیە بانگخوازانی رۆحگەرایی بە گشتی هێرش دەکەنە سەر پیاوانی ئایینیو تۆمەتباریان دەکەن بە کەمتەرخەمی و دواکەوتەییو چەقبەستووییو شتانی تر کە مەبەست پێی لکاندنی ئەو رەخنانەیە بە خودی ئایینەکەوە، ئەمە وێڕای نکووڵی زانایانی ئایینی لەو بانگەشەی ئەو رەوتانە بۆ پەیوەندی بە رۆحەکان یان ئەوەی پێی دەڵێن چارەسەری رۆحی، لە هەمان کاتیشدا ئەو رۆحگەرایانە دەکەونە بەرزراگرتنی بتپەرستی و دەستەو ئایینە کۆنەکانو

---

[١] - محمد الغزالي: مجلة الوعي الإسلامي.

شان‌و شکۆی فیرعەونیەکان بەرز رادەگرن و ناوەکانیان دەکەنە هێما بۆ خۆیان و ئاهەنگەکانیان‌و هەڵدەدەن بە هەندێ رۆحی فیرعەونیدا وەك رۆحی رەع ئاموون رەع و هەمبوت، ناوی کۆمەڵەی هەرەمەکان دەنێن لە کۆڕو کۆمەڵیان‌و جەخت دەکەنەوە لە شوێنەواریان‌و گرنگیەکی زۆر دەدەن بەو بوارە.

**سێیەم**: رۆحگەرایی نوێ جەخت دەکاتەوە لە لەناوبردنی رەوشت‌و نکوولّی سەرپشکی‌و بڕوایان بە جەبریەت هەیە واتە مرۆڤ هیچ سەرپشك نەبێت لە کارو کرداریدا، ئەوان لە توێژینەوە رۆحیەکانیاندا هەمان ئەو رێبازە دەگرنەبەر کە توێژینەوە دەروونەیکان بۆ بەڵگەخوازی تاوان‌و پۆزش هێنانەوە بۆ تاوانبار یان شێوانی پێکهاتەی جەستەیی وەك بیانووی نەخۆش بوونی‌و گێڕانەوەی پاڵنەرەکانی بۆ گرێ دەروونییەکان گرتوویەتیە بەروەك ئەوەی بیردۆزەکەی لمبرۆزۆ ئاماژەی پێداوەو زۆربەی زانیان خراپی و نادروستی ئەو بیردۆزەیان باس کردووە، ئەوانە هەوڵ دەدەن بگەنە پاکڕاگرتنی تاوانبارو هەلگرتنی تۆڵە لەسەری، هەروەك کۆمەڵگە بانگ دەکەن بۆ راوەدوونەنانی.

جا رۆحگەراکان لە رێیەکی ترەوە هەمان ئەم مەزهەبە دەگرنەبەر و وا بیانوو دێننەوە بۆ تاوان کە بە بەرکەوتنی رۆحی ناوی دەبەن، لە هەردوو بارەکەدا تاوانبار ناچار بووە بە تاوانەکەو لای فرۆیدیەکان لەژێر پاڵنەرێکی ناوخۆییدا ئەنجامی داوەو لای رۆحگەراکان لەژێر باری پاڵنەرێکی دەرەکیدا بووە، هەردووکیشیان بنەرەتی ئەخلاقی لە بنەرەتەوە لەناودەبەن، چونکە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی دەسڕنەوە، ئەو بەرپرسیارێتیەی کە بنەرەتە بۆ پاداشت‌و سزای دینا و رۆژی دواییش، دیارە لەهەمان کاتیشدا هەموو

شەریعەتە ئاسمانیەکانو تەنانەت یاسا دانراوەکانیش دەسڕنەوە، ئەمە گەڕانەوەیە بۆ باری گومڕاکەرو شێوێنەری دین و دنیای خەڵکی.

**چوارەم**: لە مەترسیدارتین و ناراستترین بانگەوازیان ئەوەیە کە دەڵێن بەهەشت و دۆزەخ بیرۆکەی عەقڵی یان باری دەروونینو خەڵکیش بە جیاوازی ئایین و مۆرکیانەوە لەژیانی ئەودیو مەرگدا ژیانێکیان هەیە کە هەمان ژیانی سەرزەوییانە، دەرفەتی سڕینەوەی تاوانەکانیش بە مردن کۆتایی نایەت، بەم کارەیان ئەمانە گەورەترین بەربەستی بەردەم ستەمکردن لەبەردەم خەڵکدا لەناودەبەن، ئەوانە بانگەوازی ئەوە دەکەن ڕۆژی دوایی ئەو ڕاوەستانەوەی نوێیەی ئادەم بووە کە لەسەر زەویدا هەیبووە لە جیهانێکدا کە تەنها ئاشتی تیایدا دەسەڵاتدارەو ڕۆحگەرایی زاڵە بەسەریدا، ئەمەش بانگەشەیەکیانە کە ڕێخۆشکەری بۆ دەکەن.

**پێنجەم**: نکووڵی کردن لە قورئان و ئینجیل و دواتر هەوڵدان بۆ بەبەڵگەهێنانەوە بەو دوانە لەگەڵ ئەوپەڕی دەستکاری کردنیان لەپێناو لەخشتەبردنی کەسە سادەو دەروون لاوازەکان؟.

بەو پێیەی بانگەوازە ڕووخێنەرەکان لەسەر ماددیگەرایی دامەزراون بۆیە پێویستە مونتەلەقێکی تر دروست بکەن کە دەروازەیەکی هەستپێکراوی هەبێت تا بتوانن کەسە ڕوولەدینەکانو ئەو کەسانەش رابکێشن کە رقیانە لە بانگەوازە ماددیەکان، لێرەوە ڕۆحگەرایی شێوازێکی وێرانکردن دەگرێتەبەر، ئەوان خەڵکی بانگ دەکەن بۆ شتانێ کە ئسلوویی شتی نائاسایی‌و موعجیزەی تیا بێتو هێندە دەیانبەن تا دەیانگەیەننە ئەو ئامانجەی کە مەزهەبە ماددیەکان پێی دەگەن وەك نکووڵی ردنی‌سورش و پەیامە ئاسمانیەکان، وەك دیارە هەموو ئایینەکان یەك ئامانجیان هەیەو

ناکۆکی لەنێوانیاندا نیە و هەموو پێغەمبەرانیش نێوەندی نێوان خودا و خەڵك بوون و ئەو پەیامەش نابڕێتەوەو ەسانێ هەن بەردەوام ئەو کارە دەکەن، لەم سەردەمەشدا هەن، بەم قسانە دەیگەیەننە (سلفر بیرش)ی پێغەمبەریان کە بە ڕۆحی پێشڕەو یان ئادەمی نوێ ناوی دەبەن و دەڵێن دەبێتە خەلیفەی خودا لەسەر زەویداو چەند نووسین و وتەیەکی لێوەدەگێڕنەوە کە مەبەست پێی جەخت کردنەوەیە لە ئامانجە گەورەکانی مەزهەبی ڕۆحگەرایی کە لەڕێ لادانی خەڵکە لە بڕوابوون بۆ خوا بەو جۆرەی کە ئایینەکان باسیان کردووەو ئیسلامی کۆتا ئایینیش باسی کردووە، ئەو بانگەوازە ڕۆحگەراییە لەکارخستنی ئەرك‌و بەزاندنی سنوورەکانی خوداو ڕەواکردنی ئارەزووبازی‌و گومان خستنە سەر پاداشت و سزاو بەهەشت و دۆزەخ‌و ژیانی ڕۆژی دواییە، ئەو چەمك‌و واتایانە لەسەر بنەمای تەئویل وەستاون لەسەر هەمان ئەو ڕێبازەی کە هەموو بانگەوازە کۆنەکان هەیانبووەو ئامانجی لێی بازارگەرمیە بۆ ملهوڕی‌و بێڕەوشتی لەژێر پەردەی هۆشیاری دان لە ڕەوشتە بەرزەکان.

**شەشەم**: هەوڵی جیاکردنەوەی نێوان پەرستشەکان‌و ئەخلاق‌و بانگەواز کردن بۆ ئەوەی تەنها کاری چاك بەسە تا مرۆڤ لە مەلەکووتی خودا نزیك بکاتەوە، سلفربیرش ئاماژە دەدات بەو واتایەو دەڵێت: کەسێکم بدەرێ کە هیچ ئایینێکی نیەو ئەوەی نانووشتێتەوە بۆ یادی ناوی خوا، بەڵام سپاردەکار بێت‌و هەوڵ بدات خزمەت‌و دەستی هاوکاری بۆ لاواز درێژ بکات، ئەوە ئایینداری ترە لەوەی سەر بە هەر ئایینێکە.[1]

---

[1] - دەقەکە سەرچاوەکانی ئەو بانگەوازەمان بۆ دەخاتەروو کە لەسەر جیاوازی نێوان بڕوابوون بە خوا و ئەخلاق هاتووە، یان بە دەربڕینی خۆیان جیاکاری نێوان ئایین و ویژدان.

بێگومان ئەو راستیانە دەمانگەیەننە ئامانجێکی روون کە ئەویش ئەوەیە صەهیۆنیەتی جیهانی توانیویەتی بیری رۆحگەرایی نویێ لەئامێز بگرێت و بەرەو ئامانجەکانی خۆی ئاڕاستەی بکات وەك چۆن چەندین بزاڤی فیکری و سیاسیو کۆمەڵایەتی سەردەمی نوێی لەئامێز گرتووە.

بزووتنەوەی رۆحگەرایی یان ئیسبرتزم سەرەتا چەکێکی بەهێز بوو کە مەبەست پێی دژایەی ماددیگەریو بەرنگاری قەڵەمڕەوی بوو، زۆرێك لە کەسە دیارەکانی ئایینەکانو دوژمنانی بانگەوازە رووخێنەرەکان پێوەی سەرقاڵ بون وەك فەرید وەجدی و کەسانی تر گرنگیەکی زۆریان پێ داوەو بە بەشێکیان زانیوە بۆ رووخاندنی بانگەوازی ماددیگەری، بەڵام هێزە رووخێنەرەکان توانییان بزاڤی رۆحگەرایی لەخۆبگرنو ئاراستەی بکەن بۆ چەند ئامانجێکی دوورتر لە ئامانجە راستەکانی خۆی، ئیتر رۆحگەرایی وەکئایینێکی نوێی لێ هات کە موژدەی سەر زاری موژدەدەران و پەیامی بانگخوازانێ بوو کە موژدەیان دەدا بە جیهانێکی نوێ کە ئاشتیو خۆشەویستی زاڵە بەسەریدا،ئەمە هەمان ئەو رێگە بوو کە بانگەوازی سیۆصۆفیگەری و دواتریش بەهائیەت پیایدا تێپەڕ بوون.

هوایت هۆك لە رۆژنامەی عالم الروح دا جەخت لەو واتایە دەکاتەوەو دەڵێت: رۆحگەرایی ئەمڕۆ لەسەر دەستی پاسەوانانی رۆحەکان دەوترێتەوە، ئەو گەورانەی کە چاکسازی مرۆڤایەتین، ئەوانە هەمان ئەوانەن کە ماوەی سەد ساڵە بزاڤە جیاجیاکانیان دروست کرون، ئەوانە بنەرەتی سیۆصۆفیگەریو بیری نویێو زانستی نوێی مەسیحییان دامەزراند،

ـوە ڕۆحگەرایی بەتواناترە بۆ دامەزراندنی ئایینێکی نوێی فراوان بۆ هەموو جیهان.[1]

یەکێك لە بانگخوازانی ڕۆحگەرایی نوێ دەڵێت: ئەم ڕێکخراوە بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەبێتو لەڕێی خۆیدا دانشتوانی جیهانی ڕۆحی ڕێیەکی نوێی ئیانمان بۆ روون دەکەنەوەو بیرۆکەیەکی نوێی سەبارەت بە خوا و ویستی خوامان پێ دەبەخشن، ئەوان ئاشتی و دڵنیای ڕۆحی و بەختەوەری دڵو ـەروونمان بۆ دێنن، بەربەرستەکانی نێوان گەلان و تاکەکانو بیروباوەڕو ئایینەکان تێکدەشکێنن.

وەك دکتۆر عەبدە راجحی دەڵێت واتای هەموو ئەمانە ئەوەیە ڕۆحگەرایی نوێ وێنەیەکی تری جیاهنی بوونە کە هەمان ڕێبازی ماسۆنیەت دەگرێتەبەرو لەسەر هێما و نهێنیەکان وەستاوەو چەند پلەیەکی هەیە، دامەزراوە بۆ چەند ئاماجێکی تایبەت نەك بۆ سەرکەوتن، ئەمە پیلانێکی ئیسرائیلیە کە ئامانجو شێوازی روونە، هەوڵ دەدات مرۆڤ لە ئایین و نەتەوەی داماڵێتو بیخات قاڵبێکی نوێیی جیهانی بوون یان گەردوونیەوە، بۆ ئەمەش هەر جۆرە پێناوێك دەگرێتەبەر، تا ئەوەی ئایین بەکاردێنن بۆ دارماندنی ئاین، ئەوان تەئویلی سەرسوڕهێنەر دەکەن بۆ ئایەتەکانی قورئان تا بگەن بە ڕێبازی خۆیان، هەوڵ دەدەن نێوەندی ڕۆحی سەردەمی نوێ بکەنە پێغەمبەری لەسەروو هەموو پێغەمبەرانەوە، ئامانجی ڕۆحگەرایی نوێ بریتیە لە(هەر دەبێ ئاین بەدەستی شوێنکەوتوانی تێکبشکێتو هەر دەبێت نەتەوەپەرستی لەسەر دەستی نەوەکانی بێتەدی، ئەمە ڕێی بەردەم ئیسرائیلیەکانە تا سەرلەنوێ سواری ملی جیهان بن).

---

[1] - مجلة الروح: العدد ١٢٧.

بەڵام ئێمەی موسڵمان بەرامبەر هەموو ئەمانە لەسەر بنەرەتێکی پتەو دەوەستین، قورئانی پیرۆز هەڵوێستی رونمان بەرمابەر هەموو ئەو بانگەوازە پووچانە بۆ دەخاتەروو، ئەو بانگەوازانەی کە قورئان لەباسکردنی هەڵگرانی ئەو مەزهەبە ووخێنەرانەو ئایینە زیانبەخشانەی پێش ئیسلامدا باسیان دەکات، ئێمەی موسڵمان بڕوامان هەیە بە ماددەو ئەودیو ماددەو ژیانو مردنو زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوە، بڕوامان هەیە دۆزەخ حەقە وبەهەشت حەقەو لە باسی وێناکردنو هەستەکاندا نیە، موسڵمان بڕوای بەوە هەیە ئەو رۆحانەی دەڕۆن دەتوانن پەیوەندی بکەن بەم جیهانەمانەوە یان یەکێکیان لەم جیهانەماندا دەسەڵاتی هەبێت لەبەر ویستی ئامادەبوونی، ئیسلام رازی نیە تەنها رووەو رۆحگەرایی بچیت، مرۆڤ رۆحی بێ جەستە نیە، ئیسلام یەکێك لەو دوو لایەنە سەرناخات بەسەر ئەوی تردا(رۆحگەرایی، ماددەگەرایی)، بەڵکو هەردوکیان کۆدەکاتەوەو هاوسەنگ بەیەکیان دادەنێت، ئەو بانگەوازەش بۆ رۆحگەرایی نموونەیەکی بانگەوازی ماددیگەریە، هەردووکیشیان لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆڤو چەمكو واتای عەقڵی باوەڕبوو بە سروشدا ناگونجێن.ئیسلام جیا لەوانە نیزامو بانگەواز بۆ بروابوون بەخوای هەیە و بەرامبەر بە سەرکەشی ماددی یان رۆحی دەوەستێت، ئێمە دەزانین ئەو فەلسەفانە لە کەشی دوور لە بازنەی ئیسلامیدا سەریانهەڵداوە وەك پەرچەکردارێك بۆ ئەو چەمكو واتایانەی کە سەرکوتیو بەستووییان بەسەر عەقڵو جەستەدا نواندووە، ئەوانە بانگەواز بۆ رەهبانیەت و بەخواکردنی مرۆڤیان گرتوەتە بەر، هەموو ئەمانە و چەند بانگەوازی تر بیری رۆژئاواییان هاندا بۆ ململانێی نێوان میسالیەت و ماددیگەری و نێوان ئایینو فەلسەفەکان، ئەمە وایکرد هەندێ فەیلەسووف مرۆڤ بەرزراگرنو

جەستەپەرستی بگرنەبەر، هەندێکی تریش کەوتنە وەسفی ئایین وەك تلیاکی گەلان، هەندێ فەیلەسووفیش کەوتنە ئەوەی بڵێن ئەو خوایەی لەرێی ئایینیانەوە ناسیبوویان مرد، بەمجۆرە لێرەوە پەرچەکرداری ماددیگەری کە نکوولی دەکرد لە یهانی غەیب و سروش‌و ئایین‌و نکوولی کردن لە خوا ئاراستەی دووەمی لێکەوتەوە کە بانگەواز بوو بۆ رۆحگەرایی‌و جیهانەکان و گەردوونەکان، هەردووکیان تەواو زێدەڕۆن‌و هەرکامیان عەقڵێکبەرهەمی هێناون کە ئارەزووبازی زاڵە بەسەریداو بانگەوازی بیری ئازاد زاڵە بەسەریدا، کەچی ناتوانێت بگاتە شتێك، چونکە لە چوارچێوەو ئەرك‌و ئاسۆی دیاریکراوی خۆی دەردەچێت.

کۆمەڵە رۆحگەراکان‌و بانگەوازەکانی ئامادەکردنی رۆحەکان لەپێناو ئەوەدا هێنران بۆ وڵاتمان تا موسڵمانان لە ئایین‌و نەتەوایەتییان داماڵن‌و لە بیروباوەڕو بەهاکانیان دایانماڵن، بۆیە لەنێوان دوو خراپەدان کە هەردووکیان تاڵن، یان رۆحگەراییەك کە نکوڵی لە جەستەو ماددە دەکات(مرۆڤرۆحی بی ماددەیە)، یان ماددیگەریەك کە نکوولی لە هەموو شتێك دەکات‌و خودی رۆحیش بە ماددەیەکی پوخت دادەنێت، هەموو ئەمانە بە ئامانجی دەرکردنی موسڵمانانە لە بیروباوەڕو شەریعەت‌و رەوشتیان، بۆ ئەمەش بانگەوازە رووخێنەرە کۆنەکانی باتینی‌و غەنووصی‌و ئیشراق‌و تەناسوخی رۆحەکان‌و حلوول بەکاردەهێنن، دەستەواژەکان هەمان دەستەواژەن‌و ئامانجەکانیش هەمان ئامانجن، هیچ نوێگەریەك نیە بەڵکو ناوی نوێی لێ دەنرێت.

بێگومان رۆحگەرایی نوێ بزاڤێ بوو بۆ دژایەتی ماددیگەری دامەزرا، بەڵام پیلانە تلموودیەکان زوو لەکۆشیان گرت‌و بردیان بە رێی ئامانجی خۆیاندا، بێگومان زانستی رۆحی بوو بە زانستێکی ئەزموونی کە ئەوەش

لە گەورەترین ئەو لادانە هەڵانە بوون کە هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر راستییان، بێگومان پەیوەندی نێوان زیندوو و مردوان مەسەلەیەکی جێگومانە تا ئەوەی بڵێیت شتێکی تەواو مەحاڵ دەنوێنێت، هەڵەیەکی ئەو بوارە پەیوەندکردنی نێوان ئەو چەمكو واتا هاوردانەیە، قورئانی پیرۆز رێی زوڵمو ستەمی لە روانگەی رامان لە ئایەتو دەقەکانەوە روونکردوەتەوە.

# بەشی دووەم

# بانگەوازە رووخێنەرەکانی گەلان و کۆمەڵگەکان

باسی یەکەم: ئایدۆلۆجیای تلموود.

باسی دووەم: رەگەزپەرستی.

باسی سێیەم: ماددیگەری.

باسی چوارەم: عەلمانیەت.

باسی پێنجەم: جیهانی بوون.

# باسی یەکەم

# ئایدۆلۆجیای تلموود

بەردەوام مرۆڤایەتی بەرنگاری ئەو ئایدۆلۆجیایانە دەبێتەوە کە دژ بە فیترەتی مرۆی و یەکخواپەرستی و دادپەروەرینو لەناو چەند بیردۆزەو مەزهەبێکدا دەجوولێنو بە درێژایی سەردەمە جیاجیاکان بەشێوەی جیاجیا خۆیان دەخەنەڕوو، لەم سەردەمەشدا ئەو بانگەوازە رووخێنەرانەی گەلانو کۆمەڵگانە دەبینین کە بیری کۆنی پێش ئیسلامیان دادەڕێژنەوە، ئیسلامو ئایینەکانی پێش ئیسلامیش هاتن تا ساختی ئەو مەزهەبانە ئاشکرا بکەنو هۆشیاری بدەن لە مەترسیەکانی، ئەو بیرانە بەشێوەزای بریقەدار داڕێژراونو ڕێبازێکی زانستییان پێدراوەو چەند شێوازێکی نوێیان گرتوەتەبەرو لە کەشی لەباردا بیری خۆیان پێشکەش دەکەن، ئەوەش ەرێی چاپکراوی جوانو کەشخەو لەژێر ناوی لەخشتەبەردا، ئەو بانگەوازانە دژی ئایینو ئەخلاقو بەهاکانو دژایەتی ڕێسا و فەرز و سنوورەکان دەکەنو بە رزگار بوون لە بیرو ئاکاردا لەخشتەیان دەبەن، دەبینیت لە هەندێ کۆمەڵی مرۆیی و کەسایەتیدا بەو لەخشتەبرانە رازی دەبن، لێرەوە گەلان نەوە دوای نەوە دەکەونە بەر مەترسیو تەنگژەکەش قووڵتر دەبێتەوەو ئەو شوێنەوارە ترسناکانەی دەردەکەون کە مەگەر تەنها بە گەڕانەوەیەکی تری گەلان بۆ ڕێبازی خواو ڕێبازی پێغەمبەران بێنەوە سەر بار، لە مەترسیدارترین شتێ کە ئەمڕۆ مرۆڤایەتی بەرەورووی دەبێتەوە ئەو پیلانە تلموودیانەن کە لە چەند بانگەوازێکی رووخێنەردا داڕێژراون وەك ماسۆنیەت و چەند بزاڤێکی مەترسیداری وەك صەهیۆنیەتو

چەند ڕێبازێکی کاری وەك پرۆتۆکۆلاتی صەهیۆن، ئامانجیشیان لەناوبردنی ئایین‌و ڕەوشت‌و شارستانیەت‌و بەکارهێنانی هەموو پێناوو شێوازێکە بۆ سەپاندنی دەستڕۆیی صەهیۆنیەت بەسەر جیهاندا.

ئامانجی ئایدۆلۆجیای تلموود بریتیە لە دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی جیهانی سووخۆری، جوولەکە نزیکەی هەزار ساڵ پێشتر بە وردی ئامانجەکانی خۆیان لە مەنفاکەیان لە بابل داڕشتووەو پیلانێکیان داناوە تا بە تەواوەتی دەستبگرن بەسەر جیهانداو تۆڵە بکەنەوە لە نەخوێندەواران. لەو پێناوەشدا جوولەکە لاڕێیەکی زۆریان ئەنجامداوە لە تێبە پیرۆزەکانیاندا، لەو کتێبانەدا ڕەقی و کینەو خراپەی خۆیان نیشانداوەو پیسترین قسەیان داناوەو توندترین کینەی دژ بە گەلان و ئایینەکان تۆمارکردووەو بڕێك ڕێنمایی سەرشێوێن‌و بنەما کینەبەخشی‌و بەهای خراپیان تێدا داناون.

جاك ڕۆمان و ماری لۆرا لە کتێبەکەیاندا(هەرەشەی صەهیۆنی) دەڵێن: دیارترین ڕێنمایی جوولەکە بریتین لە بڕێ دەق کە دڕندەیی و ڕەگەزپەرستی‌و کینەی دژ بە هەموو جیهانیان نیشانداوە، عەقڵەکان بە درێژایی ماوەو نەوەکان بەو کینەو ڕقانە تێر کرون، ئیتر دەروونی جوولەکەیی کە لەو بانگەوازەوە پەروەردە کراوە بۆ دارستنەوەی کۆمەڵایەتی و لەوێوە ئایدۆلۆجیای ڕەگەزپەرستی و دەستگرتن بەسەر هەمواندا و ستەم و سووخۆری خۆی سەپاندووە لەبیریاندا، بێگومان ئامانجی ئایدۆلۆجیای تلموودی ئەوەیە هەموو جیهان ئەو مۆرکە وەربگرێت‌و لەناوی ڕێبازێکی ماددی سووخۆریدا تەنگی پێهەڵچنێت، ئیتر بەپێی ڕێنمایی و بەهای ئەوان بجووڵێتەوە، تا ئاستێکی زۆریش گەیشتون بەوە ئەویش بە تێرکردنی بیری ڕۆژئاوایی بە ەزهەبێکی نوێی دەروونناسی

و کۆمەلایەتی و ئەخلاق و ئابووری، دەکرێت بلێین ئایدۆلۆجیای تلموودی دوای ململانێیەکی گەورە لەگەلّ بیری ڕۆژئاوای مەسیحیدا توانی زالّ بێت بەسەر ژیاری ئەورووپی و بیری ڕۆژئاواییداو نموونە بالآکانی تلموودیەت بکاتە مۆرکی ڕۆژئاوا.

لەپێناو دامەزراندنی ڕێباز و ئایدۆلۆجیایەکدا دەبێت هێزەکان ملکەچ بکەیت بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە، چونکە ئەگەر نموونەی بالآی تلموودی بریتی بێت لە سووخۆری و دەستڕۆیی ئابووری جیهانی، ئەوا دەبێت هەموو بەربەستەکانی بەردەم ملکەچکردنی مرۆڤایەتی بۆ ئەو ئامانجە ملکەچ کرێن، لێرەوە ئایین و ئەخلاق دەبنە بەربەستی بەردەم ئەو ئامانجەو ناچار دەبێت ئایین و ئەخلاق ملکەچ بکرێن چونکە دووی هێزی حەقیقی نارەزایین بەرامبەر بەو ئامانجە، لێرەوە تلمودیەتی جوولەکەیی هولّ دەدات ئەخلاق لێکهەلّوەشێنێتو ئاسانکاری بکات بۆ ڕێگەکانی نارەزووبازیو ڕازاندنەوەی لەبەردەم خەلّکداو دارشتنەوەی ڕێبازو فەلسەفەکان، بەم پێیە دەستڕۆیی جوولەکایەتی تلموودی بەسەر ڕۆژنامەوانی و سینەما و زانکۆکان و ڕێبازە ڕۆشنبیری و پەروەردەییەکاندا پێویتە، پاشان هەموو پێناوەکانی کاریگەری عەقلّی و ڕازیکردنی هزری لەڕێی وتەی نووسراوەو بیستراوەو وێنەی بینراوەوە لەبەردەستیاندا دەبێت، بۆیە جلو بەرگ و شریتە ڤیدیۆییەکان و سەما و پێشبڕکێکانی جوانیو کتێبە سێکسیەکانو وێنە رووتەکان لەدەستی جوولەکەدا دەبن، لە هەموو جیهانیشدا برێك گۆڤاریان بلآوکردەوە تایبەت بە جەستپەرستیو بلاوکردنەوەی دەرچوون و چیرۆکی نهێنی نیشاندەرو ئاشکراکردنی ئابرووبەری و تاوانەکان لەژێر پەردەی لێکۆلّینەوەی تاوانیدا، هەموو ئەم

شێوازو ڕێبازو ڕەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتیانە هەوڵێکن بۆ نزیککردنەوەی عەقڵی مرۆیی بە ئایدۆلۆجیای تلموودی و سەرلەنوێ پێکهێنانەوەی.

پیلانی ئایدۆلۆجیای تلموودی کە نیازی هەیە دەستبگرێت بەسەر مرۆڤایەتیدا ئەوا ماسۆنیەت ئەو دەزگایە کە ڕێخۆشکەری دەکات بۆ ئەو کارە، ماسۆنیەت چۆڕاوەی بیری تلموودیە کە لە فەلسەفەیەکدا داڕێژراوە کە ئاڕاستەی ئاینو ڕەگەزە جیاجیاکان کراوە بەجۆرێك ئەو کۆمەڵە مرۆییانە بە شێوەیەکی هەنگاوبەهەنگاو بخات خزمەتی ئامانجی تلموودی- ئەمەش لەبەر چەند لەخشتەبردنو شێوەو نیازێك کە لەگەڵ عەقڵو زەوقو ویستە جیاجیاکاندا بگونجێت، لێرەوە ماسۆنیە کەوتە لەناو بدرنی دوو بنەمای گەورە: ئاینو ئەخلاق، دروشمەکەشی ئەوەبوو(بنیادنەرە ئازادەکان) کە لەپشت ئەمەوە ئامانجێکی ڕوونی هەبوو کە بنیادنانی پەیکەری سولەیمانە لە قودس، بۆیە ماسۆنیەتو هەموو کۆمەڵە نهێنیە هاوشێوەکانی ئمانج نین، بەڵکو پێناو و هۆکارن کە هێزە نهێنیەکان بەکاریان دەهێنن بۆ لەناوبردنی ئەو بەهاو بنەمایانەی کە بەردەگرن بە چاوچنۆکیەکانی جوولەکایەتی تلموودی، زۆر سەرچاوە لەسەر ئەوە کۆکن کە ماسۆنیەت کار دەکات بۆ تنگپێهەڵچنینی شارستانیەت و سڕینەوەی ئایینەکانو دارماندنی نەتەوایەتیەکانو خستنی دەوڵەتو ئیمپراتۆریەتەکانو لەناوبردنی ئەدەب و ڕەوشت، ئامانجیش دەستگرتنە بەسەر هەمو جیهاندا لەڕێی بەرتەسککردنەوەی سامانو سیاسەت و ڕۆژنامەگەری لە دەستی دەستەیەکی وولەکەداو بەکارهێنانی ئەو هێزە تایبەتیانەی ئادەمیزاد وەك پێناوی دەستی جوولەکە، ئەو پیلانو بانگەوازە ڕووخێنەرانەش هەوڵێکی بەردەوامن بۆ گۆڕینی پێکهاتەی

سیاسی و ئابووری و هزری جیهان بەجۆرێك لەگەڵ پیلانە جوولەکەییەکاندا بگونجێت.

**سووخۆری:** ئەمە بنەرەتی سەرەکی بنیادی ئایدۆلۆجیای تلموودیە، لازاری جوولەکە دەڵێت: ئەو جوولەکانەی بانكو کارگەیان هەیە و جوولەکە شاعیر و نووسەرەکانو وتاربێژانی جوولەکە، هەموویان لە چەند بیرێکی جیادا یەکن کە یەکئامانج دەگەیەنێت، جوولەکە بروای وایە یەکبوونی نێوان ئەوانە بەردەوام دەبێت تا کاتێك گیانی وێرانکارییان بمێنێت، هەرکات سامانی ئەورووپا کەوتە پەککەوتن ئەوا بانکەکانی جوولەکە پێ چەسپاو و بێ کێشە دەمێننەوە.

ئامانجەکە یاخیبوونی سەرمایەدارو بردنی هەموو سامانەکانە، لەو پێناوەشدا دەبێت هەموو هۆکارەکانی بەردەمی لەناوببرێن.

وەك کارل مارکس لە کتێبەکەیدا (مەسەلەی جوولەکە) دەڵێت سامان خوای گوێرایەڵکراوی ئیسرائیلەو لەبەردەمیدا هیچ خوایەکی تر بۆی نیە بژی، هەوڵی ئیسرائیلو صەهیۆنیەت ئەوەیە خودای جوولەکە ببێتە خودای هەموو خەڵك، یەکێك لە راستیە مێژووییە کۆمەڵایەتیەکان بریتیە لەوەی جوولەکە بوون ئەو نیزامە داراییەیان دانا کە جەمسەری رۆحی شارستانیەتی رۆژئاواییە لە هەردوو جیهانی کۆن و نوێیشدا، ئەوان بەوە قەڵەمڕەوی بالآیان هەبووە لە هەموو دەوڵەتان و گەلانی سەرمایەداریدا، ئەوان بە سیفەتی دارایی خۆیان خۆیان شاردوەتەوە تا لە دەوڵەتی ساماندا وا دەربکەون کە بتوانن بەو سامانە سامانی خەڵکی تر راکێش بکەن بۆ خۆیان، لەپێناو بەدیهێنانی ئەو ئامانجەشدا ئابووری جیهانی لەسەر بنەمای زێڕ دادەنێن چونکە جوولەکە زێڕی قۆرخ کردووە نەك

لەسەر بنەمای هێزی کارو سامانەکانی تر دایمەزرێنن، ئەوان زێڕ دەکەنە چەکی بەهێز بۆ وروژاندنی رای گشتیو تێکدانی گەنجانو زاڵبوو بەسەر ویژدان و ئاینو نەتەوەکان و سیستمی خێزاندا، بەردەوام تەنگژە ئابووریە جیهانیەکان دروست دەکەن تا هەرگیز جیهان نەحەسێتەوەو ناچار بێت پەنا بباتە بەر جوولەکە، دکتۆر خالید شلدریك وەڵامی ئەو پرسیارەی داوەتەوە بۆچی صەهیۆنیەت و جوولەکایەتی تلموودی هەڵوێستی دژایەتی ئیسلام بەتایبەت و ئایینە دابەزیوە ئاسمانیەکانی تریش بە گشتی دەگرنەبەر؟ لە وەڵامدا دەڵێت: نهێنی راستی هەمیشە لەپشت سامانەوە خۆی شاردوەتەوە، ئایینی ئیسلام بە حەرامکردنی سوو وڵاتی موسڵمانانی دوورگرتووە لە سووی نارەوا کە ئەو سوودە نارەوایە لە دەروونی بەنی ئیسرائیلدا خۆی مۆڵ داوە، ئەوان پێیان وایە حیزابی ئەورووپی دەتوانێت بیانپارێزێت بۆیە کەوتوونەتە هەوڵی دەستگرتن بەسەر سامانی موسڵماناندا،بۆیە دارایی جوولەکە مەبەستیەتی شاڵاو ببات بۆ هەموو وڵاتێکی ئیسلامو لابردنی کۆتەکان، بەڵام نەك لابردنی کۆتی دوورگرتن لە سووخۆری موسڵمانە ئاسیاییەکان و بەس، بەڵکو ئەفریقیەکانیش، بۆیە ئەوەیە ئەمڕۆ جوولەکەی کردوەتە دوژمنی موسڵمانان.

ئایا روانینی موسڵمانان جیاوازە لە روانینی ئایدۆلۆجیای تلموودی کە پەیامی خۆی بەسەر ژیاری رۆژئاواییدا سەپاندوەو ملکەچی خۆشەویستی ئارەزووەکانی کردووە تا ەرهەمی پیشەسازی بکاتە ئامانجی خۆی لەپێناو بەدیهێنانی تەواوی خۆشگوزەرانی، لەم مونتەلەقەوە ئاڵۆزی و کارەکانی بۆرصە دەرکەوتن، بەڵام شارستانیەتی ئیسلامی لەو روانگەوە رۆحیەتی خۆی وەرنەگرتووە، بەڵکو ئامانجیەتی ئوممەتێکی ئەخلاقی بێت کە حەق سەربخاتو ناهەق زەبوون بکات، لێرەوە شارستانیەتی ئیسلامی

پێویستیەکی گەورەی نیە بەوەی لەسەر حسابی بەها رەوشتی و ئاینیەکان ناوی لێنراوە خۆشگوزەرانی.

جوولەکەکان بە درێژایی مێژوو ئاڵای سووخۆرییان هەڵگرتووەو سووخۆرە جوولەکەکان لە پشت قەرزی گەلانو دەسەڵاتەکانەوە بون، سەرمایەداریش لەسەر بنەمای سووخۆری نارەوا دامەزراوە، ئاووری جیهانیش پەیوەستی سووخۆریە، پیشەی سینەماو بازرگانی کۆیلەو مەی و ماددە هۆشبەرەکانیش پەیوەستی سووخۆرین، سووخۆری کاریگەری خۆی هەیە لە جەخت کردنەوە لە برێ شمەکی دیاریکراو کە پێناوی خۆشگوزەرانی و رازاندنەوەو شتانی وان، تا ئەوەی لە جیهاندا سەدان پیشەو پیشەسازی لەپێناو لێکهەڵوەشاندا دامەزراون، دەبێت لەپشت ئەمەشەوە فەلسەفەیەك دروست بکات کە پاڵپشتی بانگەواز بۆکردنەکەی بکاتو خۆشەویستی بکات تا گەشەی قەڵەمڕەوی سووخۆری بەردەوام بێت، بەوجۆرە سووخۆری قەڵەمڕەو و کاریگەری خۆی بەسەر هەموو بەها ئایینی و رەوشتیو مرۆییەکاندا سەپاند.

یەکێك لە توێژەران دەڵێت لە روانگەی ئایدۆلۆجیای تلموودیەوە سیستمی رۆژئاوا دانراوە، هەموو سیستمەکانی رۆژئاوا کە جێ پەنجەی جوولەکە هەیە لە دانانی یان دەستکاری کردنیدا یان راڤەکردنو بڵاوکردنەوەیدا، ئەوا بۆیە دروست کراوە یان لەبەر بەرژەوەندی سەرمایەدارەکان یان لەبەر بەرژەوەندی دەستەیەکی تری خاوەن هێزو کاریگەری یان بۆ بازارگەرمی بۆ دیدێ کە دەستەیەك پێی ئارام دەبنو دەستەیەکی تر پێی بێزار دەبن، سیستمی جوولەکەیی لەسەر ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندی دەمەزراوە، ئەم ئاڵوگۆڕەش لەگەڵ چاکەو جوانیدا بگونجێت یان نا ئەوە کێشە نیە، حەق لای ئەوان ئەوەیە کە لەگەڵ قانووندا هەڵبکات

و ڕێ ببڕێت‌و دادگاکان سزایان لەسەر دانەنابێت، بەڵام ڕوانینی ئیسلام تەواو لەوە جیاوازە، لەڕوانگەی ئایدۆلۆجیای تلمودیەوە کە ڕۆژئاوای پێ دامەزراوە جوولەکە سەرپەرشتی مەڵبەندە جیهانیەکانی هێزەکان دەکات.

جوولەکە سەرپەرشتی ڕۆژنامەگەری‌و چاپخانەکان و ناوەندەکانی هەواڵ دەکات.

جوولەکە سەرپەرشتی توێژینەوەکانی زانکۆ و ڕۆشنبیری و ڕەوتە زانستیەکان‌و فەلسەفەو هونەر و شانۆ و سینەما و سیستمەکانی خوێندن دەکات.

جوولەکە سەرپەرشتی بانك‌و کۆمپانیا و بۆرصەکان دەکات. سەرپەرشتی جل‌و بەرگ و کالاکانی شەو و ماراجۆنا دەکات.

ئەوان هەوڵیانداوە دەست بگرن بەسەر کارگەکانی جل‌و بەرگ و بۆن‌و شتەکانی تری هاوشێوەیدا، بەمەش دەگەن بە دوو ئامانج: دەستگرتن بەسەر ساماندا، خراپکردنی ڕەوشت و دارماندنی ئایینەکان، چالاکی جوانکاری و جل‌و بەرگ ماوە دوای ماوە دەگۆڕێت‌و ئافرەتان خەرجییان زیاتر دەبێت‌و سامان دەچێتە گیرفانی خاوەن کارگەکانی، لە هەمان کاتدا لەڕێی شێوەکانەوە هۆکارەکانی پەستی و ڕسوایی بڵاو دەکەنەوەو تێکەڵاوی بڵاو دەبێتەوەو جیاوازیەکانی نێوان ژن و پیاو نامێنن و نەخۆشیە سێکسیەکانیش بڵاو دەبنەوەو پاداوێنی نامێنێت و خێزانیش دادەڕمێت.

ئایدۆلۆجیای تلمودی ئاڵای چەند بانگەوازی جیاوازی لەسەردەمی نوێدا هەڵگرتووە دوای ئەوەی توانی زاڵ بێت بەسەریاندا و لە هەموو جیهاندا ئەو بانگەوازانە رابگەیەنێت تا چەند ئامانجێك بێنێتە دی کە لەگەڵ

ئامانجە گشتیەکەی خۆیدا بگونجێن، لە پێشڕەوی ئەو بانگەوازانەش سیۆصۆفیگەری و رۆحگەرایی نوێ و بەهائیەتن، هەروەك چەند رێبازێکی خستەڕوو کە ئامانج لە پشت ئەوانەوە بۆ ئەوەبوو چەند چەمك و اتایەك بسەپێنێت کە پێچەوانەی راستیەکانی ناو ئەندێشەن، لەوانەش رێبازەکانی زانستی بەراوردی ئایینەکان و بانگەواز کردن بۆ رەگەزپەرستی و بەرزراگرتنی رەگەزێك بەسەر رەگەزێکی ترداو بانگەواز کردن بۆ مەزهەبی ماددیگەری و عەلمانیەت و جیاکردنەوەی ئایین لە کۆمەڵگە.

هەروەها چەندین بیردۆزەی دژبەیەکی لە مەیدانی ئابووری و سیاسەت و راڤەی ماددی بۆ مێژوو و زانستەکانی دەروونناسی و ئەخلاق و کومەڵایەتیدا خستەڕوو کە ئامانج لێی دانانی بنەرەتو ئامانجەکانی تلموود بوو لە جێی پەیڕەوی کرداری ناو کۆمەڵگەکاندا.

چی بنەما یان رێبازێکی زانستی یان فەلسەفی دەردەکەوێت لەم جیهانەدا خێرا دەبینیت لەپشتیەوە جوولەکە دەردەکەوێتو بەپێی بەرژەوەندی خۆی دەیجووڵێنێتەوە، بانگەشەی جوولەکەیی لە زۆربەی بیروباوەڕو رەوتەکاندا سەرکەوتوو بووە بۆ هێنانەدی ئامانجی خۆی، دەبینیت رۆحی هەواداری و پیاهەڵدان بۆ بەنی ئیسرائیلو بیروباوەڕیان زاڵە بەسەر هەندێ پرۆزی مەسیحیدا، چی مەزهەب و رەوتێك دەردەکەوێت کە زیان بە جوولەکە بگەیەنێت خێرا لەناوی دەبەن، هەرچیش مایەی سوود بێت بۆیان لە هەموو ناوچەکانی جیهاندا بازاڕی بۆ گەرم دەکەن، هەروەها هەر پێنووسێك بە ئامانج بێت یان نا هاریکار بێت بۆ تێکدانی خەڵك و بەرزراگرتنی جوولەکە ئەوان بازارگەرمی پێ دەدەن وەك چۆن لەگەڵ نیتشە کردیان کە هێرشی دەکردە سەر مەسیحیەت و رەوشتی مەسیحیەت، ئەو رەوشتی دابەش دەکرد بۆ دوو بەش: رەوشتی گەورەکان

وەك توندو تیژی، رەوشتی کۆیلەکان وەك رەحمەت و چاکەکاری، ئەمەش لەگەڵ رۆحیەت و مێژووی جوولەکەدا دەگونجیّو رێخۆشکەریە تا لە ئەندێشەکاندا بچەسپێت و بیکاتە پێشینەیەك بۆ نیتشە، هەروەها گرنگییان دا بە رێبازی پەرەسەندنو تەئویلاتی وایان بۆ رد کە داروین خۆی بیری نەچووبوو بۆ شتی وا، ئەوەشیان بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی ئایینو نەتەوەو هونەرەکان.

جوولەکە رێبازە نەیارەکانی یەکتریان بەکارهێناوە بۆ خزمەتی بەرژەوەندیەکانی خۆیان مادەم دواجار دەبنە هۆی لێکهەڵوەشانی جیهان و لەناوبدنی رەوشت و سیستم و ئاین و نەتەوەکانی دنیا، ئەوان بانگەوازی بۆ جیهانیبوون و نەتەوایەتی توندوتیژو لێبوردەیی ئایینیو توندوتیژی ئایینیش دەکەن، چەند کۆمەڵێکی نێودەوڵەتی خاوەن قەڵەمڕەوی جیهانییان پێکهێناون بۆ ورووژاندنی ناکۆکیەکانی نێوان دەوڵەتە دیموکراتی و شیوعیەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاواو هەرکات ئەو ناکۆکیانە کەمیان کرد نانەوەی ترسی نێوان هەردوو لا لەوی تر.

هەنگاوێکی تری تلموودیەت دژایەتی کردنی ئایینەکان و ترسانە لە ئایینەکانو رێ نەدانە بە دەرکەوتنیان لەناو هەموو گەلانی نوێی رۆژئاوادا. چونکە دەقی ئایینی رێ نادات بە وولەکە تا پایە سەرکردایەتیەکانی گەلە جیاجیاکان بگرنەدەست، بۆیە ئەوان شالاوێکی سەختیان رووەو ئایینەکان ئاراستە کردووەو بە فەلسەفەکان دژی ئایین دەوەستن تا خەریکە لای رۆژئاواییەکان بە تەواوەتی بەهای ئایین نامێنێت، ئەوان بەرامبەر بە بیری ئایینی لە رۆژئاوا برێ گومانی زۆریان ناوەتەوەو، لەوانە ئایین پێویستی دەروونی مرۆیی دابین ناکات و ویستەکانیشی ناهێنێتەدی.

بەڵام ئەم هەڵمەتە بەرنگاربوونەوەیەکی دروستی هەیە کە تەواو جیاوازە ئەگەر بەرامبەرە بە ئیسلام ئەنجامی بدات، چونکە هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە مرۆڤو زانستو کارکردن و پێکەوتنو جوانیەکانی خوا بۆ بەندەکانی هەڵوێستێکی تەواو جیاوازە لەوانی تر، ئایدۆلۆجیای جوولەکەیی هەوڵ دەدات گومانەکانی سەر بیری ئاینی رۆژئاوا بەسەر ئیسلامیشدا جێبەجێ بکات، بۆ ئەمەش دەبێت بدات لە گەورەترین بنەرەتەکانی ئیسلام، چونکە ئیسلام ئایینو نیزامی کۆمەڵگەشە، بۆیە هەوڵ دەدات ئیسلام لە کۆمەڵگە دوور بخاتەوەو ناکۆکی بخاتە نێوان ئیسلامەتی و عەرەبایەتی و لە ئابووریو یاسا و پەروەردە دوری بخاتەوە.

تلموودیەتی جوولەکەیی بەرامبەر ئەو ڕێبازە قورئانیە ئیسلامیە دەوەستێت کە خۆی دەبینێتەوە لە برایەتی مرۆییو حەنەفیەتی پاکی دوور لە رەگەزپەرستیو بەرزراگیری رەگەزی، هەروەها دژ بە هەڵوێستی قورئانوئیسلام بەرامبەر بە پێغەمبەرانو کتێبە ئاسمانیەکان دەوەستێت، چونکە ئیسلام باوەڕی هەیە بە هەموو پێغەمبەرانو کتێبە ئاسمانیە دابەزیوەکانو جیاوازی ناکات لەنێوان هیچ پێغەمبەرێکیدا لەکاتێکدا تلموودیەتی جوولەکەیی ئەوجیاوازیە دەکاتو بەجۆرێ باسی هەندێ پێغەمبەر دەکات کە چاوپۆشی لە شانو شکۆیان دەکات، پێغەمبەران ئامادەکراو بوون بۆ سەرکردایەتی مرۆیی و دوور بوون لە هەڵە، وێنەی پاڵەوانانی جولەکە لە قورئاندا وێنەیەکی ئیسلامیە، وێنەیان لە عەهدی قەدیمدا وێنەگەلێکی جولەکەییە، جیاوازی نێوان ئەو دوو وێنەیە ناکۆکیەکی زۆری لێ دەبێتەوە کە دەگاتە ئاستی نکوولیکردن، لە دیارترین

دیاردەکانیشی بریتین لە عیصمەتی ئەو پاڵەوانانە لە قورئانداو نەبوونی عیصمەتی پێغەمبەران لە عەهدی قەدیمدا.[1]

دیارترین پەیامی جوولەکەیی دژایەتی کردنی ئایینەکانە بەگشتیو ئیسلام بەتایبەی، نکوولی کردن لە زیندووبوونەوەی رۆژی دوایی کە ئەوەش مەترسیدارترین چەمكو واتایەکە کە مونتەلەقی رێبازی سووخۆری ماددی تەواوی لەسەر دادەمەزرێنن.

بەرپەرچدانەوەی بزاڤی مێژووی مرۆیی هەر لە سەردەمی پێش مەسیحەوە تا ئەمڕۆ بە درێژایی دوو هەزار ساڵ، ئەو گەشەسەندنە گەورانەی لە عەقڵو دەروونو زانستو ژیارەکاندا روویدا و نزیکردنەوەی نێوان رەگەزو رەنگو بیرەکان تا ئەوەی خەڵکی گەیاند بە سەردەمی بروابوون بە یەك مرۆڤایەتی کە هاوکاری یەکن بۆ بەدیهێنانی ئاشتی پاش ئەوەی زانست و هونەرەکانی واپڕچەکی ردبوون کە جەنگی نێوانیانی کردبوو بە جەنگە خەیاڵیەکانی خواوەندەکان کە کاولکاری لێدەکەوتەوەو هەموانی لەناودەبرد، گێڕانەوەی شارستانیە بۆ سەردەمی شاخ و ئەشکەوتەکان.

هەوڵی زانستی بەراوردی ئایینەکان گێڕانەوەی رێنماییەکانی ناو ئایینە دواییەکانە بۆ ئایینە پێشووەکان، گێڕانەوەی هەمو ئەو بەهایانەی کە لە ئایینە دابەزیوەکاندا هاتووە بۆ چەند دابو نەریتێکی کۆنی سەرەتایی، دیارە ئەو بەهایانەش پەیامی ئایینە یەکەمەکانن، دواتر بەردەوام هاتون، مرۆڤایەتیش تەنها لەو رێگەیەوە ئەو بەهایانەی ناسیوە، ئەو بەراوردە هەوڵێکە تا موسڵمان لەسەر ئایینەکەی گومانی بۆ دروست ببێت، جیهان

---

[1] - محمد خليفة التونسي: الأبطال بين القرآن و العهد القديم.

ئەگەر توانی ئایین لێکهەڵوەشێنێ و هەموو بیرەکان بگێڕێتەوە بۆ سەرچاوەی دڵی خۆی یا سەرچاوەکەش جوولەکەیی نەبێت، ئەوا توانیویەتی پیرۆزی ئایین لە دڵ و عەقڵەکاندا لەناوبەرێت، بەتایبەت لای موسڵمانان کە بڕوایان وایە قورئان سروشی خواییەو خوا دایبەزاندووە بۆ سەر موحەممەد، ئەویش بێ ئەوەی رای خۆی تێدا دابنێت گەیاندوویەتی، ئەمەش پێچەوانەی بڕوای مەسیحیەکانە سەبارەت بە سروش کە پێیان وایە ئینجیلەکان نووسراوەی خۆانن بە ئیلهامی خوایی.

دابەشکردنی مرۆڤایەتی بۆ جوولەکە کە گەلی هەڵبژاردەی خوان و(جوییم) مرۆڤەکانی تر کە جگە لەوانن، واتای جوییم بێباوەڕان و بتپەرستان و رەگەز و ئاژەڵەکان دەگەیەنێت، هەندێ جار بە وشەی ئومیەکان وەردەگێڕدرێت، قورئانی پیرۆز ئەو دابەشکارییەی باس کردووە(ذلك بأنهم قالوا ليس علينا في الأميين سبيل)، واتە ئەوان لە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کەسانی جگە لە خۆیان پەیوەستی شەریعەت نین، بۆیە پێیان رەوایە کەسی جگە لە جوولەکە بکوژن و سامانی بدزن و دەستدرێژی بکەنە سەر ئابڕوو و شەرەفی.[1]

جوولەکە بازارگەرمییان کرد بۆ بیردۆزەی پەرەسەندن و تەئویلاتی وایان بۆ کرد کە بە بیری خودی داروینیشدا نەهاتبوو، ئەوەشیان بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی ئایین و نەتەوەو یاسا و هونەرەکان، بەو واتایەی هەموو شتێك سەرەتا بە ناتەواوی دەستی پێکردووەو جێی گاڵتەو کەمنرخی بووەو دواتر پەرەی سەندووە، بۆیە هیچ پیرۆزیەك بۆ ئایین و نەتەوایەتی و یاساو هونەر نیە، هیچ پیرۆزیەك بۆ پیرۆزیەکان نیە، ئەوان زانستی

---

[1] - الرسالة، ١٩٤٨، من بحث عن أبطال اليهود بين القرآن و العهد القديم.

ئابووری و کۆمەڵایەی و بەراوردی ئایینەکانیان گرتەبەر و بۆ بەرژەوەندی خۆیان گاڵتەیان پێ دەکردن تا ئەدەبەکان و سیستم و عەقڵەکان لە هەموو جیهاندا بشێوێنن و چەند بیردۆزەیەك بخەنە ناویەوە کە خەڵکی زۆر ژێر نەبێت کەس هەست نەکات بە ساختەی ئەو بیردۆزانە، ئەوان لە پشت هەموو بەرگێکی هزر و بیروباوەڕو بەرگ و ئاکارەوەن بەتایبەت ئەگەر گەلان و خەڵکانی تر لە راستی لابدەن و گومڕایان بکەن.[1]

**عەبباس عەققاد دەڵێت:** خوێندنگە هاوچەرخەکانی ئەورووپا ئەو راستیە بێ گومانە تێگەیشتن کە پێشتر لێ تێنەدەگەیشتن، ئەویش ئەوەیە هەر دەستێکی جوولەکەی لەپشت هەر بانگەوازێکەوەیە کە بەها ئەخلاقیەکان بەکەم دەگرێت و ئامانجیەتی ئەو بنەمایانە دارمێنێت کە کۆمەڵگەی مرۆیی لە هەموو سەردەمەکاندا لەسەری دامەزراون، جا کارل مارکسی جوولەکە لەپشت ئەو شیوعیەتەوەیە کە بنەماکانی ئەخلاق و ئاینەکان دادەڕمێنێت، دۆرکایم لەپشت ئەو زانستی کۆمەڵایەتیەوەیە کە سیستمی خێزان پەیوەستی بارەدروستکراوەکان دەکات و هەوڵ دەدات شوێنەواری خێزان لە پێشخستنی چاکەو رەوشتەکاندا لەکاربخات، سارتەری جوولەکە یان نیمچە جوولەکە لەپشت ئەو بوونگەراییەوەیە کە بۆ رێزنانی تاك سەریهەڵدا کەچی بردی بەرەو ئاژەڵبوونێك کە تاك و کۆمەڵگەشی توشی دەردی بێهیوای و داکەوتن کرد، چاکە رێبازە هزریەکان بەڵکو بەرگە هزریەکان توێژینەوەیان لەسەر بکرێت هەرکات لە ئەورووپا رێبازێکی نوێ بڵاو بێتەوە، بەڵام خراپە رووکەش و پێرستەکەی بخوێنرێت بێ ئەوەی هۆکارەکانی پشتەوەی و پیلانی جێ نیازیان لەبەرچاوبگیرێت، وەك فرۆیدی

١ - الخطر اليهودي التونسي.

جوولەکە کە لەپشت ئەو زانست دەروونناسیەوە بوو کە هەموو ئارەزوو و ئەدەبە ئایینیو رەوشتیو هونەریو صۆفیگەریو خێزانیەکان دەگێڕێتەوە بۆ ئارەزووی جنسی تا پیرۆزی ئەوانە نەهێڵێتو مرۆڤ شەرمیان لێ بکات، ئیتر بەوە مرۆڤ باوەڕی بەو شتانە نامێنێت کە پێشتر بروای هەبوو پێیان و خێزانو کۆمەڵگەو بوونو ئەودیو بوونی لا دادەڕمێت، ینا نموونەیەکی ترلە زانستی بەراوردی ئایینەکاندایە کە جوولەکە هەوڵ دەدات گەشە بدات بە خوێندنو لەسەر نوسینی، بەراوردی هەندێ بوار بە بواری ترو بەراوردی نێوان دوو شتی لەیەکچوویان دەکات تا پیرۆزییان نەهێڵێتو پێغەمبەرانیش لە شێوەی دەجالەکاندا نیشان بدات، هەروەها بزووتنەوەی رۆژهەڵاتناسی کە لەسەر زیندووکردنەوەی کتێبە کۆنەکان دامەزراوە، بۆیە کتێبخانەی ئیسلامی بە کتێبی زۆر بێ بایەخ سەرقاڵ کردووە کە هیچ زانستێك نابەخشنو رەوشتێکیان لێ وەرناگیرێت و پەرەش نادەن بە عەقڵ، هەروەك بۆ ئەوە دروستکرابن تا ببنە مزەخانە بۆ پاراستنی مۆمیا بێژیانەکان کە لەبەر پەستی و سووکی ناوەڕۆکیان ەسی مۆرکو عەقڵ ساغ بەرەو ملەجیڕیو خۆبەزلزانین و سەرکەشی دەبات، هەروەها جوولەکە بازارگەرمی دەکات بۆ هەموو ئەو زانیاریە نزمانەی کە لە گۆڤارو چیرۆکو کتێبە ئارەزوو ورووژێنەرەکاندا بڵاوکراونەتەوەو لایەنە خراپەکانی ئارەزووبازی دەورووژێننو نزمی و سووکی شیرین دەکەنو لێکهەڵوەشان بڵاو دەکەنەوە.

ئەمە بیردۆزەیەکە کە پێویستی هەیە بە پێداچوونەوەیەکی فراوان با چەند بەڵگەیەکی بۆ هەبن کە راستیەکەی نیشان بدەن، ئەویش ئەوەیە دەستی تلموودی جوولەکەیی لەپشت هەموو بانگەوازێکەوەیە کە بەها رەوشتیەکان بە کەم دەگرێت، لەپشت هەموو ئەو شۆڕش و

کوودەتایانەوەیە، بەڵکو هەندێ توێژەر بزوتنەوەکانی ئیبن سەبەئو ئیبن صبان و ئیبن مەیمونی قداح و مهران و قەرمەت و بابەك و حەشاشیەکان دەگێڕنەوە بۆجووڵەکایەتی و کاریگەری جوولەکەیی.

بۆکهرت دەڵێت ئەدەبی جیهانی لەوانەیە قەرزاری هەندێ نووسەری جوولەکە بێت، بەڵام زیانیان زیاتر بووە لە سوودیان، چونکە(هینە) رەوشتی پاریسی خراپ کرد، ئەزوفالد هەرەشەی نەمانی شارستانیەتی لێکردین، فرۆید بیرەوشتی نوێی لەسەر شێوازی بتپەرستی ئیغریقی دروست کرد و ئارەزووبازی بەرزراگرت‌و دەرفەتی دا بە نێرو مێ تا چۆن دەیانەوێت هەڵسوکەوت بکەن بە جەستەیان، بۆیە داکەوتنی جنسی لە رای ئەودا هیچ سنوورێکی نیە، کوڕ دەستدرێژی بکاتە سەر دایکی‌و ئەگەر باوکی مرد شوێنی باوکی بگرێتەوە، بۆ خەوبینینیش لەشگرانی و پەیوەندی جنسی زیاتر هیچ واتایەك ناهێڵێت، تۆماس مان بیانوو دێنێتەوە بۆ عەشقی نێرەکان(چیرۆکی مەرگ لە بوندوقیە)و نەخۆشیەکانی سنگ بە ئاژەڵانی درندە وەسف دەکات،و بێهیوایی چاکبوونەوە دەکات بیانوو بۆ تەسانود.

یەکێك لە توێژەران دەڵێت دەتوانرا فەلسەفەی ئەورووپی رێی خۆ ببڕێت تا لەلایەکەوە بکاتە زانست و لەلایەکی تریشەوە بگاتە ئاین، بەڵام دەستوەردانە صەهیۆنیەکان و جوولەکە هەر لە سبینۆزا وە نەیانهێشت ئەوە رووبدات‌و فەلسەفەیان بەرەو ماددیگەری و ملهوری برد.

مەکسیم جۆرکی وا گەلی جوولەکە دەناسێنێت کە شمشێرێکی زێڕینە هەر لە سەرەتای مەسیحیەتەوە لەسەر سەری رۆژئاوا هەڵکراوە، ئەو فەلسەفانەی کە جوولەکە ئاڵاکەیان هەڵگرتون واتاکانی ژیان دەگۆڕن‌و

فیترەت دەشێوێنن، چونکە هەوڵیان داوە وا مرۆڤ وەسف بکەن کە ئاژەڵەو کوڕی کتوپڕی و صودفەیەو هیچ مەبەستێ لە بوونی نیە، لەسەر ئەو بنەمایەش هیچ واتایەك بۆ ژیانی مرۆیی و نموونەی باڵا ناهێڵن، ئیتر دەڵێن ژیان تەنها خوارد ن سێکسە، بەمەش مۆرکی ماددیگەری زاڵ دەبێت بەسەر زانستەکانی دەروونناسیو ئەخلاقو پەروەردەو هونەردا، مارکس و فرۆید و دۆرکایم(کە هەموویان جوولەکەن) هێرش دەکەنە سەر ئایین، مارکس دەڵێت ئایین تلیاکی گەلانو بڕێ ئەفسانەیە، فرۆید دەڵێت لە کەبت کردنەوە هاتووە، دۆرکایم دەڵێت ئایین فیترەت نیە.

هەوڵێکی زۆر لە ئارادایە تا بڵێن جوولەکایەتی سەرچاوەی ئایینەکانو سەری ژیارو ڕۆشنبیریەکانە، دەڵێن بنیادی هەرەمەکانو داهێنانی ئامێرەکان لەسایەی وولەکەوە بووە، مێژوویش جەخت لەوە دەکاتەوە کە جوولەکەکان لە ژیارەکاندا تەنها ڕۆڵی وێرانکارییان دیوەو یەك بزاڤی کۆمەڵایەتیشیان دروست نەکردووەو هیچ توانای ئەوەشیان نیە، بەڵام ئەوان تەنگیان هەڵچنیوە بە هەر بزووتنەوەیەك کە سەریهەڵدابێتو قۆستوویانەتەوەو بەرەو ئامانجی خۆیان بردووە، دەکرێت بڵێین هەموو فەلسەفە نوێکان وەرگێراوی فەرهەنگی فەلسەفە ڕووخێنەرە کۆنەکانن و لە سەردەمی نوێدا خراونەتە ڕوو و بەپێی ڕێکخستنێکی دیاریکراو دایانناونەتەوە بۆ دارماندنی بنەرەتەکانی گەلە ئایینی و ڕەوشتیەکان، ئەوەشیان وەسفکردووە بە فەرهەنگی کۆن و ڕێنماییە نهێنیەکانی کتێبەکانی بەرهەمیەکان و بووزی و میصریەکانو ئەوەی پەیوەستە بە جادوو و خورافەو ڕۆحەکان و پەیکەرو بتەکان، ئەمەش ئامانجێکی بنەڕەتی جوولەکەیە کە خنکاندنی جیهانە لە چەند بیرێکی نامۆ و تایبەتو چەند وشەیەك کە ئامانج دارماندنی ئایینەکانو نکووڵی کردنی

یەکخواپەرستی و گومانئانەوەیە لە زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دوایی، هەروەها ڕازیکردنی ویست و ئارەزووەکانی دەروونی کەسە سادەکان‌و بردنیان بەرەو ئامانجە دوورەکانی خۆیان.

چەمك‌و واتای ڕۆشنگەری کە پیلانە تلموودیەکان هێنایانە ناو بیری مەسیحی ڕۆژئاواییەوە گواستنەوەی بوو بۆ کۆیلایەتی پێشکەوتنی ماددی، واتە بڕوابوون بەوەی لە ژیاندا ئامانجێکی تر نیە گە لە خودی ئەم ژیانە، موحەممەد ئەسەد دەڵێت:[1] پەیکەری ئەم ئایینە کارگە گەورەکان و سینەماکان‌و تاقیگە کیمیاییەکان‌و ڕەواپێدانی سەمان، کاهینانی ئەو ئایینە بریتین لە کەسە بانکیەکان و ئەندازیاران‌و ئەستێرەکانی بواری سینەما، ئەو چەمکە هێندە فراوان دەبێت تا دەگاتە ئەوەی حساب کردن بۆ مەسەلە ڕەوشتیەکان هیچ کاریگەرییەکی هەستپێکراویان ناپێت لە بواری خۆشگوزەرانی ماددیدا، هەموو چاکەکانیش پەیوەستن بە خۆشگوزەرانی کۆمەڵگەی ماددی، ئەمە وێڕای بێزاری خۆشەویستی باوکایەتی و پاکداوێنی چونکە سوودێکی ماددی هەستپێکراو نابەخشێت بە کۆمەڵگە.

پاشان بەها بتپەرستیە یۆنانیەکان شوێنی بەها ئایینی‌و ڕەوشتیەکانیان گرتەوەو بانگەواز بۆ ئازادیەکی تاکەکەسی بۆ جەستەی مرۆییان هەڵگرت کە بەند نەبوون بە بنەماو بنەڕەتێکەوە(بیری ئازاد) کە صەهیۆنیەتی جیهانی سەرپەرشتی دەکرد و لەسەر ڕێنماییەکانی تلموود دەوەستان، دیستۆڤسکی ئاماژە دەدات بەو واتایەو دەڵێت: تەنها

[1] - الإسلام على مفترق الطرق.

جوولەکەو سامانی گەورەی جیهانن، بۆیە کەسی جوولەکەو سامانی زاڵن بەسەر هەموو شتێکی ئەورووپادا: بەسەر خوێندن‌و ژیارو هاوبەشەکیدا.

سەرچاوەکان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی بیری صەهیۆنی تلموودی بیرێکی گەمەکەرەو هەوڵ دەدات درۆو گومڕاییەکانی بخاتە ناو ڕێبازێکی زانستی بریقەدارەوە کە کەسە سادەکان هەڵخەڵەتێنێت، بەڵام کاتێ دەخرێتە ژێر تیشکی حەق و سەرچاوەکانی قورئان‌و پەیامە ئاسمانیەکان ساختەیەکی گەورە دەردەکەوێت.

چاکترین نموونەش بۆ ئەو ئاراستەیە یادەوەریەکانی هرتزل وایزمانن کە پڕن لە شێوازی فێڵ‌و هەڵخەڵەتاندن‌و هەڵەپێکردن‌و چاوچنۆکی.

## پیلانە تلموودیەکان

پیلانە تلموودیەکان کە ماسۆنیەت وەك دەستی بنەرەتی جێبەجێییان دەکات لەسەر چەند ئامانجێکی روون دامەزراون:

**یەکەم**: دژایەتی کردنی ئایینەکان بەشێوەیەکی گشتی و نانەوەی گیانی ملهوڕی‌و بێڕەوشتی لەنێوان گەلاندا، دەستەواژەکانی وا دەڵێن: نابێت ماسۆنیەت چاوبخاتە سەر گەلێك‌و جەخت لە گەلێکی تر نەکاتەوە، بۆ بەدیهێنانی ماسۆنیەتی جیهانی دەبێت دوژمنی ئەزەلیمان بنەبڕ بکەین کە ئەویش ئایینە، ئەویش بە لەناوبردنی پیاوانی ئایینی، پێش هەموو شتێك ئامانجمان لەناوبردنی هەموو ئایینەکانە.

ماسۆنیەت دروشمێکی مەترسیدار دەخاتڕوو کە ئەویش ئەوەیە هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئایینەکاندا با تەنانەت لە روانگەی ئەوانەوە

پووچیش بن، ئامانج لەناوبردنی سۆزو هەستی هەموانە بۆ ئایینی وەرگیراوو لەناوبردنی شانازی کردنی تاك بە ئایینەکەی یان بە پەیوەستی بە ئایینەکەی، هەروەك ماسۆنیەت بوەتە شوانی چەند ئایینێکی پووچی وەك مەجووسیەت و بەرهەمی و زەردەشتی.

**دووەم:** داڕووخاندنی هێزە مرۆییەکان و مەعنەویاتی گەلان‌و زەلیل کردن‌و هەولی بە کۆیلەکردنیان.

**سێیەم:** دەستگرتن بەسەر گەنجاندا لە یەکەمین ئامانجەکانی ماسۆنیەتە، لە دەستەواژەکانیاندا هاتووە: پیرو پەککەوتەکان کەنار بخەن‌و خۆتان یەکلا بکەنەوە بۆ گەنجان، بەڵکو تەنانەت یەکلاش ببنەوە بۆ منداڵان، دەبێت منداڵان پەروەردەیەکی دوور لە ئایینداری بکرێن. ماۆنیەت بۆ بەردەوامی دەسەڵات‌و قەڵەمڕەوی بەسەر نێوەندەکانی گەنجاندا پشت دەبەستێت بە دەستەو یانە وەرزشی و کۆمەڵە مۆسیقیەکان، ئازادی باوکان هەرگیز لەگەڵ بەرژەوەندی و ئامانجماندا ناگونجێت‌و پێویستە منداڵ بەپێی بەرنامەیەکی بڕیار لەسەردراو پەروەردە بکرێت، کۆمەڵە وەرزشی‌و تیمە مۆسیقیەکان‌و ئەو دامەزراوانەی تریش کە تازەپێگەیشتوان لەڕووی عەقڵی و جەستەییەوە پێدەگەیەنن سەرچاوەی باشن بۆ گەشەی ماسۆنیەت تیایاندا، ئامانجی ماسۆنیەت ئەوەیە زۆرترین دەستەی مرۆیی بە بیری خۆی تێر بکات، لە پرۆتۆکەلەکانیاندا هاتووە: ئێمە گەنجانی دەرچوومان هەڵخەڵەتاندن‌و ڕەوشتی ئەوانمان خراپ کردو هاوشێوەی ئاژەڵانمان لێ کردن‌و چالاکای ئەوانمان نەهێشت بەو جۆرەی برێ بنەماو بیردۆزەی درۆمان خستە ناو بیریانەوە، ماکس نۆردۆ دەڵێت: بانگەواز بکەن بۆ دامەزراندنی نەوەی سەرکەوتوو بە درۆ و فێڵ‌و پیلان‌و

خودگەرایی‌و بەرژەوەندویستداو هەوڵدان لەپشت ئەوەوە بەهەر رێگەیەك بگرنەبەر.

**چوارەم**: هەڵگیرساندنی شۆڕش و ئاشوب‌و بارگرژیەکان‌و بەخشینی سامانی زۆر لەپێناو ئەو ئامانجە رووخێنەرانەدا، زۆربەی سەرچاوە جوولەکەییەکان دان بەوەدا دەنێن بنیادی ئازاد واتە ماسۆنیەت گەورەترین رۆڵی هەیە لە پیلان دانان بۆ کوودەتا و شۆڕشەکان بەتایبەت شۆڕشی فەرەنسی‌و شۆڕشەکانی پورتوگال‌و ئیتالیا و وڵاتانی بەلقان.

**پێنجەم**: دروستکردنی نەوەی عەلمانی لە جیهاندا بۆ چارەسەری پرسەکان لەسەر بنەمایەکی ماددی‌و دوورخستنەوەی شوێنەوارە بیروباوەڕی و رۆحی و ئایینەیەکان لە پلانی سیاسەت و کۆمەڵایەتی.

**شەشەم**: جەختکردنەوە لەە رێباز و فەلسەفەکان، لە پیلانەکانیاندا هاتووە: لە گرنگترین هۆکارەکانی یارمەتیدانی بڵاوبوونەوەی ماسۆنیەت بە درێژایی سەدەی رابردوو بریتیە لە ئەو رێبازە ئازادانەی کە بە بەرهەمی بیری مرۆیی دادەنرێن، ئەو بیرە سەربەخۆیانەی کە لەگەڵ بیری ماسۆنیەتدا ریَ نابڕن دەکەونە بەر رەخنەی توندو دژایەتی سەخت‌و درۆبۆ هەڵبەستن لەلایەن ماسۆنیەتەوە، دیارە ئەو بیرە سەربەخۆیانە هەموو بیرێکە کە پەیوەستی سروش و بەها باڵاکانە کە ئەوەش بەخششی ئایینەکانە.

**حەوتەم**: خۆشاردنەوە لەپشت شانۆی سیاسیەوە، بنیامین ئیسرائیلی کەسایەی سیاسی ئینگلیزی لە ساڵی ١٨٤٤ دەڵێت: ئەوانەی جڵەوی سیاسەتیان لە جیهاندا بەدەستەوەیە ئەوانە نین کە بە رووکەش لەسەر دەسەلاتن، بەڵکو ئەوانەن کە لەپشت پەردەوە خۆیان شاردوەتەوە.

ناپلیۆنی سێیەمی پاشای فەرەنسا لە ساڵی ١٨٥٩ دەڵێت: پێویستە خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین، دنیا لەلایەن ڕێکخراوە نهێنییەکانەوە بەڕێوە دەچێت.

(والترتینا)ی وەزیری جوولەکەی ئەڵمانی دەڵێت: سێ سەد کەسی سیاسی کە لەنێونا خۆیاندا ناسراون کاروباری ئەورووپایان بەڕێوەدەبردو ئێستاش کاروباری هەموو دنیایان گرتوەتە دەست.

**هەشتەم**: بڵاوکردنەوەی بانگەشەی پیس بۆ ئەو بنەمایانەی بکوژی ئاینو ڕەوشتن بەناوی ڕێبازی سیاسیو کۆمەڵایەتی و ئابووری، بەجۆرێك ئەو بنەمایانە زاڵ دەبن بەسەر گیانی ڕۆحەکاندا، بانگەواز کردن بۆ ئەدەبی شەخسی دوور لە بروابوون بە زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی، ئالین دەڵێت ئەو نووسەرانەی خوێنی جوولەکە لەدەمارییاندا هاتوچۆ دەکات پێشڕەوی ئەوانەن کە بانگەواز دەکەن بۆ ئەو ڕێبازانەی دژی ئاین و ئەدەب و کۆمەڵگەن، لە پرۆتۆکۆلەکانیاندا هاتووە: بڕواننە سەرکەوتنی ڕێبازی داروینو مارکسو هەموو مەزهەبەکان، ئەمانە دروستکراوی دەستی ئێمەن، ئێوە بێئاگا نین لە کاریگەری ژەهری ئەو ڕێنماییانە لە عەقڵی کەسانی دەرچوودا.

**نۆیەم**: جەختکردنەوە لەسەر ئافرەتو بانگەواز کردن بۆ ئازادی ئافرەت و داماڵینی لە ئاینو خێزانو بردنی بەرەو شوێنەکانی سەماو ئاهەنگەکان، لە پیلانەکانیاندا هاتووە:

ئێمە زاڵ نابین بەسەر خورافەدا(مەبەستیان ئاینەکانە) مەگەر کاتێك ئافرەتان لە کاردا بەشدارمان بن، ئافرەت نێردراوی بنەما ئازادەکانی ئێمەن کە لە قەڵەمرەوی کاهینیەت ڕزگاریان دەکات، پلانی ئێمە بریتیە

لەوەی گەنجان هان بدەین تا دەسەلاتی باوکایەتی(دریدۆ) داماڵن‌و ڕق‌و کینە بخەنە نێوان منداڵ‌و باوکەوە(دالمیر)، داننان بە جوانیەکاندا ئەرکی سەرشانی کوڕاننیە بەرامبەر بە باوکانیان، دەسەلاتی باوکایەتیش بەردەوام نابێت، ئافرەتانیش چاکترین هۆکارن بۆ سەرکەوتن بەسەر ئایین و بڵاوکردنەوەی بێرەوشتی و خراپەدا.

**دەیەم:** داڕووخاندنی خێزان‌و بانگەواز کردن بۆ هاوسەرگیری کۆڵی مەدەنی تا هێزی خودایی نەمێنێ، هەروەها بانگەواز کردن بۆ بێڕەوشتی ڕەها و بڵاوکردنەوەی هەڵە لەناو تاك‌و کۆمەڵگە و ئوممەتاندا، لە پیلانەکانیاندا هاتووە: هێرش بۆ سەر گەورەی خێزان ئیشی بنەرەتیە بۆ ڕاکێشانی خەڵك بۆ لای خۆمان، پێویستە پیاو لە خێزانەکەی جیابکەینەوەو ڕەوشتی بشێوێنین و هانی بدەین بۆ ژیانی جیا و بێ ڕێسا، ڕابواردن دەرگایەکی فراوانە بۆ چەسپاندن و بە ئاسایی دانانی هاوسەرگیری مەدەنی، زیناکردن قەدەغەکراو نیە ئەگەر پیاویش ڕێ بدات ژنەکەی خۆیشی لەگەڵ پیاوی تر زینا بکات، دالمار دەڵێت: ماسۆنیەت بە بڵاوکردنەوەی هۆکاری خراپە و بێرەوشتی و ڕابواردن زیاد لە جەنگی حەفتا ساڵە زیانی گەیاند بە فەرەنسا و ژمارەیەکی زۆری پیاوی پێ لەدەستدا.

**یانزەهەم:** هێرشی بانگەوازە نیشتیمانیەکان و خەبات بۆ ڕزگاری نیشتیمانەکان و لێدانی سیستمی سەربازی، لە پیلانەکانیاندا هاتووە: نیشتیمان خەیاڵێکی پووچ‌و درۆیەکی تەواوە، ئاڵا نیشتیمانیەکان هێمای ستەم و چەوساندنەوەن‌و دەبێت بخرێنە زبڵدانەکانەوە.

**دوانزەهەم:** بانگەواز بۆ وانەوتنەوەی عەلمانی نائایینی کە دڵی گەنجان گەنیو بکات‌و پەستی و سووکییان پێ ببەخشێت، لە پیلانەکانیاندا هاتوە: بانگەواز بکەین بۆ ئەوەی خوێندنگەکان ببنە عەلمانی تۆپزی، منداڵ لە چاودێری باوکان دەربکەن، دەبێت وانەبێژی مەسیحی نەهێڵین، خوێندن گرنگی نەدات بە ئاینداری، هەموو فێرکاریەکی ئاینی بەرپەرچ بدەینەوە. خوێندنگە تازەکان کاربکەن بۆ بڵاوکردنەوەی خراپە و رابواردن و نەهێشتنی پاکداوێنی لە بیری کیژاندا.

**سیانزەهەم:** خستنەبەردەستی هۆکارەکانی بێ رەوشتی لەرێی رۆشنبیری و رۆژنامەگەریەوە، ئەوەش بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکی سێکسی و وێنەی وروژێنەر و گۆرانی ئابڕووبەر و بڵاوکردنەوەی خورافەکاری.

**چواردەهەم:** نکوڵی کردن لە بوونی خوای خولقێنەری گەورە، هێنانی ناوێکی جیا لەو ناوەی کە خوای گەورە خۆی هەڵیبژاردووە، بۆیە ناوی ئەندازیاری بوونی لێ دەنێن وەك ئەوەی خودا هەموو بوونی لە نەبوونەوە نەهێنابێت‌و تەنها رێکخەرو ئەندازیاری گەردوون بێت، هێندە لەوەشدا چون تا بە ئەندازیاری گەورە ناوی دەبەن وەکئەوەی بڵێن خوا لەو کارەیدا راوێژی کردووە بە ئەندازیارانی تر، بەڵام خۆی گەورەی ئەندازیارەکان بووە(خواش دوورە لەوەی ئەوان دەیڵێن).

**پانزەهەم:** زیندووکردنەوەی ئاین‌و بتپەرستیە کۆنەکان، رینان کە یەکێکە لە گەورە بانگخوازانی ماسۆنیەت دەڵێت: لە جیهاندا پەرستشێ نیە لەگەڵ عەقڵی ساغ‌و بنەماکانی جیهاندا هێندەی پەرستشی خۆر ردوست بێت و بگونجێت، چونکە خۆر خوای گۆی زەوی ئێمەیە، یەکێك لە فەیلەسووفە ماسۆنیەکانیش دەڵێت: ئەدۆنیرام لە رێبازی ماسۆنیەتدا

بریتیە لە ئۆزیریسی خواوەندی میصریەکان یان میترای خواوەندی فارسەکان یان باخووسی خواوەندی ڕۆمانەکان یان خواوەندێك لەو خواوەندانەی کە لە سەردەمانێ پێشوودا هەبون.

فرنندمۆر دەڵێت: هەموو بیروباوەڕێکی ئایینی بنەرەەکەی ئەودیو سروشتە-وەك خوای نەبینراو- کە ئەمەش لاوازیە لە عەقڵی مرۆڤدا.

فەیلەسووفانی ماسۆنیەت دەڵێن: دەبێت هەموو پلەبەندی ئاینەکان تێپەڕێنین‌و لە هەر بیروباوەڕێك ڕزگار بین کە بڕوای هەیە بە بوونی هەر خوایەك جا هەر چۆنێك بێت، هەیانە دەڵێت: تەنها کەسی گەمژەو نەفام بڕوای هەیە بە بوونی خوا و هەمیشەیی بوونی دەروون.

لێرەوە هەوڵی ماسۆنیەت دەبینین کە لە پەیرەوی خوێندنی ڕۆژئاواییدا جێبەجێی کردووە کە نکوولیە لە هێنانی ناوی خوا لە کتێبەکانی خوێندنی مامناوەندیدا.[1]

**شانزەهەم:** بڕوابوون بەوەی مادده بە درێژایی سەردەمان گۆڕانی بەسەردا دێت تا ئەوەی لە رەقی خۆی دەردەچێت و گژو گیای لێ بەرهەم دێت‌و لەوەشەوە ئاژەڵ دێتە بوون‌و لە ئاژەڵیشەوە مرۆڤێکی شاخاوی بیرلاواز دێتە دنیا، ئامانج لەم قسەش ئەوەیە شوێنکەوتوانیان بەوە رازی بکەن کە بڵێن هیچ شتێك نیە فەرز و واجبیان لەسەر دابنێت وەك فەرزی بنیادی مرۆیی، هەروەها پێیان بڵێن شەریعەت‌و ڕێنماییەکی دانراو بۆ هەموو مرۆڤایەتی نیە.[2]

---

[1] – مجلة الشرق، م ١٢.

[2] – لويس سنحو اليسوعي. م١٣، المشرق ص٦٧٨، ص٥٤٣.

**حەڤدەهەم:** ڕاگەیاندنی ئازادی عەقڵ بەرامبەر بە دەسەڵاتی ئایینیو سەربەخۆیی مرۆڤ دژ بە ستەمی پیاوانی ئایینی و سەربەخۆبووی خوێندنگەکان لە بوونی هەر ڕێنماییەکی ئایینی، ئەوەش رادەگەیەنن کە زانست تاکە بنەرەتی هەموو بیروباوەڕێکە، بۆی هەموو بیروباوەڕێك بەرپەرچ دەدەنەوە کە لەسەر بنەرەتی سروش وەستابێت،[1] پێیان وایە ئازادی توێژینەوە ئەوەی تێدایە رەخنە لە بیروباوەڕی ئایینی بگریت.

**هەژدەهەم:** بەخوادانان یان پەرستنی سامانو بەکارهێنانی هەموو پێناوێك بۆ بەدەستهێنانی سامان وەك بەرتیل و درۆ و توندوتیژیو فۆرخکاری.

**نۆزدەهەم:** بەکەم دانانی هەموو گەل و ئایینەکان و بە نەخوێدەوار وەسف کردنی گەلان، لە تلموودا هاتووە (نەخوێندەواران بریتین لەو گوێدرێژانەی کە خوا دروستی کردون تا گەلی هەڵبژێردراوی خۆی سوریان بین).

**بیستەم:** بلاوکردنەوەی ئەو ئەدەبیاتەی کە بێڕەوشتی نیشان دەدات، لە پرۆتۆکۆلی ١٣ دا هاتووە: لەنێو گەلاندا ئەدەبیاتێکی پیسی ناساغ بلاو دەکەینەوە کە دەروونەکان پێویستیان پێ نیە، ئەمەش هاریکارە بۆ داڕووخاندنی خێزانو دارماندنی بنەڕەتە ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگە نەیارەکانمان، ئێمە بەردەوام دەبین لە بازارگەرمی بۆ ئەوە ئەدەبیاتە، لەم ئەدەبیاتە گەنە ناساغەوە بانگەواز بۆ بێرەوشتی رەها بۆ دارماندنی خێزان هەنگاو دەنێت تا ئەخلاقی کۆمەڵگەش لەناوبەرێت.

---

[1] – السر المصون في شيعة الفرمسون.

**بیستو یەکەم:** داڕووخاندنی بیروباوەڕە ئیسلامیو مەسیحیش، هەروەها لەناوبردنی بەها رۆحی و مەعنەویەکانو گومان نانەوە لەسەر بیورباوەڕەکانو خستنەڕووی فەلسەفەکانی گومانسازی.

**بیست و دووەم:** بانگەواز بۆ جیهانی بوونو توانەوەی گەلان و دەمارگیریە ئایینی و رەگەزی و نەتەوەییەکان، لێرەوە جەخت دەکەنەوە لە نەهێشتنی دەمارگیری نەتەوەیی و ئایینیش، پێیان وایە مرۆڤ لە هەموو جیهاندا هاوڵاتیە، هەوڵ دەدەن هۆکاری ململانێی نێوان ئایین و نەتەوایەتیش دروست بکەن، نەگونجانی و دژایەتی نێوان ئیسلام و عەرەبایەتی بخەنەڕوو، لە بەرامبەردا فەلسەفەی رەگەز و خوێن و کەمینەیی بخەنەڕوو.

**بیست و سێیەم:** شکۆدار راگرتنی چێژەکانو دارشتنوەی بتپەرستی ئیغریقیو بانگەواز کردن بۆ رەهاکردنی جڵەوی ئارەزووە مرۆییەکان و رێدانی تەواو بە نێر و مێ تا بەدڵی خۆیان چی سنووربەزێنی سێکسی هەیە بیکەن، ئەمەش بابەتی نووسینەکانی فرۆیدو چیرۆکی تۆماس مانە(مەرگ لە بوندوقیە)، لە پرۆتۆکۆلاتدا هاتووە: بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتی هەموو جیهان پێویستە کەموکورتی و کەمبایەخیەکان و ئارەزووبازی زیاد بکەینو ئەو شەریعەتانەش بشێوێنین کە رێکیان خستون بەجۆرێ کەس حساب بۆ سنورەکانی نەکات.

**بیست و چوارەم:** دەستگرتن بەسەر رۆژنامەگەری و شانۆگەری و زانستدا، لە پرۆتۆکۆلەکانیاندا هاتووە: رۆژنامەگەری و شانۆگەری و شەریعە دەبێت لەژێر هەلسوکەوتی ئەوانەدا بن کە هەموو سەرزەوییان لەدەستدایە، ئەمانە بەهێزترین چەکن بۆ وروژاندنی رای گشتیو

خراپکردنی رەوشتی گەنجان‌و رادانی خەڵك بەرەو پەستی و نزمی و نەهێشتنی هەر حەزێکی خۆپاك راگرتنی مەسیحی، تا وابکەن تاك سامان و پارەو ئارەزوو بپەرستێت، لە پرۆتۆکۆلەکاندا هاتووە: پێویستە رۆژنامەگەری هیچ و پڕ درۆ بێت‌و دوور بێت لە راستی، کاری بریتی بێت لە هاندان و وروژاندنی هەستەکان بەو جۆرەی ئێمە پێوستمان پێیانە بۆ گەیشتن بە ئامنجەکانمان بەکاریان بهێنین.

**بیست و پێنجەم:** دروستکردنی بازنەیەکی داخراوی تەواو لەو رێبازی بیرکردنەوەو کارو ژیانەی کە تێکەڵی یوان مرۆڤەکان ناهێڵێت، لە پیلانەکانیاندا هاتووە: خەواریجەکان نەریتی بیرکردنەوە لە دەرەوەی بیرکردنەوەی زانستی ئێمەیان لەدسەتداوە، پێویستە هەموو پایەکانی ئیمان لەق بکەین و بیانخەین‌و بروابوون بە خوا و بە دەروون لای ئەوانە نەهێڵین، ئەوەش بەوەی‌سەرقاڵیان بکەین بە چەند یاسایەکی بیرکاری و زەروریاتی ماددی.

**بیست‌و شەشەم:** بلاوکردنەوەی مەی و شتە پەستەکان، لە پرۆتۆکۆلەکانیاندا هاتووە: خەڵی کاتێ خواردنەوە کحولیەکان دەخۆنەوە ژیری خۆیان لەدەست دەدەن‌و گەنجانیان رووەو شێتی دەچن بەوەی رۆچون لە شتی سووك و پەستی وادا کە کاربەدەستانی ئێمە فێریان دەکەن وەك مامۆستا خزمەتگوزار و دایەنگەکانمان، بەتایبەت تر ئەو ئافرەتانەمان کە دەچنە مەلهاکان، من مەبەستم بەو ئافرەتانەن کە بێرەوشتی و پەستی بلاو دەکەنەوە.

**بیست و حەوتەم:** چاوپۆشی لە توانای زانایان و کەسانی تایبەتمەند لە بیروباوەڕ و ئایینەکان، لە پرۆتۆکۆلی ١٧ دا هاتووە: گرنگیەکی زۆرمان

داوه به شکاندنی ڕێزی پیاوانی ئایینی ناو کەسانی نەخوێندەوار لەبەرچاوی خەڵکیدا، بەوەش سەرکەوتوو جەبین لە زیان گەیاندن بەو پەیامەیان کە دەکرێت بەریەستی بەردەم ڕێمان بێت، قەڵەمڕەوی پیاوانی ئایینی ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لە کزیە.

**بیست و هەشتەم:** بانگەواز بۆ ملهوڕی لەڕێی ئازادی بیروباوەڕەوە، لە پرۆتۆکۆلەکانیاندا هاتووە: نەوەی نوێمان هەڵخەڵەتاندووەو وا بیرمان تێکداوە کە بیرو ڕوانینی بەوجۆرەیە خۆمان فێرمان کردووە، پێویستە هەموو بیروباوەڕێك لەناوبەرین، لە ئەنجامی ئەمەشدا برێك ملهوڕ بەرهەم دێن، پێویستە هەموو ئایین و بیروباوەڕەکانی تر بەرتەسك بکەینەوە، دەستەواژەی ئازادیش وا لە کۆمەڵگە دەکات لە ململانێدا بێت لەگەڵ هەموو هێزەکاندا تەنانەت لالەگەڵ هێزی سروشت و خودی هێزی خوداشدا.

**بیست و نۆیەم:** بانگەواز بۆ لێکهەڵوەشان داڕووخان، لە پرۆتۆکۆلەکاندا هاتووە: دەبێت لێکهەڵوەشنان لە گەلانی ناجوولەکەدا بڵاوبکەینەوەو خراپە و بێباوەڕی بەربڵاو بێتو ئەو بنەڕەتە پتەوانەش کە بە گرنگترین بنەڕەتی گەلان دادەنرێن لاواز ببن، ئیتر بە ئاسانی دەتوانین دەست بگرین بەسەریاندا و بەوجۆرە ئاراستەیان بکەین کە خۆمان دەمانەوێت.

# باسی دووەم
# بانگەوازی رەگەزپەرستی

بانگەواز بۆ رەگەزپەرستی بەو جۆرەی کە لە مێژووی نوێدا دەیبینین. لە دیارترین هۆکارەکانی نیازی دارماندنی ئەو یەکبوونە هزریەیە کە بیروباوەڕو ئایینەکان بنیادیان ناوە، لەناو بەری ئەو هۆکارە دەروونی و رۆحیانەیە کە مرۆڤەکان کۆدەکاتەوە،بۆیە هەر لە یەکەم رۆژەوە وێنەی بەرزراگیری خوێنو رەگەزی هەڵگرت و بەرزراگرتنی رەگەزی سپی بەسەر رەگەزە رەنگ جیاکانی تردا لەو پەیامەدا خۆی حەشاردابوو، دواتر لێرەوە بانگەواز کرا بۆ ئەو ئەفسانانەی کە هەوڵ دەدەن تایبەتمەندیو بەرزی و شکۆیەکی تایبەت بدەن بە ئیسرائیلیەکان کەهەوڵ دەدەات بانگەواز بۆ جیهانی بوون بەو شێوازە بخاتەڕوو کە لە پرۆتۆکۆلاتی صەهیۆندا هاتووەو تیایدا دژایەتی نەخوێدەوراران هاتوە(مەبەست پێی جگە لە جوولەکەیە) ئەوانەی کە لە دیدی جوولەکەدا هەموو جیهان پێکدێنن.

پیلانەکانی تلموود بە وێنەی جیاجیا لەپشت بانگەوازی رەگەزپەرستیەوەن، جوولەکەش ئەنجام و شوێنەوارەکانی ئەو بانگەوازەی بۆ خۆی بردووە، وێڕای ئەوەی ئەو بانگەوازە رەگەزپەرستی جوولەکەی بێدار کردوە کە هەوڵ دەدات تایبەتمەندی جوولەکە بدات بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا، هاوکات ململانێیەکی نێوان رەگەزە سامی و ئاریەکانو نێوان رەگەزەکانی خودی ئەورووپاشی لێکەوتەوە، پرسێکی گەورەی هێنایە ئارا کە توێژەران بە دەیان هەزار لاپەڕەو سەدان کتێب شتیان لەسەر نووسی

کەچی نەگەیشتنە کۆتا، لووتکەی گەشەی ئەو بانگەوازەش لە ماوەی نێوان دو جەنگی جیهانیدا بوو کاتێ گەلە جەرمانیەکان بیروباوەڕی بەرزراگیری رەگەزییان وەرگرت و فەلسەفەی نازی لێ بەرهەم هات.

لەم بانگەوازە رەگەزپەرستیەوە چەندین رێبازی تر دەرکەوتن، لەوانە بانگەوازی نەتەوایەتی و دیدی هەرێمچێتی و بیری ناسامی بوون، چەند زانستێکی تایبەتیش دەرکەوتن کە پێشڕەویان بریتی بوو لە زانستی رەگەزە مرۆییەکان(ئەنسرۆپۆلۆجیا) یان ئەسنۆلۆجیای نوێ کە زانستێکەکەسانێ بە ئامانجی دیار دەستیان گرتووە بەسەریدا، لەوانە نیازی هێشتنەوەی ئاگری دوژمنایەتیو ینەی نێوان گەلان و تووشکردنیان بە جەنگو ململانێ، داگیرکەریش بۆ پالپشتی پێگەی خۆی ئەو ئەنجامانەی قۆستوەتەوە تا بیانووش بێت بۆ بوونی لە ناوچە داگیرکراوەکانداو جیاکاری رەگەزپەرستی کە دەولەتە داگیرکەرەکان ئالا هەلگری بوون، ئەمەش تا گومان بخەنە سەر یەکبوونی رەگەزی مرۆییو جیاکاری رەگەزی قوولێ بکەنەوەو لەسەر جیاکاری سروشتی ئەو رەگەزایەتیە دابنێن کە هەندێ رەگەز لە هەندێکی دی بە بالاتر دابنرێن و هەندێ رەگەزیش بکەنە پاشکۆی هەندێکی تر، بێگومان ئەم بیردۆزەش لە بنەرەتدا پووچ و بێ واتایەو هەموو توێژینەوەکانی توێژەرە بەویژدانەکانیش ئاماژە بەوە دەدەن کە ئەو بانگەوازانە ساختو پووچن، ئەوەیان نیشانداوە کە جیاوازی جەستەیی و رەنگ و خوێن هیچ بەهایەکیان نیە لە پێکهاتەی عەقلی و دەروونی مرۆڤدا، دیاریشە داگیرکەر پەیامی پێشڕەوی گەلانی بەدینەهێناوە، بەلکو بە پێچەوانەوە تواناکانی ئەو گەلانەی لەناوبردووەو بەخشتنەڕووی دەیان بیردۆزەو بانگەوازی وێرانکەر ئاژاوەو گرفتی ناوەتەوە.

بێگومان بیرۆکەی بەرزراگیری رەگەزی کە ژیاری رۆژئاوایی لە سەردەمی نوێدا ئالاهەلگریەتی بیرێکی کۆنەو لەپێش ئیسلامەوە دەرکەوتووەو ئەوکات ژیاری یۆنانی رۆمانی ئالاهەلگری بووە، دواتر ئیسلام هات تا ئەو بیرە تێکبشکێنێ‌و لەناوی بەرێت، بیری بەرزراگیری رەگەزی و دەسەلاتداری رەگەزێکی تایبەت دیارترین تایبەتمەندی ژیاری یۆنانی رۆمانیە، چونکە کۆمەلگەی ئیغریقی‌و دواتریش کۆمەلگەی رۆمانی لەسەر سیستمی چینایەتی وەستابوون، چینی ئازاد کە دەسەلاتداران بوون، چینی کۆیلەکان کە ئیشکەر و رەنجدەر بوون، ئەوان بە چاوی بەربەری بوون تەماشای هەموو رەگەزەکانی تریان دەکرد، هەمان بیریش لە ۆمەلگەی میصری کۆن‌و کۆمەلگەی فارسی کۆندا هەبوو، ئەوانەشسی کۆمەلگە گەورەکەی پێش ئیسلام بوون، هیرۆدۆت باسی ئەوە دەکات کە فارسەکان خۆیان بە بلاتر لە هەموو مرۆڤێکی تر دادەنا، فەیلەسووفانی ئیغریقیش بیانوو دێننەوە بۆ ئەو سیستمە کۆیلایەتیە، گەورەترین فەیلەسوفیشیان کە ئەرستۆ و ئەفلاتوونن دانیان ناوە بە راستی و چاکی بوونی کۆیلایەتیدا.

ئەرستۆ بیانووی هێناوەتەوە بۆ راستی ویستو چاوچنۆکی ئیغریقەکان بۆ دەسەلاتداری جیهان، بۆیە بانگەواز دەکات بۆ بیرۆکەیەك کە تیاید جەخت لەوە دەکاتەوە چەند کۆمەلێکی دیاریکراو بە شێوەیەکی سروشتی کەسی ئازاد دێننە دنیا، هەندێکی هەن مندالیان دەبێت تا ببنە کۆیلە.

ئەفلاتوونیش کۆمارەکەی لەسەر بنەمای دەسلاتداری گەورەکان و کۆیلایەتی کۆیلەکان داناوە، توێژینەوە زانستی‌و لێکۆلینەوە مێژووییەکان ئەوەیان خستوەتەڕوو کە هۆکارێکی دیاری رووخانی ئیمپراتۆریەی رۆمانی

لە بنەرەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دیدە ڕەگەزپەرستیە، ژمارەی کۆیلە لە ئیمپراتۆریەی ڕۆمانیدا نزیکەی پەنجا ملیۆن کۆیلە بووە.

دکتۆر ئیبراهیم علی تەرخان دەڵێت: ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ناسراوە بە دەوڵەتی کۆلە زەبوەکان بەچاوپۆشی لە ژمارەیان، بەتایبەت مێژوونووسانی وا هەن ژمارەی هاوڵاتیانی ئازاد بە نزیکەی دەهەزار کەس یان بیست هەزار هاوڵاتی دێنن، لە نەریتی ڕۆماندا ئەوە باو بووە کە هاوڵاتی ئاسایی ئازاد ئەو کەسە بووە کە نزیکەی پێنج یان دە هەزار کۆیلەی هەبووە، دەوترێت یەکێك لەوانەی ئازاد بووە، واتە کۆیلە بووەو دواتر ئازاد بووە، لە سەردەمی ئیمپراتۆر ئۆگەستس مردووەو ئەوکات ٤١١٦ کۆیلەی هەبووە، بۆیە ئەو کەسە ڕۆمانیەی کە بەلایەنی کەمەوە ٢٠٠ کۆیلەی نەبوبێت بە کەسی نائاسایی دانراوە.

ئەو سیستمە کۆیلایەتیە کاریگەری زۆری هەبوو بۆ لەناوبردنی چینی ناوەند کە پایەی هەموو پێشکەوتنێك بووە، هەروەها ڕۆڵی هەبووە لە لاوازکردنی بەرگری لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە ماوەی ئەو تەنگژە زۆرانەی کە تووشی بووە.

نموونەی ئەوەشئەوەیە کاتێك ئیریکی قووتی هات و لە سەرەتای سەدەی پێنجی زاینیدا هەڕەشەی کرد لە ئیتالیا، کۆلەکان لە ستەمی گەورەکانیان رایانکرد و ۆمەڵ بە کۆمەڵ رووەو سەربازگەی ئیریك دەچوون، چونکە ئەوان تامەزرۆی دەروازەیەك بوون لە دەرەوە، نزیکەی ٤٠ هەزاریان لە ماوەیەکی کەمدا لە دەوری ئیریکدا کۆبوونەوەو گەورەترین خزمەتیان پێشکەش کرد بەوەی ڕێو دەروازەیکانی ناوچەکەیان وت بە

ئیریك‌و شوێنی دەستکەوتیان نیشان دا بەتایبەت لە کۆتا جەنگەکانیدو بەتایبەت تر کاتێ لە ساڵی ٤١٠ زاینیدا چووە ناو شاری ڕۆما.

دکتۆر تەرخان دەڵێت: چینی ناوەند کە پایەی کارگێڕی و کۆڕی ویلایەتەکان بوو، بەڵکو دەماری ژیانی ناو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بوو. بەهۆی لاوازبوون‌و لەناوچوونیەوە بوو بە هۆکارێ بۆ ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، کاریگەری ئەوەش لەو ئەزموونەدا بوو کە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی لە کۆیلایەتیدا پێیدا تێپەڕ بوو وهەریك لە ئیمپراتۆریەتەکانی فارس و فیرعەونەکانیش پێیدا تێپەر بوون و بە ڕوونی و بەهێزی لە ڕێبازی قورئانی‌و بانگەوازی ئیسلامیدا باسکراوە کە چۆن دژایەتی ئەو سیستمی کۆیلایەتیە کراوەو ڕێبازێکی نموونەیی تر دانراوە بۆ ژیانی ڕەواو ڕێزداری نێوان ڕەگەزەکان، ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ لەناوبردنی تەواوەتی چەمك‌و واتای جیاکاری ڕەگەزی، بەڵکو سیستمێکی داناوە بۆ یەکڕیزی ڕەگەزی، بانگەواز دەکات بۆ یەکبونی مرۆیی لەنێو ڕەگەزە جیاجیاکاندا، بە ڕوونی ئەوەی خستوەتەڕوو کە هەموو مرۆڤەکان لەیەك ڕەگەزن، جیاکاریەکانی نێوانیشیان پەیوەست نیە بە ڕەنگ یان ڕەگەز یان نیشتیمانەوە، بەڵکو لە چاکەکاری زیاتردا خۆی دەنوێنێت.

پەیامی ئیسلام ئاراستەیەکی نوێی خستە بەردەم مرۆڤایەتی کە کۆمەڵگەکانی کۆیلایەتی لەناو دەبات، ڕێگەش دەکاتەوە بۆ برایەتی مرۆیی و کێشانی جوانترین وێنەی پەیامی خوایی لە بواری پەیڕەودا، بەڵام دیدی ئایدۆلۆجیای تلموودی کە لە بنەڕەتدا لەسەر ڕەگەزپەرستی وەستاوەو ئاڵای بانگەواز بۆ ڕەگەزێکی تایبەت‌و گەلێکی هەڵبژێردراوی هەڵگرتووە، خێرا بە شێوازێکی نوێ بانگەوازی خۆی دەستپێکردەوەو لە پێناو

بەدیهێنانی چەند ئامانجێکی ماوەدووردا هەناسەی خۆی کرد بەسەرژیارو بیری ڕۆژئاواییدا، لە دیارترینی ئەو ئامانجانەش بریتین لە:

١-چەسپاندنی قەڵەمڕەوی داگیرکاری لە جیهاندا کە سیستمێکە لەسەر بنەرەتی سووخۆری و سەرمایەداری و قەرزاڵی و سەرکێشیە ئابووریەکان وەستاوە.

٢-نانەوەی ململانێی نێوان رەگەزەکان و نێوان ئاری و سامیەکان و نێوان رەنگە جیاجیاکان و پێکدادانی نێوانیان.

٣-بەرزراگرتنی بانگەوازی رەگەزپەرستی کە صەهیۆنیەت بوەتە ئاڵاهەڵگری و هەوڵ دەدات لەو رێیەوە فەلەستین بکاتە خاکی خۆی.

بۆیە پیلانە تلموودیەکان لەپشت ئەم جەنگە زەبەلاحەوەن کە زاڵبووە بەسەر ئەورووپادا و دواتریش لەژێ ناوی جۆراوجۆردا لەوێوە گوازراوەتەوە بۆ هەموو رۆژئاوا، لەو ناوانەش بریتیە لە رەگەزپەرستی و رەگەزەکان و نەتەوایەتی و کەمینەکان و هەرێمچێتی و چەندین ناوی تر.

بێگومان ئایینە دابەزیوە ئاسمانیەکان واتایەکی بنەڕەتییان خستوەتەڕوو سەبارەت بە یەکبوونو برایەتی مرۆیی، ئەمەش لەو بنەرەتانەیە کە پەیامی مووسا پێغەمبەر بۆ بەنی ئیسرائیل لەخۆی گرتبوو.

بەڵام خێرا جوولەکە ئەو رێبازە رەسەنەیان گۆڕی کە تەورات باسی کردبوو و بیری بەرزراگیری رەگەزییان بە ناوی گەلی هەڵبژاردەی خواوە گرتەبەرو لە پێناو دانانی ئەو بیرەشدا دیارترین پەیامەکانی ئایینی دابەزیویان دەستکاری کرد، بەوجۆرە رەگەزپەرستیەکی تایبەتیان دامەزراند کە مۆرکی سەربەخۆیی و جیاکاری لە کۆمەڵگەکانی دی لەخۆدەگرت، ئەو بیرە بەرزراگرتنی رەگەزی جوولەکەییو بەکەم دانانی هەموو مرۆڤەکانی

تری لەخۆدەگرت تا ئاستێك کە بە کەسانی جگە لە جوولەکەیان دەوت جوییم یان نەخوێندەورا، دواتر ڕێنماییەکانی سەید مەسیح هاتن کە لە دیارترین خاڵەکانی بریتی بوو لە تێکشکاندنی ڕەگەزپەرستیو گەڕانەوە بۆ ئەو پەیامە خوییە ڕەسەنەی کە لەسەر یەکبوونی مرۆیی و یەکبوونی ئایینەکان دامەزرابوو.

ڕەگەزپەرستی ژیاری یۆنانی و ڕۆمانیش ڕووەو پەیامی تلموودی دەچوو. چونکە بە دانانی ڕەگەزپەرستی خۆی وەك سەرکەشێك سەپاندبوو، بەڵام ئەورووپا دوای مەسیحیەت خێرا بانگەوازی ڕەگەزپەرستی وەرگرت و لەوەشدا تا ماوەیەکی دوورودرێژ ڕێی بڕی.

تۆماس لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە ڕەگەزەکان ئامارە دەداتبەو دیاردەیە کە بە ڕوونی لە عەهدی قەدیمدا دەردەکەوێت و دەڵێت: لە عەهدی قەدیمدا ئەو بیرو بڕوایە دەبینین کە جیاوازیە جەستەیی و عەقڵیەکانی نێوان تاك و کۆمەڵگەکان بە یەکسانی دەگەڕێنەوە بۆ باری لەدایکبوونو شتانێکی میراتی نەگۆڕنو ملکەچی کۆمەڵانێکە بۆ کۆمەڵانێکی تر، نموونەی ئەوەش مەلعوونی کەنعان: کۆیلەی کۆیلەکان بۆ براکانی دەبێت، ئەمەش هاودەم بە جۆرێك لە بەرزڕاگیری کە لە خۆی گرتووەو پێی وایە یەهوەه لەگەڵ ئیبراهیم و وەچەکانیدا ڕێککەوتنو پەیمانێکی بەستووە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو بیردۆزە بەرزڕاگیریەی کە دەبرێتەوە بۆ ڕەگەز یەکێکە لەو بیردۆزانەی کە ئایدۆلۆجیای تلموودی جەختی لێ کردوەتەوەو چاوچنۆکی داگیرکاری هاندەری بووە تا بەرامبەر ئەو بیرە ڕەسەنە بوەستێتەوە کە بیری یەکبونی ڕەگەزی مرۆییە،

بیردۆزەی وەچە سپیەکان و بەرزی ئەوان کە بەو هۆەوە داگیرکاری روویدا فێڵێ بوو بۆ بیانووهێنانەوە بە مافێکی نوێی شاڵاو و دەستگرتن بەسەر خاکی سەرزەویدا لەلایەن رەگەزی سپیەوە.

ژیاری رۆژئاوای داگیرکەریش هەمان هەنگاوی پێشووی ژیاری یۆنانی رۆمانی گرتەبەرو نووسەر و سیاسەتمەدارانیشی بیانوویان دەهێنایەوە بۆ کۆیلایەتی لەسەر بنەمای بیردۆزەکەی ئەرستۆ کە ئەو رەواییەی بەخشیوە، ژمارەیەك لە بیریارانیش ساختەو درۆی ئەو بیردۆزانەیان ئاشکرا کردون‌و بەرگرییان کردووە لە یەکبوونی مرۆیی و یەکسانی گەلان لە جێماوە سروشتیەکاندا، بەڵام پیاوانی بیری تلموودی لەپشت دژایەتی بیری یەکبوونی رەگەزیەوە وەستان و سووربوون لەسەر هەڵگیرساندنی جەنگی دامرکاوو سەرلەنوێ ورووژاندنی ئەو بانگەشەیە.

ئەو توێژەرە بەویژدانانە وەك دی لاس کازاس و جوان کومتش توانییان ئەوە بلێن کە هیچ بنەڕەتێکی زانستی نیە بۆ ریزبەندی رەگەزی بەپێی بەرزی و نزمی ئاستیان،جیاکاری رەگەزیش بە ئەفسانەکانیشیەوە پێناوێکە بۆ بەدیهێنانی قوربانی کاتی هەڕەشەکان، بە کورتی جوولەکەو ئیغریق یەکەمین بانگخوازانی رەگەزپەرستین، جا جوولەکە خۆیان بە گەلێکی هەڵبژاردە دەزانن و ئیغریقیش دەڵێن رۆما کەسانی گەورە و خانەدانن و ئەوانەی دەوریان کۆیلەن، ژیاری رۆژئاواییش لەسەر ئەو پەیام و چەمکانە رێی خۆی بڕیوە.

رەگەزپەرستی لە بواری داگیرکاریدا بەکارهات و سەرەتا بەناوی رەگەزەکانەوە عەرەب و موسڵمانانی تر جیاکرانەوە، دواتر بەناوی نیشتیمان‌و هەرێمچێتیەوە هەموو ئەوانەش دابەش کران.

بێگومان ئەم لەرزە و تەنگژەی دەرکەوت بیردۆزەی رەگەزپەرستی لە جیهانی ئیسلامیدا خستەڕوو تا بتوانێت پەیوەندی نێوان موسڵمانان نەهێڵێت، مەیدانی خوێندن و سیستمە سیاسیەکان کاریگەری زۆریان هەبوو لە بەرزراگیربی هەرێمچێتیو نەتەوەپەرستی بەرتەسکدا، ئیتر نەتەوایەتی و هەرێمچێتی خرانەروو بەرامبەر بە بیری یەکبوون، ئەمەش هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ پچڕاندنی پەتی پەیوەستی.

لەو مەیدانەشدا چەندین بانگەوازی رەگەزپەرستی و هەرێمچێتی جیاجیا دەرکەوتن، لەوانە بانگەوازی فینیقی لە لوبنان و ئاشووری و کلدانی لە عێراق و فیرعەونی لە میصر و بەربەری لە مەغریب و زەنجی لە ئەفریقیا. بەڵام بانگەوازی رگەزپەرستی لە جیهانی ئیسلامیدا پێشڕەویەکی گەورەی بەخۆوە نەدی، چونکە بەرامبەر بە پەیامی برایەتی مرۆیی و یەکبوونی رەگەزی مرۆیی ببویەوە کە ئیسلام باسی لێوە دەکات.

لە جیهانی ئیسلامیدا پەیامی رەگەزپەرستی واتە گەڕانەوەی مێژوویی بۆ سەردەمی پێش ئیسلام، ئێمە ئاگادارین چۆن بانگەوازی رەگەزپەرستی توانی دەوڵەتی عوسمانی پەرت و پارچەپارچە بکات.

**ئارنۆڵد تویینبی دەڵێت:** کوژاندنەوەی رەگەزپەرستی نێوان موسڵمان بە یەکێك لە گەورەترین دەستکەوتە ئەخلاقیەکانی ناو ئیسلام دادەنرێت، لە جیهانی هاوچەرخدا تەواو پێویستمان هەیە بە بڵاوکردنەوەی ئەو رەوشتبەرزیە ئیسلامیە، لەگەڵ ئەوەی مێژوو وادەردەکەوێت کە هەستی رەگەزپەرستی بنەرەتێکی گشتی نەبووە، بەڵکو بارێکی نامۆ و دەگمەنی ناو سروشتی پەیوەندیەکانی نێوان رەگەزە مرۆییە جیاجیاکان بووە، چونکە خراپیەکی باری ئێستا ئەوەیە ئەو هەستی رەگەزپەرستیە بە

سەختی لەناو گەلە بەهێزەکاندا دەرکەوتووە، ئەو گەلانەی کە با بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت توانیویانە لە میراتی سەرزەویدا بەهۆی ململانێی نێوان دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان لەم چوار سەدەی دواییدا پشکی شێر بۆ خۆیان بپچڕن.

بانگخوازانی ڕەگەزپەرستی لەزیادبووندان، ئەگەر ڕێ بدرێت ئەو بزاڤەشیان زاڵ بێت ئەوا کارەساتێکی گەورە ڕوودەدات، دەبێت چارەسەری ئەم کێشەش بە ئیسلام بێت کە ئاقاری ڕێ بەرەو لێبوردەیی و ئاشتەوایی دەبات.

ئیسلام هاتووە تا کاروباری مرۆڤایەتی یەکلا بکاتەوە، جەختی کردوەتەوە لە یەکبوونی ڕەگەزی مرۆیی، شانازی و خۆنواندن بە ڕەگەز و ڕەچەڵەکی حەرام کردووە، پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد (ﷺ) بە دەربڕینێکی یەکلاکەرەوە جەختی لەوە کردوەتەوە(ن الله قد أذهب عنكم نخوة الجاهلية و فخرها بالآباء-كلكم لآدم و آدم من تراب، ليس لعربي على عجمي فضل إلا بالتقوى)

ئوممەتی ئیسلامیش وەك بەدیلی سیستمی خێڵایەتی دامەزراوەو پەیوەندی بیروباوەڕ و هزر و یەکخواپەرستی قورئانی باڵاتر داناوە، کۆمەڵگەی ئیسلامی چەندین ڕەگەزی جیاجیای تێدایە، فارسی و ڕۆمی و حەبەشی و عەرەبی، هەموو یەك ئوممەتن ، پێغەمبەری ئیسلامیش ئەو ڕەگەزپەرستیەی نەهێشتووە کە خەڵکی پێ وابێت لە دایك و باوکەوە

عەرەبە، بەڵکو هەرکەس بە عەرەبی قسە بکات ئەوە عەرەبە،[1] ئیسلام بە تەواوەتی نکوولّی کردووە لە رەگەزپەرستی و تەنها پێوەری بە چاکەکردن داناوە نەك بەپێی رەگەز، بۆیە پەیوەست بە یەکبوونی هزری کردوە. ئیسلام ئەم شتانەی نەبووە کە ئێستا دەوترێت فارابی تورك بووە و غەزالی فارس بووە، بەڵکو ئیسلام ئەم جیاکاریەی قبووڵ نەبووە و یەبکوونی رەگەزەکانی داناوە کە یاوازی خوێن و دەماری لەکارخستووە، بۆیە هەر لە یەکەم رۆژەوە ئەو بیرە هەبووە کە باوەڕداران برای یەکترن و هەرکەسیش لە ئیمان دەرچوو ئەوە کەسی تۆ نیە.

موسڵمانان لە ناوچە جیاجیاکانەوە تێکەڵ بوون و ژن و ژنخوازییان کرد و یەکبوونێکی تواویان پێکهێنا، ئیسلامیش جەخت دەکاتەوە لەو یەکبووە مرۆییەو نیشانی دەدات هیچ گەورەییەك لەنێوان مرۆڤەکاندا نیە تەنها بە تەقوا و کاری چاکە نەبێت، ئیسلام هیچ کات دان نانێت بە جیاوازی مرۆڤەکان لەسەر بنەمای رەنگ و رەگەز.

دەی ئەگەر ئەمە هەڵوێستی ئیسلام بێت بەرامبەر بە رەگەزپەرستی. ئەی ئەنجامی مێژوویی بۆ ئەم پەیامە ئیسلامیە چی بووە؟

---

[1] - ئەم مەسەلە قسەی زۆری لەسەرەو چەندین فەرمووده دانراون کە هیچ بەڵگەیەکی صەحیح بوونیان نیە، وەك ئەم فەرموودەی سەرەوە نووسەر ئاماژەی پێداوە (من تكلم بالعربيه فهو عربي) شێخی ئەلبانی بە تەواو لاوازی داناوە واتە کاری پێ ناکرێت و وەرگیراو نیە، بڕوانە(سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة، الرقم ٩٢٦)، هەروەها وەك لە فەرموودەیەکدا کە ئەبوو نوعەیی ئەصبەهانی هێناویەتی هاتووە(من دخل في هذا الدين فهو عربي)، (هەر کەس بێتە ناو ئەم ئایینەوە ئەوە عەرەبە)، شێخی ئەلبانی لە حوکمی ئەم فەرموودەدا دەڵێت تەواو لاوازە، واتە کاری پێ ناکرێت و وەرناگیرێت. بڕوانە (سلسلة الأحاديث الضعيفة، الرقم ٢٠٥٢). وەرگێڕ.

مامۆستا عەبدولحەمید عیبادی دەڵێت: بێگومان نزیککردنەوەی ڕەگەزی لە ئیسلامدا و تێکەڵکردنی نێوانیان وەك تێکەڵبوون و هاوسەرگیری فارس و عەرەب ورۆمی و صەقلی و چینی وهیندی، لەمانەوە نەوەیەکی نوێ دەرکەوتن کە لەڕێی بۆماوەییەوە پاشخانی تێکەڵی ڕەگەزییان هەبووە، دەوڵەتی ئیسلامی وەك یەك نیشتیمان بۆ یەك ئوممەت بووە نەك بۆ چەند گەلێکی جیاواز کە یەك ئایینیان هەبووبێتو زمانیشیان یەك زمان بووبێت.

بێگومان ئەو یەکبوونە نهێنی ئەو ڕاپەڕینە زانستیەیە کە هەموو لایەنەکانی بیرکردنەوەی مرۆیی گرتەوە هەر لە فیهو فەرموودە و زمان و ئەدەب و فەلسەفەو پزیشکی و بیرکاری‌و مێژوو و جوگرافیا، ئەوەش یەکێکە لەو ڕاپەڕینە زانستیە گەورانەی کە لە مێژووی شارستانیەتدا هەبووە، بەڵکو ژیارو زانستە ئیسلامیەکان بەو یەکبوونەی گەلانی ئیسلامی گەیشتە ئەو ئاستە بەرزە، دڵسۆزی گەلانی ناعەرەب بۆ ئایینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی سەرخەری ئەو ژیارە بوو.

بیردۆزەی ڕەگەزپەرستی کەسانێکی بۆ هەبوو تا ساختەو ناراستیەکانی ئاشکرا بکەن‌و هەڵەکانی نیشان بدەن و ئامانجە وێرانکەرەکانی بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە، جەخت لەوە دەکەنەوە وەچەی پوختی مرۆیی نیە، دانیشتوانی ئەورووپاش فرە بنەڕەتن تا ئاستێك هەڵدانیان بۆ ژماردن و ڕیزبەندییان بوو بە شتێکی تەواو مەحاڵ.

زانایان جەخت لەوە دەکەنەوە بەربەستی وەهمی نێوان مرۆڤی سپی پێست و کەسانی تر هیچ بنەڕەتێکی زانستی نیە، هەروەك توێژینەوە لە

دیاردە کۆمەڵایەتیەکان لەرێی قەبارەی سەر و جومگەو ڕەنگ و خوێنو جۆری قژەوە هەڵەیە.

دیارە ئەوانەی دەڵێن تێکەڵی ڕەگەزەکان هەرەشەیە بۆ داڕمانی مرۆڤایەتی بریتیە لە بانگەوازی کەسانێ کە هاواری ڕەگەزپەرستی دەکەن- ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی زانستی بۆ نیە، چونکە چالاکی تێکەڵی نێوان ڕەگەزەکان هەر لە سەرەتای ژیانی مرۆیی لەسەر گۆی زەوی چالاکیەکی بەردەوام بووە، چالاکی کۆچکردنیش هەر لە کۆنەوە هەبووە.

بێگومان کۆچکردن هەوڵ دەدات بەشێوەیەکی سروشتی کۆمەڵگەکان تێکەڵ بکات، چونکە تێکەڵی و بڵاوبوونەوە هۆکارن بۆ دارماندنی کەنارگیری نێوان ڕەگەزەکانو هێنانەدی چەند کۆمەڵێکی نوێ یان چەند کۆمەڵێك کە سیفەتی دوو یان چەند ڕەگەزێکیان هەڵگرتووە، توێژەرە بەویژدانەکانیش ئەوەیان ڕاگەیاندووە ئەو بیرەی پاکێتی ڕەگەزیەی کە هەندێ دەمارگیری ئەورووپ لە پاش جەنگی جیهانی دووەمەوە باسی دەکەن قبوولکردنی زۆر سەختە، چونکە تێکەڵی و هاوسەرگیری لە کۆمەڵێکەوە نایەتەدی کە خوێنی خۆیان بە خاوێن بزانن و تێکەڵییان پێ ڕەوا نەبێت، نەبوونی یەکسانی ماف نێوان ڕەگەزە جیاجیاکانیش ناگەڕێتەوە بۆ ڕەنگی دەموچاو، جیاوازی عەقڵی و دەروونی تەنها ئەنجامی باری جیاجیای کەشو هەوایە، بۆیە دەردەکەوێت بیری ڕەگەزپەرستی ئارەزوو و ویستی بانگخوازانی جیاکاری و ڕگەزپەرستی تاکەکەسیە، بانگخوازانی ڕەگەزپەرستی چەندین ڕێبازی جیاجیایان داناوە لەپێناو جیاکاری نێوان ئاستەکانی عەقڵی ڕەگەزەکان.

بەڵام ئەو توێژینەوانەی خوێندکارانی خوێندنگەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەنجامیان داوە ئەوەیان سەلماندووە کە ئاستی عەقڵی خوێندارانی زەنجی ویلایەتە یەکگرتووەکان زیاترە لەوانەی هاوئاستەکانیان لە ویلایەتەکانی باشوور، ئەوەش دەرکەوتووە مەسەلەکە مەسەلەی رەگەز نیە، بەڵکو مەسەلەی کەش‌و دەرفەتی جیا و ئاستی رۆشنبیریە، ئەو قسەش هەڵە دەرچوو کە دەڵێت بۆماوەیی بیۆلۆجی تاکە جیاکەرەوەی گرنگە، بەڵکو بۆماوەیی عەقڵیش هەیە، بێگومان ئەوانەی لە ژیاندا شکست خواردوون ئەو کەسانەی ناو هەر گەل و رەگەزێکن کە داڕماون، هەروەك توێژینەوەکان ئەوەشیان نیشانداوە هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێون ژیارێکی دیاریکراو و پێکهاتەی رەگەزی وەچەیەکدا، پەیوەندی نیە لەنێوان ئەوەی پێی دەوترێت وەچەی ئاری یان رەگەزی نۆردی و نێوان ژیارە رۆژئاواییەکاندا، هەروەك دەرکەوت ئەو بانگەوازەی دەڵێت جەرمانەکان ژیارسازن بانگەوازێکی درۆیە.

جا ئەو ژیارە ۆنانەی لە دەوری حەوزی دەریای ناوەڕاست لە دەوروبەری هەزارەی سێیەمی پێش زایینیدا دەرکەوتن، لە وڵاتێکدا بوون کە دانیشتوانەکەی تێکەڵەی رەگەزە جیاجیاکان بوون نەك یەك رەگەزی بن، هەروەك گەلان لە گەشەسەندنی ژیاریدا بەپێی جیاوازی وەچە و خوێن جیاواز بون، ژیاری ئێستایش تەنها لە کۆمەڵەی سپیدا بەرتەسك نەبوەتەوە، بەڵکو یابان و چینەکانیشی تێدان، ئەمەش جەختکردنەوەیە لە دوو شت:

**یەکەم**: گونجان بۆ تاکەرە گەزێك نیە تا جۆرە کار و پیشەیەکی دیاریکراویان هەبێت.

**دووەم:** هەموورەگەزەکان بەڵکو هەموو ئەندامان بۆیان هەیە هەمان ئەو کارە بکەن کە دەرفەتی هاوشێوەیان بۆ بگونجێت لەرووی خوێندنو بوارەکانی ترەوە.

بانگەوازێکی صەهیۆنیەتی جیهانی هەیە کە باس لە خاوێنی رەچەڵەکی جوولەکەیی دەکات و دواجار دەگاتە ئەوەی بڵێت رەگەزی جوولەکەیی رەگەزێکی جیایە لە بەرەبابەکانی تر.

راستی مێژوویی‌و توێژینەوە ئەنسرۆپۆلۆجیەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە جوولەکە بەجۆرێ لە شوێنێك نیشتەجێ نەبون تا ببنە یەك ئوممەت، وێڕای ئەوەی جوولەکە لە کۆندا لەگەڵ گەلە دراوسێکانیاند تێکەڵی و هاوسەرگیرییان کردووە، ئەوانەی لە ئاسیا رۆژئاوایی نیشتەجێ بوون وەك کەنعانیەکان و عەرەب و حەبەشیەکان، ژمارەیەکی زۆریش هەبوون لە چەند ناوچەیەکی جیاجیای ئاسیا و لە ناوچەی قەوقازو سووریا و عێراق و یەمەن و سەمەرقەند و بوخارا و ئێران، ئەمانەش تێکەڵ بون بە خەڵکانی تر.

**عەلامە سالمان دەڵێت:** بێگەردی بەرەبابی جوولەکەیی تەنها خەیاڵە، چونکە گۆڕانکاری و جیاوازیەکای نێوان بەرەبابەکان لەنێو جوولەکەکانیشدا هەبون.

**فیشبرج دەڵێت:** بانگەشەکانی جولەکە سەبارەت بە بێگەردی بەرەبابیان لەبنەرەتدا بێ بنەمایە، ئە جوولەکانەی لە شوێنی رەسەنی خۆیان کۆچیان کردووە تێکەڵەیەکی بەرەبابەکان بون، جیاوازی تێکەڵیەکەش بەپێی مێژووی کۆچەکەیان جیاوازە، لە ئەورووپادا جوولەکەکان بەشێوەیەکی بەرچاو لەگەڵ مەسیحیەکاندا تێکەڵ بوون، بەجۆرێك سەرنجی کڵێسای راکێشا و دواجار لە چەند قۆناغێکی یەکدوای یەکدا چەند یاسایەکی

دەرکرد کە ڕێی نەدەدا مەسیحیە ئەرسەدۆکسەکان لەگەڵ جوولەکەکاندا هاوسەرگیری بکەن.

یاساکانی سیۆدۆسی دووەم لە سەدەی شەشەمی زایینی و یاساکانی ئەنجومەنی ئۆرلیان لە ٣٥٨ زایینی و ئەو یاسایانەی کلێسا کە دەسەڵادارانی کلێسا لە تولیدوا (تولەیتیلە) لە ساڵی ٥٨٧ زایینی دەرایانکردن و یاساکانی ڕۆما لە ٧٤٢ زایینی، هەموو ئەمانە دژ بە جوولەکەکان و هاوسەرگیری لەگەڵیان دەرچوون.

بێگومان یەکدوای یەك دەرچوونی ئەو یاسایانە بەڵگەیە لەسەر زۆری هاوسەرگیری نێوان جوولەکە و مەسیحیەکان، جوولەکەش سووربوون لەسەر ئەوەی بچنە ناو ئایینەکانی ترەوە تا کاربکەن بۆ وێرانکردن و داماڵینی لە ناوەوەو بەدیهێنانی چەند ئامانجێکی تر، دابەشکردنی جوولەکە لە جیهاندا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆربەی جوولەکەکانی جیهان تەنها لەرووی ئایینیەوە جوولەکە بون، چەندین جوولەکە هەبون لە چەندین بەرەبابی تێکەڵی جوولەکە یی بون هەر لە تێکەڵەی ئاسیایی و ئەورووپی، پاشماوەی بەرەبابی کۆچەرانی جوولەکە کۆنەکان زۆر ڕێژەیەکی کەم بون، دیارترین کۆمەڵەکانی جوولەکە لە ئێستادا بریتین لە جوولەکەی خەزەر کە لە ساڵی ٧٤٠ی زاینیدا بوون بە جوولەکە و لە بنەڕەتدا جوولەکە نەبون، بەڵکو بەهۆی کارێگەری بەجوولەکەبوونی پاشای خەزەرەوە (بۆلان) بوون بە جوولەکە، ڕێژەی زۆرینەی جوولەکەی پۆڵەندە و باشووری رووسیا دەچنەوە بەر ئەو بەرەبابە خەزەریە.

**تێبینی:**

لەم بەشەدا پشتمان بەستووە بە نووسینەکانی جوان کۆماس(خرافات عن الأجناس)، یسري عبدالرزاق(السلالات البشرية)، محمد السيد بدوي(التطور).

# باسی سێیەم:

# ماددیگەرایی

بیردۆزەی ماددیگەری تەنا ئەگەرێکی ماددی نەبووە کە بە بەردەوامی توێژینەوەکان رەخنەی لێ بگیرێت و راستیگەلێکی لەسەر ئاشکرا بێت، بەڵام خێرا ئەو بیردۆزەیە لە بواری توێژینەوە فەلسەفیو کۆمەڵایەتیەکانەوە وەك راستیەکی چەسپاوی لێهاتو لەسەر ئەو بنەمایەش بڕێ رێسا و بنەما دانران کە ئامانجیان دژایەتی بەها بنەرەتیەکانی گەلان و کۆمەڵگەکان بێت، ئەو بەهایانەی کە لە کرۆکی ئایینەکان و راستیەکانی سروشەوە دەرکەوتون و لەگەڵ فیترەت و عەقڵیشدا دەگونجێن، پاشان ماددیگەری بەرنامەیەکی خستەبەردەم مرۆڤایەتی کە بە تەواوەتی دژایەتی مۆرکی شتەکانو دیاردەکانی بوونی دەکرد، دژی هەموو ئەو راستیانە بوو کە مرۆڤایەتی لە گەرانی دووررودرێژی بە دوای خوا و راستیەکانی بوون و سیستمی ژیاندا بەدەستی هێنابوون.

ئایینە ردابەزیوەکان راستی بوون و کەونیان بە مرۆڤ گەیاندووە، ئەو راستیانەی کە مرۆڤایەتی هەرچەندە لەرێی عەقڵ و گەڕانەوە هەوڵی بۆ بدانایە نەدەگەیشت پێیان، چونکە ئەو راستیانە پەیوەستن بە غەیبی نادیارەوە ە ئەزموون و هەست ناتوانن پێیان بگەن، عقڵیش بە تەنها ناتوانێت پێیان بگات، بەڵام مرۆڤ بە سروشتی خۆی کە بەدوای ماددەدا دەروات و تاسەی گەیشتنیەتی بە ئارەزووەکانی و پشت دەبەستێت بە ەقڵ، ئەم مرۆڤە ویتس ئەو لایەنە گەورەیە ئاشکرا بکات بێ ئەوەی

پێناوەکانی ڕێی گەڕانی بەدەستەوە بێت، بۆیە نەیتوانی بگات بە حەقیقەت و دواجار ئەوەی پێی گەیشت ئەو ئەگەرە بوو کە دەڵێت ئەم کەونە ماددیە و هیچ دروستکەرێکی نیە و هەر لەخۆوە هاتوەتە بوون و سەرەتایەکی نیە و دێرینە و کۆتاییشی نابێت، مردنیش کۆتایی هەموو زیندوویەکە، ئەمە بەرهەمی هەوڵی عەقڵی مرۆیی بوو لە گەشتی گەران بە دوای حەقیقەتیدا، گەڕانێك کە یارمەتی بەخششەکانی ئایینەکان و سروش و پەیامە ئاسمانیەکانی بەرپەرچ دەدایەوە، لێرەوە ئەنجامەکان بە تەواوەتی دژی راستیە تەواویەکان بوون و نکوولیان دەکرد لە بوونی خوای خالق و لە تێگەشیتنی راستی ژیان و ئامانجی بوون و ئەرکی مرۆڤ لەم بوونەدا کەمرەو بوون، مرۆڤ لە تەمەن و مێژووی مرۆڤایەتیدا ماوەیەکی زۆری لەو بوارەدا بڕیوە بێ ئەوەی بگاتە شتێکی دڵنیا و ئارام بەخش بە فیترەتی مرۆیی، مەترسیدارترین قۆناغی توێژینەوەی پێش و پاش پەیامی مەسیح پەیامی هیلینی رۆژئاوایی و غەنووصیەتی رۆژهەلاتیە.

یەکەمیان بەتەنها پشت دەبەستێت بە عەقڵ و ئەوی تریشیان بەتەنها پشت دەبەستێت بە ویژدان، دواجار گەیشتنە چەند ئەنجامێکی تەواو ناتەبای گوماناوی و دوانەخودایی و سیانەخودایی بەوجۆرەی لە مێژووی فەلسەفەی کۆندا تۆمارکراوە، بێگومان کرۆکی ناکۆکی نێوان مرۆڤ و ئەو ئایینانەی کە بۆ پێشرەوی مرۆڤ بەرەو راستیەکان هاتون ئەوەیە کە بە توانا تایبەتیەکان مرۆڤ ناگات بە راستیەکان، ئەرکی دڵ و بیستن و بینین نازانن.

مەسەلەی خەلق و بوون کە هێزە تواناسنووردارەکان ناتوانن ئاشکرای بکەن، سروش کە لە کتێبە دابەزیوەکاندا خۆی نواندووە ئەو راستیانەی خستوەتەروو و پێشکەشی کردووە بە مرۆڤایەتی تا توانا سنووردارەکانی

بەوە سەرقاڵ نەکات و سەرقاڵ بێت بە ئەرکی حەقیقی خۆیەوە کە ئاشکراکردنی کانزاکانی زەوی و دەریاو شاخەکانە تا ژیان بەرەو بنیاد پێشڕەوی پێ بکات و لەسەر ئەو ڕێبازە ڕەسەنە شارستانیەت بنیاد بنێت کە زانست و ئیمان پێکەوە کۆدەکاتەوە.

مەزهەبی ماددیگەری لە سەردەمی هیلینیدا دەرکەوت و بانگخوازانو خەباتگێڕانی بۆ بوون، سەردەمی هیلینیش پێش سەردەمی پەیامی سەید مەسیح بوو، لە بارودۆخێکدا دەرکەوت کە ئاییندارى تەنها بڕێ ئەفسانەو ڕێورەسم و بۆنە بوو.

ئیمیل پۆترۆ لە کتێبەکەیدا(زانست و ئایین) دەڵێت: خودی فەلسەفەی یۆنانی لە ئایینەوە دەرکەوت، بەڵام هەرکە لە ئاییني جیابویەوە کەوتە دژایەتی کردنو گاڵتەپێکردنی ئایین، پێی وابوو مرۆڤ خواوەندەکانی دروست کردووە، لای ئەوان ئایین بڕوای بە پێویستی کوێرانە هەیە، فەلسەفەش هات و بڕوای هێنا بە عەقڵی مرۆیی، بەوەش عەقڵ شوێنی خواوەندەکانی گرتەوە، یۆنانیەکان لە بەرزراگرتنی عەقڵدا تەواو سنووریان بەزاند تا ئاستێ عەقڵیان بە خاوەن دەسەڵات دەزانی و پیرۆزیان رادەگرت، لەم ڕێڕەوەشدا بوو کە ڕێبازەکانی بێڕەوشتی و هەستو نکوولی لە زیندووبوونەوەی پاش مەرگ و دنیایی بوون دەرکەوتن، ڕوویان کردە رابواردن و پەستی یەکان، دەیانوت هەموو جیهان بە صودفە هاتووەت، چێژ ئامانجی ژیانە، سوقراتی راگریان دەڵێت عەقڵ هۆکاری مەعریفەیە نەك هەست، هەڵەترین قسەشیان ئەوەیە دەڵێن ماددە ئەزەلیە و بوونیش کۆتایی نایەت.

ئیسلام هاتو رووی راستی ئەو پرسەی ئاشکراکرد، قورئان بە شێوەیەکی ورد و تایبەت مەسەلەکانی ئەودیو سروشتی دیاری کرو موسڵمانانی بێباك کرد لە خۆماندووکردن و گەڕان بەدوایدا، قورئان مرۆڤی بانگهێشت کرد بۆ بیرکردنەوە لە دروستکراوەکانی خوا لە بووندا و دووری راگرت لە گەڕان بەدوای زاتی خوادا، چونکە ئاسان نیە بگەیت بە حەقیقەتەکەی، ئەمەش هەمان وتەی زانایانە(گەڕان بەدوای تایبەتمەندیەکاندا دوور لە گەڕان بەدوای ماهیەتدا)، ئیسلام وێنەیەکی تەواوی سەبارەت بە هەموو غەیب و خوای گەورە و رۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ و قیامەت و پاداشت و سزا بەخشیوە بە موسڵمانان، بە تەواوەتیش ئەو چەمکانەی دیاری کردووە، لە هەمان کاتدا کورتی عەقڵی مرۆیی نیشانداوە لە گەیشت بە هەرشتێك لەو بوارەدا و دوورەپەرێزی تەواوی کردووە لە بەزاندنی ئەو بنەمایانە.

موسڵمانان بەهۆی ئەو دەرفەتەوە دەرفەتیان بۆ رەخساوە تا لەبواری کردەییدا کار بکەن و رێبازی زانستی ئەزموونی دابنێنو بیکەنە دەروازەیەك بۆ دەرچوون رووەو ئەو رێبازەی کە خوای گەورە لە بنیاد و پێشکەوتندا بۆی داناون، هیچ گومانێکیش لەو راستیەدا نیە، راستیەك کە موسڵمانان پێشکەشیان کرد بە زانست و شارستانیەت، زۆرێك لە ناموسڵمانانیش ئەو شایەتیەیان بۆ داون، پێشڕەوی ئەوانەش بریفۆلتە لە کتێبەکەیدا (بنیادی مرۆڤایەتی)، هەروەها گۆستاف لۆبۆن لە کتێبەکەیدا(شارستانیەتی عەرەب) و دکتۆرە سگریە هونکە لە کتێبەکەیدا (خۆری خوا بەسەر رۆژئاوادا دەدرەوشێتەوە).

لە سەردەمی نێدا بزاڤی زانست و شارستانیەت لەسەر بنەماکانی موسڵمانان گوازرایەوە بۆ رۆژئاوا، بەڵام خێرا ئاراستەکە لە ئامانجی خۆی

لادرا و هێندەی نەبرد جارێکی تر دیدی عەقڵگەرایی خۆی نواندو بیری ماددیگەری دەرکەوتەوە، بەڵام ئەمجاریان زۆر سەرسەختترو کاریگەری قووڵتر بوو لە هەموو بیری مرۆیدا، ئەو بەخششانەی زانست و ڕێبازی ئەزموونی گوازرابووەوە بۆ ڕۆژئاوا لە ڕۆژئاوادا بەروە رووی کەشێکی یاواز بوویەوەو بە ئاسانی قبووڵ نەدەکرا(ئەو ڕێبازە بەرهەمی شارستانیەتی ئیسلامی بوو پاڵپشت بە بانگەوازی قورئان بۆ رامان لە ئاسمانەکان و زەوی کە ئەوەش بەرهەمی ئایینە)، بۆیە سەخت ئاسان قبووڵ بکرێت، لێرەوە ململانێی مێژوویی نێوان زانست و ئایین سەریهەڵداو ماوەیەکی دووردرێژ ەردەوام بوو، سەرکەوتنی زانستیش واتە ڕاگەیاندنی دوژمنایەتی لەگەڵ ئایین و جەمسەری بوونی زانست و بەرنگاربونەوەی ئایین بە چەند فەلسەفە و ئیدۆلۆجیایەك تا شوێنی ئایین بگرنەوەو پێگەی ئایین لە دەروون و عەقڵی خەڵکدا نەهێڵن، بەراستیش پەیامی ئایینی ڕۆژئاوا نەیتوانی لەگەڵ بەخششەکانی زانستدا هەڵبکاتو کەمتەرخەم بوو، ئەم کەمتەرخەمیەش ئەو لەتبوونەی لێکەوتەوە کە کەسانی وەك دیکارت بانگەوازیان دەکرد بۆ ئەوەی بڵێن مەیدانی زانست جیایە لە مەیدانی ئایینو هیچ گونجانو هاوراییەکی نێوان ئایین و زانست بوونی نیە و کەسیان زاڵ نیە بەسەر ئەوی تریاندا.

بەڵام زانست لەو ئاستەدا نەوەستا و پێشرەویەکی گەورەی کرد و دەستکەوتی وای بەدەستهێنا کە وای کرد بە تەواوەتی نکووڵی هەمووشتێك بکات جگە لە عەقڵ و هەستپێکراوو بینراوەکان، بەوەش نکووڵی کرد لە جیهانی غەیب و ڕۆح و بە سەختی کەوتە جەنگ و دژایەی لەگەڵیان، دواتریش بیردۆزەی ماددیگەری تەواو بەرزراگیرا، ئەمەش لە ئەنجامی دوو شتەوە بوو:

**یەکەم**: ڕاوەستانی پیاوانی لەسەر ڕووکەشی شتەکان.

**دووەم**: گۆڕینی بیردۆزەکەی داروین لە بواری بیردۆزە سروشتیەکانەوە بۆ بواری فەلسەفەی کۆمەڵایەتی، زانست لە ئەندێشەی یەکەم دانەرانید مەبەست لێی ڕاڤەی بوون بوو، زانایانیش کە یەکەمجار نەوینە زانست گرنگییان بە مەعریفەی (بۆچی) دەدا، بەڵام دواتر دەستبەرداری ئەو گرنگیدانە بوون پاش ئەوەی زانییان ئەو هەوڵانە بی مانا و بێ ئەنجامن. لێرەوە ئیتر زانست لەبری ڕاڤەو شیکاری شتەکان کەوتە پەیوەندکار و تێبینی بەخش و وەسفی شتەکانی دەدا و بڕیاری دەدا.

هێندەی نەبرد زانست هەڵەی ئەو بیردۆزە ماددیگەرییەی ئاشکرا کرد کە لە ئەنجامی نەزانینی ئەودیو سروشتەوە داینابوو، گەورەترین بەردی کونجی بینای ماددیگەری کاتێ ڕووخا کە بیردۆزەی ڕێژەیی ئاشکرا بوو. ئەو بیردۆزەی کە دەیوت ماددە دەبێتە وزە و وزەش دەبێت بە ماددە.

عەللامە نەگایمس تجینەر لە کتێبەکەیدا (جیهانی چواردەورمان) دەڵێت: بەردی سووچی بینا زانستی تەبیعیات لە سەدەی نۆیەمدا بریتی بوو لە نەمری و مانەوەی ماددە لە لایەك و مانەوەی وزەش لەلایەکی ترەوە، ئەم ڕایەش بە تەواوەتی پووچەڵ بوویەوە، شتێکی تر شوێنی گرتەوە کەبریتیە لە مانەوەی یەك زات کە ماددەو وزەشە، ئەوە نەما کە بڵێت ماددە هەتاهەتاییە و وزەش هەتاهەتاییە، بەڵکو هەرکام لەوانە دەگۆڕێن، چونکە هەردووکیان یەك شتن، ماددە دەبێت بە جۆرێ لە وزە، بەمەش بیردۆزەی ماددیگەری لە ڕوانگەی زانستەوە شکستی خواردووە، چونکە ئەوە دەرکەوتووە هێزێکی نادیار لەپشت ماددەوەیە کە کاریگەری ڕوونی هەیە، بەمەش جیهانی غەیب لە بازنەی زانستدا قبووڵ کراوە، بەڵام

ئەوەی زانست لەبواری ئەزموونیدا پێی گەیشتووە شتێكی جیایە لەوەی كە فەلسەفەی ماددیگەری هەوڵ بۆ دەداو چەندین قۆناغی بۆ بڕی.

هاربرت سبنسەر و ژمارەیەك لە فەیلەسووفان بیردۆزەكەی داروینیان كرد بە پێناوێك بۆ بەرزراگیری ماددیگەریو نەهێشتنی پەیوەندی لەگەڵ هەریەك لە رۆح و غەیب و ئەودیو مادده و سروش و بەصیرەت، گەورەترین ئەنجامی ماددیگەریش بریتی بوو لە نكوولی كردنی خوای بەدیهێنەر و زیندووبوونەوە و سەیركردنی مرۆڤ بەو جۆرەی كە بوونێك بێت ئەزموونەكانی ئاژەڵی بەسەردا جێبەجێ بێت.

ئەو جیاكارییەی نێوان مادده و رۆح و مرۆڤ و ژیاندا خاڵی لاوازی و مەترسی و لووتكەی تەنگژەی ژیاری هاوچەرخ بوو، رێبازی ماددیگەری زاڵ بووە بەسەر هەموو توێژینەوەكانی نەفس و ئەخلاق و كۆمەڵایەتیدا، لەو بارەشەوە عەللامە جوود دەڵێت: زانستە سروشتیەكان هێزی شیاو بە خواوەندەكانیان پێداوین، بەڵام ئێمە بە عەقڵی منداڵان بەكاری دەهێنین.

عەللامە دكتۆر كارل لە كتێبەكەیدا (تحیدی الانسان) ئەو تەنگژە مەترسیدارە دەخاتەروو و دەڵێت: شارستانیەت هەر لە یەكەم رۆژەوە ماددەو رۆحی لەیەك جیاكردوەتەوە و پشتی بەستووە بە مادده هەر لەو كاتەوەی گالیلۆ تایبەتمەندیە یەكەمینەكانی جەستەكانی لە تایبەتمەندیە دووەمینەكان جیاكردەوە، تایبەتمەندیە یەكەمینەكان وەك دووریەكان و كێش، ئەو دوانەش ئاسانكارین بۆ پێوانەكردنی، تایبەتمەندیە دووەمینەكانیش وەك رەنگ و بۆن كە پێوانە ناكرێن، گالیلۆ چەندێتی و چۆنێتی جیاكردەوە و تەنها گرنگی دا بە یەكەمیان، دواتر شوێنكەوتوانی گالیلۆ هەموو توانای خۆیان لە چەندێتیدا بەرتەسك كردەوەو جۆرێتییان

پشتگوێ خست، گوڕو تینیان بۆ کێش و پێوانە وای کرد مرۆڤیان برد بەرەو جیهانی سروشتگەرایی و بیرکاری و کیمیا.

دەبێت ئەم بیرکردنەوەیە چاکسازی تێدا بکرێت تا جیهان بتوانێت شارستانیەت رزگار بکات، چونکە مرۆڤ شتێکی گەورەتر لە سروشت و کیمیای تێدایە، هەڵەی دیکارتیش ئەوەبوو شتەکانی بە ماددی دادەنا و دوای نووسینەکانی شتە رۆحیەکان جیاکرانەوەو رووکەشی عەقڵیش وای لێهات سنووردار نەدەکرا، بنیادی جەستەو وەستانی و ئەنجامدانی کارە جۆربەرجۆرەکانی لە دیدی ئەواندا زیاتر چەسپاو بوو لە بیرۆکەو خەم و جوانی، ئەمە ئەو هەڵە شارستانیەتی بەو رێگەدا برد کە زانستی بە باڵا و مرۆڤی بەرەو دارمان دەبرد.

پێشکەوتنی زانست لە هەر شتێکدا کە پەیوەستی خۆراك و وەرزش بوو لەسەر حسابی پێگەیشتنی عەقڵی بوو، ئەوەش سەراوەی تەنگژەکە بوو.

مەترسیدارترین گۆڕان لە بیری ماددیگەریدا هەمان ئەو چەمك و واتایە بوو کە فەلسەفە بۆی دیاری کرد و لە چەمکی زانستەوە بەرەو چەمك و واتای کۆمەڵایەتی برد، ئەم ئاراستەش مەبەست پێی لێدانی بەها رۆحی و دەروونیو ئایینیەکان بوو تا لەسەر بنەمای ماددە سیستمێکی کۆمەڵایەتی تەواو بنیادبنرێت.

بیردۆزەی ماددیگەری هوڵی داوە تا زاڵ بێت بەسەر هەموو چەمکەکانی بیر و ژیانو کۆمەڵگە و رۆشنبیریدا تا بتوانێت هەموو پیار و راسپێراوەکانی ئایینەکان لەناوبەرێت و مرۆڤ لە هەموو راسپاردەیەکی یەکخواپەرستی و رەوشتداری داماڵێت.

دیارە ئایدۆلۆجیای تلمودیش لە پشت ئەو بیردۆزەیەوە بووەو واقیعی ئایینی رۆژئاوای ردووە بە پێناوێ بۆ دژایەتی ئایین، بەلاّم هەمان ئەو مونتەلەقەش بە تۆزێ بوو وشتێکی ئاسایی نەبوو و لەگەلّ عەقلّ و فیترەتو هەر راسپاردەیەکی بیری مرۆییدا نەدەگونجا، زیاتر لەوە دەچوو مرۆڤ لە بەرگو ویژدانی داماڵن-بانگخوازانی ماددیگەری پێیان وابوو ئاسان نیە مرۆڤ لە بازنەی ئاییندارىو بروابوون بە خوا دەربکەیت-، لەبەرئەوەش کە زانست نەیدەتوانی کرۆکی شتەکان بزانێت بۆیە بانگخوازانی ماددیگەری بانگەوزای خۆیان نوێ دەکردەوەو هەولّیان دەدا چەند پێناوێکی نوێ بهێنن تا ساختەی خۆیان بشارنەوەو بانگەوازەکەیان لە وێنەیەکی زانستی درەوشاوەدا نیشان بدەن.

بیردۆزەی ماددیگەری کە مۆرکی بیری رۆژئاوایی هاوچەرخی لەخۆگرتبوو بریتی بوو لە ئینشیتاری، بروای بە بوونی یەك رەگەز هەبوو کە ئەوەش ماددەیە و بنەرەتی ئەم جیهانەیە و هیچ رەگەزێکی تر بونی نیە، لەکاتێکدا بیری ئیسلامی هەلّوێستی تەواوکاری هەیە و لە کرۆکی ژیان و راستی مرۆڤ نزیك دەبێتەوەو رۆح و ماددە پێکەوە کۆدەکاتەوە، بێگومان بە تەنها پشت بەستن بە ماددەش لە بنیادی رێبازی ژیان و مەعریفەدا مەترسی گەورەی لێدەکەوێتەوە کە گرفت و بارگرژی بۆ عەقلّ دروست دەکات و ئارامی فیترەتیش ناهێلّێت، ماددیەکان رۆحیش بە ماددیو عەقلّیش بە ماددیو نەفسیش بە ماددی دەزانن.

بیری ماددیگەری سەبارەت بە بوونی و سیستمی کەون هەلّوێستێکی وای هەیە کە جێی قەناعەتو رەزامەندی نیە، فەلسەفەی ماددیگەری نکوولّی دەکات لە بوونی ئامانج لە بوونی کەونو نکوولّیش دەکات لە بوونی سەرەتاو کۆتایی بوونو بروای نیە بە رۆژی دوایيو زیندووبوونەوەو

پاداشت وەرگرتنەوە، لێرەوە ئەو فەلسەفانەی دەروونناسی و ئەخلاق و کۆمەڵایەتی دەرکەوتن کە پەیامی ئامانجداری مرۆ و بەرپرسیارێتی مرۆییان لەم بوونەدا گۆڕی و بڕوایان نەبوو بە زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دوایی، مەترسیەکی گەورەی بیری مادديش ئەوە بوو کە هەموو چالاکی مرۆیی وا لێکدەدایەوە کە لە جەستەوە سەرچاوەی گرتووە و لایەنە ڕەوشتی و ڕۆحیەکان هیچ ڕۆڵێکیان نیە، بۆیە مەسەلەکانی کۆمەڵگەو ئاینو ئەخلاق بە چەند پرسێکی ڕێژەیی گۆڕاو تەماشا دەکات، مەترسی ئەمەش لەوەدایە کە ئیتر وەك ماددیەکی بەستوو لەگەڵ مرۆڤ هەڵسوکەوت دەکەن یان ئەزموونی ئاژەڵی بەسەردا جێبەجێ دەکەن، سەرچاوەی هەموو ئەمانەشئەو ئەگەرەیە کە دەڵێت مرۆڤ ماددەیەو نەفسیش ماددەیە. لەم ئاراستەوە فەلسەفەی ماددیگەری هەوڵ دەدات هەموو بەها و ڕێسا باڵاکان بە گاڵتە بگرێت، چونکە تەنها ڕاستیەك لا ئەو بوونی هەبێت ڕاستی ماددیگەریە و ڕوانگە بنەرەتیەکانیش لای ئەو ڕوانگەی جەستەنو بەس.

لێرەوە دەزانین بیری ماددیگەری لە بنرەتدا ئامانجی ئەوەیە ئەو بەهایانە لەناو بەرێت کە ئایینەکان پێشکەشیان کردون بە گەلان و مرۆڤایەتی بەتایبەت لە بواری بیروباوەڕ و ئەخلاقدا، بۆیە بانگەواز دەکات بۆ ڕزگاربوونی تەواو لە هەموو کۆتو بەندێك و نەهێشتنی هەر بەرپرسیارێتی و ئەرکێك، ئەو سنوورانە لەناو دەبات کە ئایینەکان دایاننناون بۆ مرۆڤایەتی تا ڕێڕەوی خۆی دڵنیا بکات، بەتایبەت لە مەسەلەکانی سێکس و ئارزووەکانو خۆدەربازکردن لە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پەیوەستی ئەخلاقی تا ببێتە دەروازەیەك بەرەو ئارەزووبازی خێرا بەو بیانووەی مردن کۆتایتی هەموو زیندەوەرێکە، ئەمە ئەو ڕەوشتدارییەیە کە ئایدۆلۆجیای تلموودی بۆ دارماندنی مرۆڤایەتی و

تێکشکاندنی مەعنەویاتی مرۆڤ دایمەزراندووەو لەسەر ئەو بنەرەتانەی ئەویش هەموو ڕێبازەکانی ملهوڕی و بێڕەوشتی دروست بوون.

## ( پێگەو ئەرکی عەقڵ )

لە پەیامی ئیسلامیدا عەقڵ واتای جیا لە واتای فەلسەفەکانی تری هەیە، دیارترین تایبەتمەندی ئەو واتایەش ئەوەیە کە عەقڵ لە ئیسلامدا پیرۆز نیەو مۆرکی بەرزراگیری یان بە تەنها پشت پێبەستنی نیە، یان نابێت زاڵ بێت بەسەر هەموو بیری مرۆییدا، بەڵکو عەقڵ پێناوێکی گرنگی مەعریفەیەو پێناوی تریشی لەگەڵدایە، لەوانە سروش، هەروەها پێناوی دڵ لەگەڵیدا کاردەکات.

بێگومان عەقڵ و ئیمان پێکەوە زامنی ئارامشن لە مەعریفەی مرۆییدا، توێژەران وا وەسفی دەکەن کە عەقڵو ئیمان دوو چاون کە مرۆڤ ڕێی ڕێنموونی بەوانە دەبینێت، هەرکات هاوێنەی ئیمان داپۆشرا حیرەی لەگەڵ دەبێت، هەرکاتیش هەردوو هاوێنەکە داپۆشران بەوە وێری ڕوودەدات، بۆیە ئەو مەزهەبانەی بە تەنها پشت دەبەستن بە عەقڵ ئەوە سەرسام دەوەستن، ئەو مەزهەبانەش کە نکووڵی دەکەن لە عەقڵ و ئیمانیش ئەوە لەوپەڕی گومڕاییەوە هاتون وەك بوونگەرایی‌و فرۆیدی‌و هەیبی، عەقڵ‌و ئیمان دوو پێناوی جیانەکراوەن، یەکێکیان ڕێنموونیە بۆ ژیان و کارەکانی دنیا، ئەوی تریشیان ڕێنموونیە بۆ ژیانی پاش دنیا، جا ئەگەر مەعریفە بەس لەسەر ژیانی دنیا وەستا ئەوە ناتەواوە، چونکە بازنەو ئەڵقەی بەردەوامی تەواو نەکردووە، ئەزمونیش چەند بەشی تەواو نابێت، وەك ئەوەی ئەزموون گیرابێتەبەرو ئەنجام‌و پەند نەبێت، ئەمەش ئەو

ناتەواویەیە کە سەرسامی و ڕارایی و پەرتبوونی لێدەکەوێتەوە، زانستیش ئەگەر چی لە عەقڵەوە بێت، بەڵام ئیمان پاڵنەریەتی و ڕێی پێ دەبڕێ تـ نەبێتە دەرد ۆ بەڵا بەسەر مرۆڤایەتیەوە.

ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی عەقڵ لە شوێنی سروشتی خۆیدا بێتو سنووری ئەرکی خۆی بپارێزێت، ئیسلام هەوڵ دەدات عەقڵ ەل هەموو دەسەڵاتێك ئازاد ڕاگرێت جگە لە دەسەڵاتی خوا، بۆیە بانگەواز دەکات بۆ ڕزگاربوونی عەقڵ لە بتپەرستی و چەمکە ساختەکان، هەروەك عەقڵ ڕزگار دەکات لە ملکەچی نواندن بۆ هێزە شاراوەکان و جادووگەری.

بە گشتی قورئانی پیرۆز جەخت لەوە دەکاتەوە سروشتی پێکهاتەی عەقڵ پەیوەستە بە ڕێڕەوی مرۆڤ لەسەر زەویدا تا مرۆڤ پێشڕەوی بکاتو توانای هەبێت درك بکات بە یاساکانی ماددەو بەکارهێنانی ماددە بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ، ئەرکی ئەوە نیە نهێنیەکانی پێکهاتەی مرۆیی ئاشکرا بکات، پاش ئەو هەموو هەوڵانەش لەوەدا دەستەوسان وەستاوە، چونکە نهێنی بوون و ژیان و نهێنی مردن پەیوەستی غەیبە کە تەنها خوای گەورە دەیزانێت و لەو بارەشەوە وردەکاری پێویستی لەڕێی سروشەوە ناردووە بۆ مرۆڤ، لەبەرئەوەش کە نهێنی ڕۆحی مرۆیی دوورە لە بواری کاری عەقڵ و درك پێکردنی لەڕێی عەقڵەوە، بۆیە قورئانی پیرۆز بڕی پێویستی زانیاری بە مرۆڤ داوە و ڕێبازێکی تەواوی پێشکەش کردووە، بەڵام عەقڵ کارە سەرەکیەکەی ئەوە نیە خوو بداتە ئەو بوارە، لێرەوە تا ئێستاش مرۆڤایەتی نەیتوانیوە ڕێبازێکی ژیان یان ئایدۆلۆجیای نیزام و شەریعەت و یاساگەلی شیاو بۆ کارپێکردن دابنێت یان ویستەکانی مرۆڤ بەدیبهێنێت، هەروەها مرۆڤایەتی نەیتوانیوە لێکدانەوەی تەواو بکات بۆ بوون.

**مامۆستا یووسف العش دەڵێت:** عەقڵ دروستکراوی خوایە و ملکەچی خوایەو لە پەرستشدا هاوبەشی خوا نیە، خوا عەقڵی بۆ مرۆڤ داناوە بۆ ئەوە نا تا لە بری خوا بیپەرستێت بەڵکو تا شارەزای بوون بێت و چەندی پێویستە وردەکاری پێویستی بوون ئاشکرا بکاتو لەو تاریکیانەدا مرۆڤ ڕێنموونی بکات کە کاری ئاین نیە بۆی ئاشکرا بکات، عقڵ بۆی هەیە لەو مەیدانەدا رامێنێ و بگەڕێ و شارەزا ببێتو ڕێی ڕێنموونی لێ وەربگرێت.

بەڵام ئەوە مەسەلانەی کە خوای گەورە لە قورئاندا روونی کردوونەتەوە دەبێت مرۆڤ بڕوا بهێنێت پێیانو گومانی ئەوەی نەبێت لەوانەیە راست نەبن، بەڵکو مرۆڤ دروستکراوی خوایە و عەقڵیش کە بەشێکی مرۆڤە پێناوە نەك ئامانج، پێناوێکە کە سنووری نەزانراوەکان دەبڕێت بەڵام ناتوانێت سنووری فەرمایشتی خوا ببەزێنێت، عەقڵ خوا نیە تا هەڵن نەکات، بەڵکو روناکیەکە بۆ مەیدانی تاریکی، بەڵام رووناکی لە رووناکی خوا وەردەگرێت، ئەو سنورداریەش ململانێ ناهێڵێت، جا عەقڵ توانای ئەوەی نیە نهێنی دروستکراوان و بوون ئاشکرا بکات و بنەماکانی مەعریفە دابنێت، بەڵکو خوای گەورە ئەوە دەکات، زانایانی موسڵمان پێیان وایە مادەم روناکی عەقڵ زۆر کزە لەبەردەم رووناکی خوادا ئیتر بۆچی رووناکی خوا نەگیرێتەبەرو بەدوایدا رووناکی عەقڵ ڕێی خۆی بڕێت، عەقڵی ئیسلامی لە ڕێ و ئەنجامیدا لەگەڵ ئەخلاقدا گونجاوە، ڕێنموونیە بەرەو چاکە.

بەڵام فێڵ و تەڵەکە و لێزانیەك کە بەرەو خراپە ڕێ دەبڕێ بەرهەمی عەقڵ نیە، بەڵکو بەرهەمی دەروونی خراپەخوازە، ئەگەر مرۆڤ بە جوانی بگەڕێتەوە بۆ بڕیاری عەقڵی ئەوا ئەو هەڵەیە ناکات، عەقڵی مرۆیی نەیاری سروش نیە، بەڵکو ڕێنموونی لە سورش وەردەگرێت، عەقڵ ئامێرێکە کە سروش وەردەگرێت و لێکیدەداتەوە و توانای بەرنگاربوونەوەی سروش یان

لێکدانەوەیەکی نادروستی بۆ سروشتی نیە، عەقڵی ئیسلامی ڕووناکیەکە کە لەدەست جادووو چاوبەستو هێزە شاراوەکان و ملکەچی بۆ جگە لە خو ڕزگاری بووە.

**مامۆستا حەسەن بەننا دەڵێت:** ئەوپەڕی ئەوەی عەقڵ پێی دەگات ئەوەیە هەندێ تایبەتمەندی و سیفەت دەزانێت، بەڵام ڕاستیە موجەرەدەکان و ماهیەتە ساکارەکان لە بازنەی درکی عەقڵدا نین، ئەوەی کەسانی چەسپاو لە زانستدا دەیڵێن ئەوەیە کە ئەو شتانە ناکەونە بازنەی درکی عەقڵەوە. بەڵکو هەرکات عەقڵ هەوڵ بدات بگات بەوانە سەرکەوتوو نابێت و لەبەردەم هەندێ تایبەتمەندی و سیفەتیدا رادەوەستێت.

عەقڵی مرۆیی هێشتا شتێ لە ڕاستی ڕەگەزەکان نازانێت، هەرکاتیش لەو مەیدانەدا ڕۆوبێت تا ڕاستیەکانی بزانێت هەنگاوەکەی بووە بە هۆی زیادە نەزانی بەرامبەر بەو ڕاستیە بنەڕەتیانە، هەموو کەسانی ژیر لەسەر ئەوە کۆڕان کە کەمڕەوی عەقڵ لە درککردن بە ڕاستیەکی ناو ڕاستیەکان یان بێئاگابوون لێی زاتای نەبوونی یان شارانەوەی ئەو ڕاستیە نیە، بەڵکو تەواو ڕوونە و شوێنەوار و تایبەتمەندیەکانیشی ئەو ڕوونیە نیشان دەدەن. هەموو نێنیەکانیش شاراوەن و وردەکاری ماهیەتیشی شاراوەیە، فیترەتی سیلمی مرۆڤ هەمیشە مرۆڤ بەرەو ناسینی خوا دەبات، هەموو دیاردەکانی ئەم بوونەش بە خودی مرۆڤیشەوە هیچ دەرفەتێکی نکووڵی بوون و گەورەیی خوا لەبەردەم مرۆڤدا ناهێڵنەوەو بەڵگەی ڕوونن لەسەر خوا، دڵی مرۆڤ ئەگەر ڕۆشن و ڕووناك بێت ڕاستی چێژی بڕوابوون بە خوا دەچێژێت.

پرسیار کرا لە عارفێك سەبارەت بە بەڵگەی بڕوابوون بە خوا، ئەویش بزەیەکی کرد و وتی: ڕۆژ کە هەڵهات باکی چیە بە چرا بۆ بەڵگەی بوونی ڕۆژ.

بۆیە کەمڕەوی عەقڵی مرۆیی لە درککردن بە راستی ژاتی خوا و سیفەتەکانی و بێتوانایی هەستە مرۆییەکان لە گەیشتن بە شتێك لەوانە واتای نکووڵی کردن لە بوون و تایبەتمەندیەکانی خوا نین، بەڵکو لەسەری واجبە بڕوا بێنێت بە پەروەردگارێ کە خاوەنی ئەو هێزانەیە و خۆی تەسلیمی خوا بکات(و أمرنا لنسلم لرب العالمين).

یەکێك لەو شتانەی کە زانایان و توێژەران باسی دەکەن ئەوەیە عەقڵ ناتوانێت بڕیار بەسەر شتێکدا بدات تا لە دوو شتدا حەصری نەکات: کات و شوێن، بۆیە کەی و لەکوێ بنەڕەتە، ئەگەر نا عەقڵ دەسەڵاتی نیە بەسەریدا، بۆیە عەقڵ ناتوانێت بریار بدات بەسەر خوا و سیفەتەکانی خواو قەزاو قەدەری خوادا، تەنها کاریشی تێگەیشتنە لە دەقەکانی سروش کە لە دەرەوەی عەقڵەوە هاتووە، عەقڵ سنووردارەو ناتوانێت دەرەوەی سنووری وێنا بکات، عەقڵ وێنا خلوودی پێ ناکرێت و خوای گەورەش سنوور بۆ دانراو نیە، بۆیە حوکم ناتوانێت بریاری بەسەردا بدات.

کاتێك عەقڵ بیەوێت بڕیار لەسەر سنوربەدەر بدات پێوانی هەڵە دەبێت و نەگونجانی تەواوی تووش دەبێت، عەقڵ تەنها لە مەسەلە ماددیەکاندا حوکمدانی دروستە، ئیتر جیهانی غەیب هیچ دەستێکی عەقڵ تیایدا ڕۆڵ نابینێت.

زانا کۆنەکانمان راستیان وتووە کاتێك بەجوانی لە عەقڵ تێگەیشتوون‌و دەڵێن ئادەمیزاد عەقڵ‌و ئارەزووی تێدایە، عەقڵ بازنەی ئەرکە

شەرعیەکانە، کرۆکێکی رووناکی بەخشە کە خوا لە مێشکدا دروستی کردووە و رووناکیەکەشی لە دڵدا داناوە، حەق و ناحەق و چاکەو خراپە و جوان و ناشیرین لەیەك جیا دەکاتەوە.

**جاکۆتی دەڵێت:** عەقڵی پاڵپشت نەکراو مرۆڤ بەرەو ملهوڕی دەبات چونکە بە سروشتی تایبەتی خۆی تەنها چارەسەری شتە سنووردارەکان و بەشەکانی مەسەلەکانی پێ دەکرێت، عەقڵ ئەو بەشانە پێکەوە وەردەگرێت تا پەیوەندیەکانی نێوانیان ئاشکرا بکات، بەڵام ناتوانێت کەرەستە خاوە حەقیقیەکە ئاشکرا بکات، خوایەك کە بە مەنتیق بوونی بسەلمێت ناکرێت خوا بێت، چونکە گەیشتن بە مەعریفەی خوا لە رێی عەقڵەوە زامنی ئەوەیە کە عەقڵ زاڵە، بەڵام خوای گەورە هیچ بەسەرید زاڵ نیە یان عەقڵ ناتوانێت چواردەوری زانیاریەکانی بگرێت، حەقیقەتی ئەودیو سروشت لەرێی بیری مەنتیقیەوە ناناسرێت، بەڵکو رێگەی ناسینی ئەودیو سروشت ئیمانە.

**مامۆستا عەبدولهادی ئەبوو ریدە دەڵێت:** عەقڵ ناتوانێت درك بە ماهیەتی شتەکان بکات، بەڵکو پێناوی مەعریفە لەو بوارەدا هەست و رۆحە، لە قورئاندا دڵ پێناوی تێگەیشتن و روانینە و ئەرکی بنەڕەتی دڵیش بریتیە لە مەعریفە.

لێرەوە بەپیرۆزراگرتنی عەقڵ و سەیرکردنی وەك تاکە پێناوی مەعریفە و تاکە رێی گەڕان و توێژینەوە لە رێبازی ئیسلامیدا رەسەن و ریشەیی نیەو وەرگیراو نیە، لە رێبازی توێژینەوەی نوێشدا ئەوە سەلماوە ە عەقڵی مرۆیی ناتوانێت بە دروستیەکی تەواو بڕوانێت بۆ راستیە دەرەکیەکان. بەڵکو عەقڵ سنووردارە و بوارێکی دیاریکراوی هەیە کە ناتوانێت ئەو

سنوورە زیاتر تێپەڕێنێت وەك چۆن چاو ناتوانێت سنووری خۆی تێپەڕێنێت کە بینینە، دەتوانێت ببینێت بەڵام ناتوانێت هەموو شتێك ببینێت، بۆیە سنووری توانای بینینی خۆی پێ نابڕێت، عەقڵیش ناتوانێت پێگەی گەورەیی و سیادە لە مەعریفەدا وەربگرێت، مەگەر تەنها لە دیدی ڕێبازە ماددیگەراکانەوە کە نکووڵی سروش دەکەن، سەختیشە ئەو ویستەی ماددیگەراکان بێتە دی کە بریتیە لە ملکەچکردنی ئایین بۆ عەقڵ، بەڵکو ئایین سروشێکی ئاسمانیە و عەقڵیش پێناوێکە بۆ ڕوانینێکی سنووردار.

لە ئەورووپاشدا لەپێناو دژایەتی بیروباوەڕ و مەعریفەیەکدا کە کڵێسا پێشکەشی کردبوون ئەو دژایەتیە ڕوویدا، بێگومان ئەو بارگرژیە هزریەی کە دەیبینین مرۆڤایەتی دادەپۆشێت و ئەو ململانێیەی نێوان ڕێبازەکان بێ بوونی ڕێسا و سەرچاوەیەکی خاوەن دەسەڵات، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیردۆزەی کە پیلانە تلموودیەکان خستوویانەتە ڕوو کە دەڵێن تەنها عەقڵ خاوەن دەسەڵاتە و داوای ئەوە دەکەن عەقڵ خاوەن دەسەڵاتی هەموو ڕووداو و ئاڕاستەکانی ژیان بێت.

## ئیسلام و بیری ماددیگەری

هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە بیری ماددیگەری تەواو ڕوون و ڕاشکاوە، ئیسلام ڕێبازێکی تەواوکارە کە لەسەر هەردوو لایەنی ماددە و ڕۆح ڕاوەستاوە، ڕێبازی مەعریفەشی لەسەر پەیوەندی نێوان عقڵ و دڵ وەستاوە، ئیسلام لەسەر بڕوایەکی چەسپاو سەبارەت بە خوای بەدیهێنەری بوون و مرۆڤ وەستاوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر بونی خوا،

خوایەك كە جیهانی غەیبو بینراویشی داهێناوەو سروش و عەقڵیشی بەخشیوە بە مرۆڤ، سروش کە پەیوەستی جیهانی غەیبە، رونانین بۆ ئەو بوارەشی بە مرۆڤ بەخشیوە، عەقڵیش کە ئاسۆی روانین بۆ بەخششەکانی ژیانی بۆدەکاتەوە.

پێناسەی ئیسلام بۆ ماددە وایە کە ماددە دێرین نیە و هەمیشەییش نیە، خوای گەورە دروستی کردووەو بۆ وادەیەکی دیاریکراو دەیهێڵێتەوە. ئیسلام بروای بە بیرۆکەی صودفە و بیرۆکەی زەرورەت و بوونی بێ مەبەست نیە، ئەو زانستەش کە هەوڵیداوە نهێنی ژیان ئاشکرا بکات نەیتوانیوە شتێك بەدیبهێنێت، تەنها ئەرکێکی سەرەتاییشی ئەنجامداوە کە گەڕانە بەدوای رووکەشی شتەکاندا، بیردۆزەکانی زانستیش چەند ئەگەرێکین خراونەتەروو بۆ گۆڕان، چی بیردۆزەیەك زانست وتبێتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە توانای زانستدا نەبووە حەقیقەت بڵێت، چونکە بەو پێناوە سنووردارانەی بەردەستی نەیتوانیوەو ناتوانێت هەموو راستیەکان ئاشکرا بکات.

**عەلامە ئۆگست سبانیە لە کتێبەکەیدا(فەلسەفەی ئایین) دەڵێت:** ئەوەی زانایان سەبارەت بە زانست زانیویانە بەشێکی زۆر سنووردارە و لە ئاست ئەوەی کە نایزانن وەك نەبوو وایە.

**کامیل فلامریۆن دەڵێت:** زانایان نەیانتوانیوە پرسی بەردەوامی بوون چارەسەر بکەن، بۆیە ئەوان تەنها دان دەنێن بە زەروورەتی بوونی خوا و کاریگەری بەردەوامی تا بتوانن تەفسیری بەدوای یەکدا هاتنی کائینات بکەن و درك بکەن بە نهێنی بنەرەتی شتەکان.

لەراستیدا ملهوڕی زادەی زانست و عەقڵ نیە، بەڵکو زادەی دەروونە نەخۆشەکانە، دەرکەوتنی ملهوڕیش لەگەڵ بارگرژی دەروونی ئەخلاقیدا بووە، بیری ماددیگەریش لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا خوازراو بوو، دواتر زانست هات و ساختەی ئەو بیرەی تێکشکاند، ئەوەشی ئاشکرا کرد کە چەند لایەنێکی غەیبی هەن کە بەڵگەن لەسەر بوونی جیهانێکی تر، زانایانێکی زۆریش بە راشکاوی دانیان ناوە بە بوونی خوادا و لە دەیان توێژینەوەدا ئەوەیان باس کردووە، بەڵکو سەدان کتێبیان لەوبارەوە نووسیوە، بەڵکو فەلسەفەی ماددیگەری ئەمڕۆ هەوڵ دەدات ئاڵای ماددیگەری هەڵبکات نەك ئاڵای زانست، فەلسەفەی ماددیگەری لەگەڵ ئاییندا ناگونجێت بەڵکو دژ بە ئایینە.

موحەممەد فەرید وەجدی وا وەسفی ملهوڕی دەکات کە سەرکێشی بەداهەتی عەقڵە، چونکە بەداهەتی عەقڵ بوونی هێزێکی باڵامان دێنێتەبیر کە سەرچاوەی هەموو کەماڵێكو هەموو هێزێکی ئاسمان و زەویە، دیدی ملهوڕی لە نکوولیەوە هاتووە، نکوولیش بریتیە لە ئینکاری کردنی شتێك هاودەم بە بوونی زانیاری لەسەر ئەو شتە، بێگومان ئەوەش لە بنەرەتدا ەموکورتی مەعریفەیە، رارابیە لە قبوولکردنی راستیەکان، ملهوڕی سەرکەشیو بەخۆدانازین بە بڕێك لە زانست دێنێتە بوون، کەسی ملهوڕ وادەزانێت زانستی بە هەموو شتێك هەیە(فلما جاءتهم رسلهم بالبينات فرحوا بما عندهم من العلم).

ئەوانەی لە هەر سەردەم و کات و دۆخێکدا بانگەوازی رووخێنەریان پێیە ملهوڕی و گومانننانەوە و دوودڵ کردن دەکەنە چەکی دەست بۆ بەرنگاربوونەوەی لاوازی و نەفامی و کەمتەرخەمی و بۆشایی دەروونی گەلان کاتێك لە بەها و بنەرەتی فیکرییان دادەکەون، ئەوکات ئەو پەیامە

رووخێنەرانە دەتوانن دژەبکەنە دەروونەوەو دەرفەتی ژیان لەو دەروونانە-پەیدا بکەن.

**جیمس خیتر پاش توێژینەوەیەکی پەنجا ساڵی دەڵێت:** کێشە گەورەکانی زانست تەنها بوونی خوا چارەسەریان دەکات، هەروەها دەڵێت: ئەورووپ ئەمڕۆ وازی هێناوە لە خوای خۆی و بڕوای هێناوە بە خوایەکی نوێ کە ئەویش زانستە، بەڵام زانست کائینێکی سەراوژوور بووە، ئەمڕۆ نکوولی دەکات لەوەی کە دوێنێ دەیسەلماند، سبەینێش باس لە چەسپان و راستی ئەوە دەکات کە ئەمڕۆ نکووڵی لێ دەکات، بۆیە ئەوانەی زانست پەرستن هەمیشە لە رارایی و نائارامیدان.

ئیسلام پێی وایە زانست چەکێکی مەعریفەیە، بەڵام تاکە چەك نیە-لێرەوە هەڵەی ئەوانە دەبینین کە زانست بە تاکە پێناوی مەعریفە دەزانن و جگە لە زانست بە هیچ نازانن.

هەروەها ئیسلام پێی وایە زانست دەبێت بازنەیەکی هەبێت کە ئەویش بریتیە لە رەوشت، ئەگەرنا دەبێت بە دەرد بۆ مرۆڤایەتی، لێرەوە زانستی ماددی نابێتە رێبازێ بۆ مرۆڤ کە شوێنی ئاین بگرێتەوە، بەڵام بەشێکە و ئایینیش هەمووە، بەش و لقیش هەموو لەخۆناگرێت.

پێویستە زانست و فەلسەفەی زانست لەیەك جیابکەینەوە، راستی زانستی و بیردۆزە چنراوەکان بە شێوەیەکی زانستی بە ناوی فەلسەفەوە لەیەك جیابکەینەوە، یەکەیمان بڕێ راستی گشتین بۆ هەموو مرۆڤایەتی. بەڵام ئەوی تریان چەند بیردۆزەیەکی تایبەتن لە بەرهەمی عەقڵ و لە سایەی هەرەشەکانی دۆخەکەدا، لە هەموو ئەوانە گرنگتر ئەوەیە کە خودی ماددە یاسای سروشتی جەختی لێ دەکاتەوە، ئیتر ئەو رێبازە ماددیەی

ـروست کردووە کە ئەمڕۆ خودی زانست تێکیشکاندووە، نموونەی ڕەقی ـاددە بە بنەرەتی سروشت نەماوە، بەڵکو زانستی نوێ لایەنێکی گرنگی ـاسای سروشتی بۆ خستوونەتەڕوو و ئەوەی فێرکردوون بنەڕەتی سروشت ـریتیە لە جووڵە نەك ماددە، ناوکەکان بە شێوە جۆربەرجۆرە ـچووکەکانیانەوە دەجووڵێنەوەو شێوەی ماددی دەبەخشن بە شتەکان، ـەو ناوکانەی تریش بەپێی جووڵەیەکی ناو قەوارەی ناوخۆیان شێوە ـەگرن، ئەمەش ئاماژەیەکی گرنگە بۆ مرۆڤی سەردەم تا ساختەی ئەو ـووفاقیە بزانن کە دروستکراوانی خودا دابەش دەکەن بۆ دوو بەش و ـیوارێکی دوورگیری و بێدەنگی لەنێوانیاندا دروست دەکەن.[1]

لێرەدا چەند ڕاستیەکی بنەڕەتی هەن سەبارەت بە تێگەیشتن لە زانست و مرۆڤ:

**یەکەم**: زانست کاتێك لە مەیدانی زانستدا دەستی کرد بە گەڕان ڕێی دروستی خۆی گرتەبەر، بەڵام کاتێك لە مەیدانی کۆمەڵایەتی و دەروونیدا توێژینەوەی کرد ڕێی لێ شێوا، بۆیە ئەوەی پەیوەستە بە ماددەوە تەنها ئەوەیە کە ناوی زانستی لێدەنرێ، ئەوەش پەیوەست بە مەیدانی کۆمەڵایەتی و دەروونیەوە بریتیە لە فەلسەفە، سەرچاوەی هەڵەکەش ئەوەیە کە ماددە دەوانێت ملکەچ بێت بۆ پێوانە ماددیە زانستیەکان، بەڵام دەروونی مرۆیی ملکەچە بۆ چەند پێوەرێکی تر، چونکە مرۆڤ ماددە و ئاژەڵ نیە.

**دووەم**: هەرچیەك دەدرێتەوە پاڵ زانست هی زانست نیە و هەرچیش دەدرێتەوە پاڵی بەدوور نیە لە سەلمانی، وەك چۆن لە زانستدا ئەو

---

[1] - من بحث للدكتور عماد الدين خليل.

ڕاستیانە هەن کە هیچ گومانیان لەسەر نیە، هەروەها مەسەلەی واشی تێدایە کە سەلماندنی دەوێت، لێرەدا چەند ئەگەرێکی پووچ و بێ بنەما هەن کە کراون بە دڵنیا، ئەویش ئەوەیە زانستی نوێ لەسەر بەڵگەی هەستی بنیاد دەنرێت، ئەوەی بەناویەوە دەوترێت هەر دەبێت سەلماو بێت و بەڵگەی زانستی لەسەر بێت، ئەوانە هەموو شتێك قبووڵ دەکەن کە دەدرێتەوە پاڵ زانست چونکە بروایان وایە کە بەڵگەی لەسەرە، هەروەها زانست شتێکەو پەیڕەوکردنیشی بێ کەموکورت و هەڵە شتێکی ترە.

**سێیەم**: زانست نەیتوانیوە ڕاستیەکی هاوڕێی بزانێت و لێی تێبگات ە ئەویش بیتیە لە فیترەت، فیترەت لە مرۆڤدا ڕاستیەکی چەپاوە و هیچ هێزێ ناتوانێت ڕێرەوەکەی بگۆڕێت و جیایە لە زەمانە، خوای گەورە بڕیاری داوە کە سوننەتەکانی خوا لە بووندا هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نایەت، فیترەتی خواش کە خەڵکی لەسەر داناوە هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نایەت، شارستانیەت نەیتوانیوە لە فیترەت تێبگاتو هەمیشە لێی بێئاگا بووە، ئەمەش کەموکورتی و ناجێگیری شارستانیەت بووە، ئەگەریش زانست بیەوێت تاو بداتە ئەو مەیدانەی کە هی فیترەتە ئەوە دەبێتە سەرچاوەی هەڵەو شکستی، چونکە هیچ ڕێگەیەك نیە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە ڕێی زانستەوە ملکەچی ئەزموون و تاقیکردنەوە بکرێت.

# باسی چوارەم

# عیلمانیەت

بانگەواز بۆ عەلمانیەت لە ڕۆژئاوادا لە ئەنجامی ئەو ئاراستەیەوە دەرکەوت کە بزاڤی ڕۆشنگەری ئەورووپی بۆ جیاکردنەوەی دەسەڵاتی کڵێسا لە دەسەڵاتی حکوومەت ئاڵای عەلمانیەتی بەرزکردبوویەوە، یان بە نیازی دامەزراندنی چەند سیستمێکی نوێی سیاسی ناملکەچ بە دەسەڵاتی کڵێسا ببوویە ئاڵاهەڵگری عەلمانیەت.

بۆیە عەلمانیەت لە کرۆکدا بۆ لەناوبردنی سیستمێکی زاڵی ناو ڕۆژئاوا بوو، چونکە کڵێسا دەسەڵاتی سیاسی لەدەست بو و قەڵەمڕەوی خۆی دەسەپاند بەسەر حکوومەت و دەوڵەتەکاندا.

ئەو بانگەوازەش لە ئەورووپادا کەمێك پێش شۆڕشی فەرەنسا لە بواری ئازادبوون لە دەسەڵاتی ئایین و کڵێسا گەشەی سەند تا ڕێبازێکی نوێی دابمەزرێنێت کە بنەرتەکەی بوونی دەوڵەتی نوێ بوو تا لەو دەوڵەتەدا هەواداری بۆ کڵێسا لاببات و بیدات و بە دەوڵەت، ئەو بیرەشیان لە مەسیحیەتی ڕۆژئاواییدا دەگێڕایەوە بۆ بیرۆکەیەکی بنەرەتی وتەی سەید مەسیح کە دەڵێت: ئەوەی هی قەیسەرە وازی لێ بێنە بۆ قەیسەر و ئەوەی هی خوایە وازی لێ بێنە بۆ خوا، مەملەکەتی من لەم جیهانەدا نیە)، بۆیە واتایەکیان وەرگرت کە لەسەر ئەو بنەرەتە وەستاوە مەسیحیەت لە بواری ئەخلاقدا بڕێك وەسیەت و ئامۆژگاری هەیە، کاتێ مەسیحیەت گوازرایەوە بۆ ئەورووپا سیستمێکی زاڵی سیاسی بەدیکرد کە ئەویش ئیمپراتۆریەتی

رۆمانی بوو کە وێنەیەی تەواوی یاسا و دەوڵەتداری خۆی هەبوو و بەسەر کۆمەڵگەشدا رەنگی دابوویەوە.

بەڵام ئیسلام تەواو لە مەسیحیەت جیایە، چونکە ئیسلام سێ لایەنی تەواوکاری یەکدی لەخۆدەگرێت(بیروباوەر، شەریعەت، ئەخلاق)،هەر لەیەکەم هەنگاویشەوە لەسەر ئەم رێبازە تەواوکاریە کۆمەڵگەی خۆی پێکهێناوە، پێغەمبەرەکەشی هەم پێغەمبەر بووە و هەم سەرۆك و دادوەر و رێبەر بووە.

لێرەوە بواری بەراوردکاریەکە جیاوازە، وێڕای ئەوەی بواری پەیڕەوی سیستمی رۆژئاوایی کە لەسەر علمانیەت و جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت وەستاوە تەواو جیاوازە، ئەگەر سەیرێکی مێژووی ئەورووپا بکەین دەبینین هەرچەندە مەسیحیەت بنەمایەکی نوێی هێنا کە لە سەردەمانی پێشوودا نەبوو کە جیاکردنەوەی ئایین بوو لە دەوڵەت، بەڵام لە راستیدا ئەو بنەمایە پەیڕەو نەکرا، چونکە دوای ئەوەی بازنەی مەسیحیەن لە رۆژئاوادا فراوان بوو خێرا مەسیحیەت دەسەڵاتی خۆی سەپاند بەسەر دەوڵەت و حکوومەتەکاندا.

دکتۆر عەبدولحەمید موتەوەلی دەڵێت: مەسەلەی جیاکردنەوەی دەسەڵات شتێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو هەردوو ئیمپراتۆریەتی رۆمانی رۆژهەڵات و رۆژئاوایش ماوەیەکی زۆر بەریان دەگرت بە دارمانی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئایینی نەبادا قەڵەمڕەوی خۆیشیان دابڕمێت، بەڵکو زۆربەی

پاپاکان هەوڵیان دەدا هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و سیاسیشیان لەدەستدا بێت.[1]

پاشاکانی دەوڵەتی رۆمانی پاش ئەنجامدانی بۆنەی ئایینی لەلایەن رەهبانەکانەوە ئینجا کورسی دەسەڵاتی ئیمپراتۆرییان وەردەگرت و پاپایش تاجی ئیمپراتۆری دەنایە سەریان.

لێرەوە هەنگاوی پاشاکان بۆ ئەوە بوو رزگاریان بێت لەدەست دەسەڵاتی پاوانی ئایینی، ئەمەش بە بانگەواز کردن بۆ بیری(راسپاردەی خوایی) بەو بانگەشەی گوایە راستەوخۆ دەسەڵاتیان لە خواوە وەرگرتووە نەك لە پاپاکان.

پاشان شۆڕشی فەرەنسی هات و هەوڵیدا ئەو راسپاردەییە لە مافی خواییەو بۆ پاشاکان ببات بۆ حەقی خوایی بۆ گەل.[2]

دیارە ئەو سیستمانە لە ئیسلامدا نەبون و ئیسلامیش کاریگەر نەبووە پێیان، چونکە ئیسلام هەر لە رۆژی یەکەمیەوە لەسەر بنەمای پێکەوەبوونی ئاین و دەوڵەت و لەیەك جیانەکردنەوەیان هاتووە.

بێگومان کاریگەری تەواوکاری نێونا ئەو بەشە لە ئیسلامدا و جیاکارییان لە رۆژئاوادا ئەنجامی قووڵی هەبوو لە کۆمەڵگەو لە مێژووشدا، دیارە ئیسلام سیستمێکی تایبەتی نیە کە پیاوانی ئایینی بیگرنەدەست بەڵکو لە بنەرەتیشدا دان نانێت بە شتی وادا، لە ئیسلامدا نێوەندبوون لە

[1] – ئەمەش ئەوەیە کە پێی دەوترێت دەولەتی سیۆقراتی کە ئەورووپا هەیبووە بەڵام ئیسلام شتی وای قبوولْ نیە و نەیبووە.

[2] – أزمة الفكر الإسلامي للدكتور عبدالحميد متولي.

نێوان خودا و بەندەدا نیە، بۆیە لە مێژووی ئیسلامیدا وێنەی ئەو قۆستنەوە ئاینیە نابینین کە لە رۆژئاوادا هەبوو، چونکە ئیسلام نکوولّی دەکات لەوەی پێی دەوترێت مافی خودایی یان کارپێسپاردنی خودایی.

مێژووی ئەورووپا لە سەردەمی نوێدا راستیەکی مێووی ئاشکرا دەکات کە چەندین مەسەلەی زۆری رووداوەکانی ئەو مێژووە لەخۆدەگرێت کە ئەویش بریتیە لە هەولّی بێوچانی جوولەکە بۆ خستنی ئەو بەربەستانەی کە مەسیحیەتو دەولّەتە مەسیحیەکانی ناو ئەورووپا سەپاندبوونیان و لەکارخستنی ئەو کۆتانەی کە پەیوەست بوون بە هاوسەرگیری و جلو بەرگ و پەرستشەکانەوە، چونکە ماوەیەکی زۆر بوو بەربەست بوون لە نێوان جوولەکە و مافی هاولاّتی بوونیان لە کۆمەلّگە ئەورووپیەکاندا.

بۆیە رێکخراوە ماسۆنیەکان هەولّیانداوە چالاکیەکی گەورە بێننە مەیدان کە ئامانجی رووخاندنی ئەو حکوومەتە مەسیحیە رۆژئاواییانە بێت کە کلّێسا زالّە بەسەریاندا، هەروەها بە نیازی دامەزراندنی چەند حوومەتێکی نوێی ئازاد لەو کۆت و بەندانە، بۆیە شۆرِشی فەرەنسی یەکەم هەنگاوی رێی ئەو ئامانجە بوو، بەدوایدا چەند شۆرِشێکی تر هاتن لە ناوچە جیاجیاکانی ئەورووپادا کە توانییان ئایین و دەولّەت لەیەك جیابکەنەوە. ئەوەش یەکەم پایەی جیاکردنەوەو دوورخستنەوەی قەلّەمرەوی کلّێسا بوو لە دەسەلاّت، پاشان بەرنامەی خوێندنی رۆژئاوایی کرا بە بەرنامەیەکی عەلمانیو دوورخرایەوە لە قەلّەمرەوی کلّێساکان کە پێشتر بواری پەروەردەو فێرکردن لەدەستیاندا بوو، لە ئەنجامی ئەمەشدا رووخاندنی هەموو ئەو کۆت و بەربەستانە هاتەدی کە مەسیحیەت سەپاندبووی بەسەر جوولەکەداو نەیدەهێشت جوولەکە مافی هاولاّتی بوونی هەبێت، ئەوەش پەیامی سەردەمی رۆشنگەری بوو، یان ئەو هەلّمەتە رۆشنگەرییەی کە بە

وتەی کانتی فەیلەسووف ڕزگاربوونی مرۆڤ بوو لە ویصایەی ئایینی، لێرەوە سەردەمی ڕۆشنگەری جەختی دەکردەوە لە جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و دامەزراندنی چەند حکوومەتێکی نوێ لە هەموو بەشەکانی ئەورووپادا، بەوجۆرە جوولەکە پاش ئەو هەموو دابڕانە تێکەڵ بوون بە کۆمەڵگەی ئەورووپی، یەکەم بڕیاری یەکەم حکوومەتی عەلمانی لە ئەورووپا هی کۆمەڵەنی نیشتیمانی فەرەنسی (١٧-٩-١٧٧١) بوو کە جوولەکە دانیشتووەکانی ناو فەرەنسای بە هاوڵاتی دانا کە بەوپێیە هەموو ماف و ئەرکێکی هاوڵاتیبوونیان دەبێت.

بۆیە عەلمانیەت ئەو شمشێرە بوو کە جوولەکە بەو شمشێرە هەموو ئەو کۆت و بەندانەی پچڕاند کە جوولەکەی لە کۆمەڵگەکان جیادەکردەوە و نەیدەهێشت دەستڕۆیی تلموودی هەبێت، ئەمەش بە ڕوونی لە چەندین ماوەی مێژوویی مێژووی هاوچەرخی ئیسلامیدا دەبینرێت، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە سیستمی دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتە عەرەبیە نوێکانەوە.

جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت لە بیری ڕۆژئاوای مەسیحیدا شتێکی نامۆ نیە، لەوەشەوە ئەو عەلمانیەتە توانی دابمەزرێت کە گەورەترین پایەی قەڵەمڕەوی تلموودی بووە لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاواییدا.

**دکتۆر فاورقی دەڵێت:** پێویستە ئەوەمان بیر بێت ئازادبوونی جوولەکە تەنها بەهۆی گەشەسەندنی عەلمانیەتەوە بوو لە سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا، واتە دوورخستنەوەی ئاین لە سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی کە بووە هۆی ئەوەی بەرژەوەندی گشتی و ئەزموون بەرهەمهێنان و جەماوەری بوون بکرێتە بنەڕەتی هەموو هەڵسوکەوت و

ڕێکخستنێك، لێرەوە لەسەر بنەمای توانای شەخسی جوولەکەکان قبووڵ دەکران.

عەلمانیەت بیردۆزەیەکە کە زادەی ئەزموونی مەسیحیەتە نەك ئەزموونی جوولەکەیی، مەسیحی ئەورووپی ژیانی خۆی دابەش کردبوو بۆ چەند بازنەیەکو لەنێوان ئەو بازنانەدا چەند بەربەستێکی دانابوو بۆ بەرگرتن بەهەر پەیوەندیەك، لە هەر یەك لەو بازنانەدا ژیان بەپێی چەند یاسایەکی تایبەت بەڕێوەدەچێت کە بازنەیەك هیچ پەیوەندیەکی نیە بە ڕووداوەکانی بازنەکانی ترەوە.

بۆیە خێزان و ڕەوشتی شەخصی و ئایین و ئابووریو سیاسەتو کۆمەڵایەتی، هەمو ئەمانە مەلەکوتێکی سەربەخۆ پێکدەهێنن، هاوار سەد هاوار ئەگەر مەسیحیەتی ڕۆژئاوایی ڕێ بدات بەوەی بنەماکانی ئایین سنووری خۆیان لە کاریگەری مەیدانی ئابووریدا ببەزێنن.

لە ڕاستیدا عەلمانیەت تەنها داننانێکە بەوەدا کە هیچ بنەماو ڕێبازێکی گشتی نیە کە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ بگرێتەوە، هەروەك ئەوەی لە بیری ئایینیدا هەیە، بەمەش هەر بازنەیەکی ژیان بنەمای تایبەتی خۆی هەیە.

بێگومان ئەم تێگەیشتنە ڕۆژئاواییە تەواو جیاوازە لەو تێگەیشتنە ئیسلامیەی کە تەواکار و گشتگیرە و هەموو بوارەکانی ژیان دەخاتە یەك بازنەی یەکگرتووەوەو دان نانێت بە جیاکردنەوەی بەها و مەفهوومەکان، بەڵکو پێی وایە ئەوانە تەواوکەری یەکترین و هەرکامیان کاردەکاتە سەر ئەوی تریان.

هەندێ لە توێژەران هۆکاری سەرکەوتنی بیری عەلمانیەت لە ەورووپادا دەگێڕنەوە بۆ کەمڕەوی دیدی ئایینی بەرامبەر بە ڕەوتی شارستانیەتی سەردەم، ئەو واتا ئایینیانەی کە بەرنگاری بیری هاوچەرخی ڕۆژئاوایی بوونەوە نەیانتوانی رابوەستن، چونکە بیری نوێلەسەر بنەمای زانست و عەقڵ وەستابوو، ئەمە وایکرد هەندێ بیریار و فەیلەسووف ئایین وەك تلیاکی گەلان وەسف بکەن یان پێیان وابێت ئایین تەنها بۆ ڕێکخستنی باری گەلانی سەرەتایی گونجاوە، دیارە پاوانی ئایینی لە ڕۆژئاوادا نەیار و بەربەستی بەردەم ڕێبازە زانستیەکان بوون و دژایەتی بەرهەم و ئەنجامەکانی زانستیان دەکرد.

بەڵام ئەو دیدەی بوویە هۆی سەرکەوتنی عەلمانیەت لە ئەورووپا سەبارەت بە بیری ئیسلامیو جیهانی ئیسلامیش تەواو جیاوازە، چونکە تواوێتی واتای ئیسلامی بەربەستی بەردەم ئەوە بووە، ئیسلام خۆی بەهێزترین پاڵنەری بەردەم زانستو پێشکەوتنە، بازنە فراوانە نەرمەکەشی توانای ئەوەی هەیە هەموو پێناو و هۆکارێکی سەردەم و شارستانیەت قبووڵ بکات.

لێرەوە نەگونجاو و مەحاڵە موسڵمانان بکەونە هەمان بارەی کە بیری ڕۆژئاوایی تێیکەوت، سەبارەت بە ئەو بارگرژەیش کە بەهۆی قەڵەمڕەوی داگیرکاریەوە هاتووە و بە زۆر عەلمانیەت سەپێنراوە بۆ جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت، ئەوە قۆناغێکی کاتیەو بە نەمانی هۆکارو پاڵنەرەکانی ئەویش نامێنێت، ئێستا لە ڕۆژئاوادا ئەوە ڕوون بوەتەوە کە هەوڵی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵە هەوڵگەلێکی دروست کراون.

**دکتۆر موحەممەد ریزوان دەڵێت:** دەوڵەتی عەلمانی و کۆمەڵگەی عەلمانی لە ڕۆژئاوادا تەنها شێوەیەکی وێنەییەو دەوڵەتانیش دەستبەرداری ئاینیان نەبون، بەڵکو تا ئێستایش ئایین قەڵەمرەوی خۆی هەیە، ڕێنماییە ئایینی و ەخلاقیەکان لە شێوەی دەرەکیاندا گۆڕاون و جۆرێك لە کرانەوەو لێبوردەییان وەرگرتووە، پیاوانی ئایینی ئەورووپاش ئوەیان زانیوە کە پێویستە بەرگێکی هاوچەرخ بکەن بەبەری ئایین و نەریتە ئایینیەکانیاندا، ئەمە واتە عەلمانیەت نەیتوانیوە ئایین تەنها لە تاکدا بەرتەسك بکاتەوە و نەیشیتوانیوە نەوەکانی دەست و تاقمە یاجیاکان کە لە یەك وڵاتدا دەژین وا لێبکات هەست بە بوونی برایەتی نێوانیان بکەن لە نیشتیماندا جیا لەوەی کە برای ئایینی یەکترن، بۆیە ناکرێت بڵێین عەلمانیەت لە بەدیهێنانی ئامانجیدا سەرکەوتوو بووە، ئەو ئامانجەی کە بریتیە لە دروستکردنی چەند دەوڵەت و کۆمەڵگەیەککە تیایدا ئایین لەسەر ئاستی تاك بەرتەسك بکرێتەوە، سەختە بۆ عەلمانیەت لە وڵاتێکدا سەرکەوتوو بێت کە تیایدا بیری ئایینی بێدار بێت، دیارە ئەمڕۆ هەستی ئایینی لە وڵاتانێکدا کە بەرەسمی ملهوڕی هەیە بە تەواوەتی نەرووخاوە.

دکتۆر فازل جەمالی دەڵێت: عەلمانیەتی ئەمڕۆ بزاڤێکی ڕەجعیەت و بۆ دواوە گەڕانەوەیە، ڕەجعیەت لە ڕووی مێژووییەوە، چونکە ئەو بارودۆخەی کە تیایدا عەلمانیەت خوازراو بوو نەما، هەروەها ڕەجعیەت لەڕووی ئەوەوە دەوڵەت وا لێبکات گرنگترین ئەرکی خۆی پشتگوێ بخات کە ئێمە بروامان هەیە بە پێویستی دامەزرانی دەوڵەتێکی مەدەنی لە وڵاتانی ئیسلامیدا کە گرنگی بدات بە ژیانی ماددی و ڕۆحی مرۆڤ، ئەمە ئەو شتەیە کە پێویستە دەوڵەت گرنگی پێ بدات.

ئێمە پێمان وانیە عەلمانیەت ئامانجەکانی خۆی لەو وڵاتانەدا بەدیهێنابێت کە تیایاندا عەلمانیەت پەیڕەو کراوە، بەڵکو چەندین ناتەواو و ناتەبایی روونی تووش بووە بەتایبەت لە مەیدانی خوێندندا.

هەروەها دکتۆر فازل جەمالی لایەنەکانی بەراوردکاری نێوان وڵاتانی ئیسلامی و ڕۆژئاوا لە بواری عەلمانیەتدا دەخاتڕوو و دەڵێت: لەوانەیە پەیڕەوی عەلمانیەت لە وڵاتانی ڕۆژئاواییدا ئاسانتر بێت تا لە وڵاتانی ئیسلامیدا، چونکە مەسیحیەت تەشریعاتێکی فراوانی نیە کە کار بکاتە سەر ژیانی کۆمەڵایەتی و کڕین و فرۆش و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی تاك و کۆمەڵ، بەڵام ئایینی ئیسلام وێڕای ئەوەی بیروباوەڕ و پەرستش و ئەخلاق لەخۆەگرێت، هاوکات نیزامێکی گشتگیری هێناوە کە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە هەر لە بێشکەوە تا ناو گۆڕ، ئەو نیزامەش لەگەڵ سروشتی ژیانی مرۆییدا گونجاوە.

چەندین زانای شەریعەت لە جیهاندا گرنگی شەریعەتی ئیسلامییان خستوەتەروو کە چۆن کۆگایەکی گەورەی هەیە و توانای هەیە لەئاست بارودۆخەکاندا بوەستێت، یادانانی یاسای مەدەنی نوێ لە میصر و سووریا و عێراق لە سەر چەند بنەمایەکی ئیسلامی بەڵگەی ئەوەن.

ئەگەر عەلمانیەت بەشێوەیەکی گشتی بۆ گەلانی ئیسلامی گونجاو نەبێت،[1] ئەوا بۆ عەرەبەکان بە شێوەیەکی تایبەتتر گونجاو نیە، چونکە عەرەب قەرزاری ئیسلامە لە پێکهاتەی ژیاری خۆیدا، عەرەب بوون سەرەتا

---

[1] - لێرەدا ئاماژە دەدات بە ئەزموونی تورکیا کاتێ گەل بەرنگاری بنەمای عەلمانیەت بوونەوەو قبوڵیان نەکرد و لەبەر خواستی گەلی تورکی توانرا زیاد لە هەزار مزگەوت لە گوندە تورکیەکاندا دروست بکرێت.

ئالای ئیسلامیان هەڵگرت بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بۆیە جیاکردنەوەی دین و دەوڵەت واتە داماڵینی دەوڵەتی عەرەبی لە بنەرەتەکانی خۆی.

بۆیە هەرکات عەرەب لە ئیسلام و پەیامی خوا جیابکرێتەوە ئەوە عەرەب دەبێتە جەستەیەکی جیابووە لە ژیان و ڕۆح، ئیتر ئەو جیابوونەوەیە جەستە دەکاتە پارچەیەکی وشکی مردووی بێ کرۆك، ئیتر هەر بنەماو ڕێبازێکی تر بە ئاسانی دەتوانێت بچێتە ئەو بۆشاییەوە.[1]

بانگخوازانی مادديگەری ڕێبازی عەلمانیەت وا تەفسیر دەکەن کە یەك ڕوانینی هەیە بۆ هەموو ئایین و ڕۆشنبیریو گەلەکان، ئەمەش هەریەك لە چەمکی ئومەمیەتو جیهانیبوونی لەخۆگرتووەو ئامانجیش لێی لەناوبردنی گیانی ئایینو نەتەوایەتیو پەیامی گەلانە، ئەو پەیامەی کە لەسەر بنەمای بیرو ڕۆشنبیری پوختی گەلان وەستاوە.

شتێکی مەحاڵە گەلو دەستەیەك ئەو ڕوانینەیان هەبێت بۆ ئایین و ڕۆشنبیریەکان، بەتایبەت ئەگەر لە هەڵوێستی دژایەتی لەگەڵ داگیرکەرو دوژمندا بن، چونکە دوژمن لەو کاتەدا هەر پێناوێك دەگرێتەبەر بۆ لەناوبردنی ڕۆشنبیری موسڵمانان و چاوپۆشی لە بەهاکانیان و نانەوەی گومان لەسەر بنەرەتەکانیان، بێگومان هەڵوێستی وایش پێچەوانەی هەموو ئەو بنەما سەرەکیانەیە کە گەلانی لەسەر وەستاون، بەتایبەت سەبارەت بە موسڵمانان کە لای ئەوان ئیسلام واتایەکی زیاتر لە بیروباوەڕ یان لاهووتی پێیە، بەڵکو ئیسلام بۆ موسڵمانان بریتیە لە ڕێبازی ژیان و سیستمی شارستانیەت و ڕێبازی ڕۆشنبیری، بۆیە هەرگیز دژایەتی ئەمانە لای موسڵمان قبووڵ نیە و ئەوەی پەیمانگە موژدەبەری و ناوەندە ماسۆنی و

---

[1] – محمد فاضل الجمالي: الدعوة إلى الإسلام.

رۆژهەڵاتناسیەکان پێشکەشی دەکەن بۆ دارماندنی بنەرەتەکانی ئوممەتان و تواندنەوەیان لە قەوارەیەکی گەورەی بەهێزداو تەنگپێهەڵچنینیان لەپێناو لەناوبردنی خودێتی و پاڵپشتەکانیان لای موسڵمانان وەرنەگیراوە.

دیارە یەکێك لە مەترسیدارترین ئەو بوارانەی کە ئاراستەی عەلمانی لە سایەی قەڵەمڕەوی داگیرکاریدا لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا کار لەسەر کردووە خۆی دەبینێتەوە لە بانکەکانو یاسا دانراوەکانو بوارەکانی خوێندنو رۆژنامەگەریو رۆشنبیریو پەروەردە، خوێندنگە موژدەبەریەکانو زانکۆکانیان کاریگەری زۆریان هەبووە لەو ئاراستەیەدا، ئەمەش ئامانجی بنەڕەتی بووە بۆ دارماندنی بەها ئیسلامەیکانو دوورخستنەوەی دڵو دەروونەکان لە بەها ئیسلامیەکانو دروستکردنی پاشکۆیەی هزریو سیاسیو تەشریعیو کارگێڕیو فێرکاری.

دکتۆر موحەممەد بەهی لە باسکردنی ئەو ئامانجەی داگیرکاریو رۆژئاواگەریدا دەڵێت: هیچ دەرفەتێکیان نەما بۆ بە پاشکۆکردنی موسڵمانان بۆ خۆیان مەگەر بەوەی ئاراستەی عەلمانیەت زاڵ ببێت، چونکە ئەوە دەبێتە زامنی دوورخستنەوەی ئیسلام لایان لە بواری ئاراستەکردن و ژیانی گشتی و بەرتەسککردنەوەی لە پەرستشدا، پاشان موسڵمانان بەرەو شارستانیەتی رۆژئاوایی و پاشکۆلوونی رێبەری سیاسەتی رۆژئاوایی دەبات، بۆیە ئاراستەی عەلمانی بنەرەتە بۆ لەرزاندنی بەهاکانی ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی نەك داگیرکاری راستەوخۆی، چونکە ئەم پەیامە هەر شێوەیەکی بڕوابوون بە خوا و پەرستش بۆ خوا بەرپەرچ دەداتەوەو لەسەر ئەو بنەمایە وەستاوە کە ئایین لە کاروباری دەوڵەت دوربخرێتەوە بەتایبەت لە بواری پەروەردەی گشتیدا، ئەم ئاراستەیە لە رۆژئاوادا بەهۆی دەسەڵاتی زاڵی کڵێسای کاسۆلیکی یان دەوڵەتی

ڤاتیکانەوە نەیتوانی بە تەواوەتی پەیڕەو بێت، چونکە کڵێسا چووبووە بەشەکانی دەوڵەتەوە بەتایبەت لە لایەنی سیاسیدا، ئەویش بە دامەزراندنی حیزبە دیموکڕاسیە مەسیحیەکان تا پەیڕەوی سیاسەت بکەن، بەوەش ئاراستەی عەلمانی لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا نەبووە مەترسی بۆ سەر ئایین، کورتەی قسە ئەوەیە عەلمانیەت ئامانجێکی صەهیۆنیە کە دەرفەت لەبەردەم هێزە تلمودیەکاندا دەکاتەوە تا دەسەڵاتی خۆیان زاڵ بکەن و ئامانج و نیازەکانیان بسەپێنن.

دەکرێت بڵێین ئەو ڕێباز و بانگەوازانەی ئێستا دەخرێنەڕوو بۆ بیری مرۆیی لە ڕاستیدا زانیت نین بەڵکو فەلسەفەن، چونکە زانست بە تاقیگەکانەوە هەنگاوی خۆی دەنێت، بەڵام ئەم بیردۆزانە فەلسەفەن و فەلسەفەکانیش ئەگەرن.

فەیلەسووف بۆی هەیە لە واقیعی کۆمەڵگەکەیەوە بە ویستی خۆی چەند ئەگەرێك دابنێت، یان ڕوانینی دەروونی خۆی بکاتە سەرچاوە، یان ئارەزووەکانی سەرچاوە بن، بنەڕەت و ڕاستی لە بیردۆزەدا نیە بەڵکو لە جێبەجێکردن و پەیڕەودایە.

ئەفلاتۆن بیردۆزەی کۆماری خستەڕوو و دەرفەتی تەواویشی بۆ ڕەخسا تا پەیڕەوی بکات، دەی ئایا توانی هیچی بەدیبهێنێت؟یان لە هەردوو جاردا کە پەیڕەو خرایەڕوو شکستی لێکەوتەوە؟

هەروەها چەندین بانگەوازی کۆن و نوێ هەن کە چل یان چەنجا ساڵیان بەسەردا تێپەڕ بووە، ئایا توانیویانە ئەو کۆمەڵگەیە بهێننەدی کە ئایدۆلۆجیاکانیان وێنایان کردوون وەك ئەوەی خەونی بەختەوەری نەوەکان بێت؟

لێرەوە جیاوازی گەورەی نێوان ئەو بیردۆزانەو بەخششەکانی ئایینەکان دەکەین کە دامەزرانی چەند کۆمەڵگەیەکی پێگەیشتوو لەچەند ساڵێکی کەمیان پێکەش کردووە کە توانیویانە ئاشتی و دادپەروەری بەسەر هەموو جیهاندا بڵاوبکەنەوە، ئەمە وێڕای ئەوەی ئەو ڕێبازە فەلسەفیانەی خراونەتەروو بۆ پەیڕەو دوای چەند ساڵێکی کەم چەندین گۆڕانکارییان تێداکراوە و کەم‌و زیادیان تێدا ئەنجام دراوە.

لێرەوە دەردەکەوێت ناکرێت دیدی پوختی فەلسەفی ببێتە بنەرەت بۆ بیری ئیسلامی و تەنها لە ڕێی سروشەوە دەتوانین بگەین بە ڕاستیە یەکەمیەکان، فەلسەفەش هاوڕێزی سروش نیە.

بێگومان زۆربەی ئەو فەلسەفانەی کە بیریارانی سەردەم بانگەوازیان بۆ دەکەن لە بنەرەتدا ماددین، بۆیە لەسەر بنەمای بڕوابون بە خوای تاك و تەنها نەوەستاون، بەڵکو هەوڵ دەدەن لە مەسەلەی ئولوهیەتدا قسە بکەن و مادده یان مرۆڤ یان سامان بکەن بە خودا، هەیانە ئارەزووە سێکیسەکان دەکاتە بازنەی خوێندنەوەی بوون.

چەند ڕێباز و بیروباوەڕێکی تر هەن کە لە نێوان شیرك و دوانەخوایی و فرەخوداییدا دێن و دەچن، ئەوەش تنها ئیسلامە کە تیایدا بیروباوەڕی یەکخواپەرستی تەم‌و مژی لەسەر نەماوەو ڕوون باسکراوە.

بێگومان ئەو فەلسەفانە هەموویان دژ بە ئیسلامن لەبەر ئەوەی ئیسلام هەڵگری پەیامی یەکخواپەرستی پوختە، بۆیە بە مەبەست هێرشی کراوەتە سەر تا بتوانن ڕیشەی ببڕن و بوونی نەهێڵن، لەو هەڵانەی ئەو ڕێبازانە ئەوەیە کە دەڵێن: ئایین تەنها قۆناغێکی ژیانی مرۆیی بووە، یان ئیسلام ئەڵقەیەکی مێژوویی بووە، بەڵام بێگومان ئایینداری فیترەتە و ئیسلامیش

چەسپاو و پتەو لە ناو مرۆڤایەتیدا تەواوی کاریگەری خۆی هەبووەو تا ئەمڕۆش هەیەتی و لە داهاتویشدا دەیبێت، ئەمڕۆ ئیسلامە بوەتە بەربەستی بەردەم بتپەرستی و ملهوڕی و ماددیگەری.

سەرچاوەی هەموو ئەو هەڵانەی لە لێکۆڵینەوەکانی پەیوەست بە مرۆڤدا دەکرێن ئەوەیە کە لەسەر بنەما روانینێکی ناتەواو دامەزراون ئەویش ئەوەیە پێیان وایە مرۆڤ جەستەو ماددەیەو بەس، بۆیە چی چارەسەر دادەنرێت بۆ کێشەکانی مرۆڤ هیچ ئەنجامێ بەدیێ ناهێنن‌و خواستە دەروونیەکانی مرۆڤ ناهێننەدی، چونکە بێئاگان لە یاسا سروشتیەکانی دروستبوونی مرۆڤ کە لە رۆح‌و ماددەش دروستکراوە، بێگومان گرنگی دان تەنها بە جەستەی مرۆڤکە لە شارستانیەتی نوێدا هەیە گورزی سەختی لە خودی مرۆڤ وەشاندووە، بێگومان ئەو مەعریفە خواناسیەی کە پەیامە ئاسمانیەکان هێناویانە زۆر قووڵتر تێگەیشتنیان هەبووە بۆ مرۆڤو ئاسۆیان فراوانتر بووەو گشتگیرتر بون‌و راستی مرۆڤیان خستوەتە بەردەم مرۆڤو بۆ چارەسەری کێشەکانیشی رێی راستیان نیشان داوە.

تا ئێستاش مرۆڤایەتی لە رێبازی خوایی هەڵگەراوەتەوەو بەدوای ئارەزووەکانی خۆیدا هەنگاو دەنێت، بۆیە ناگات بە حەقیقەت، چونکە ئەو رێبازە جۆربەجۆرانە یان پێیان وایە مرۆڤ تەنها رۆحەو بەس، یان پێیان وایە مرۆڤ تەنها ماددەیەو بەس، هەردوو راکەش هەڵە و نادروستن، تا ئێستاش مرۆڤایەتی لەو دوو رێبازەدا رێی خوای نەگرتوەتەبەر و وێڵ دەڕوات بێ ئەوەی کبات بە ئامانجێك، مەگەر ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ واتای رەسەنایەتی تەواو کە رۆح و ماددەش پێکەوە باس دەکات، هەر ئەم رێبازەشە کە لە هەڵە دووری دەگرێت‌و بەرەو حەق‌و راستی رێنموونی دەکات.

# باسی پێنجەم

# جیهانیبوون

ئەمیرال ولیام گاری کار لە کتێبەکەیدا(أحجار علی رقعة الشطرنج) بیری بانگەوازی جیاهنیبوون دەگێڕێتەوە بۆ پیلانە جوولەکەییەکان و صەهیۆنیەتی جیهانی، ئەو بانگەوازەش لە چەند شێوەی جیاجیادا خۆی دەنوێنێت تا ئامانجی حەقیقی خۆی بشارێتەوە، بۆیە جار هەیە بە یەکبوونی مرۆیی ناودەبرێ، جار هەیە بە یەکبوونی شارستانیەت یان یەکبوونی رۆشنبیری جیهانی یان حکوومەتی جیهانی ناو دەبرێت، هەموو ئەمانەش بۆ یەك ئامانجن.

دەستەواژەی یەکبووی رۆشنبیری جیهانی شێوە رازێنراوەیە، بەڵام لە ناوەڕۆکیدا دەمارگیری و بەکەم دانانی رۆشنبیریە مرۆییەکانی لەخۆگرتووە، کرۆکی بانگەوازەکە دەستڕۆیی رۆشنبیری و ژیاری رۆژئاواییە بەسەر رۆشنبیری و شارستانیەتی گەلانی تردا بەتایبەت زاڵکردنی بەسەر رۆشنبیری و هزری ئیسلامیدا.

ئەم بانگەوازە بوونی خۆی لە مەنتیقێکی هەڵەوە وەرگرتووە و لە مونتەلەقێکی داگیرکاریەوەیە کە ناوی لێنراوە(پەیامی پیاوی سپی بۆ جیهانی رەنگ جیا)، ئامانجی مۆڵدراوی پشت ئەم بانگەوازەش بریتیە لەوەی خەڵکی بکاتە هەواداری رۆژئاوا و ببنە کۆیلەی دەسترۆیی ژیاری رۆژئاوایی و بیری ئیسلامیش لەو نێوەندەدا بتوێتەوە یان تواناکانی بە

چەند واتا و بەهایەك تەنگیان پێهەڵچنرێت کە لە کرۆکدا جیاواز بن لە بەها ئیسلامیەکان و سەرچاوە رەسەنەکانی.

هنریك رالف لە کتێبەکەیدا (مرۆڤایەتی و نیشتیمان پەروەری) پرسیار دەکات ئایا راستە گەلانی لاوازی مافخوراو بۆیان باش بێت دیدی مرۆیی بگرنەبەر و قوربانی بدەن بە دیدی نیشتیمان پەروەرییان؟ هنریك رالف پێی وایە دیدی مرۆیی پێویستە تەنها لەلایەن گەلە بەهێزەکانەوە وەربگیرێت، بەڵام گەلە لاوازەکان لەلایەن گەلە بەهێزەکانەوە داماڵراون، هەروەها پێی وایە پاڵپشتانی سیاسەتی جیهانیبوون سەرمایەداران و ئەو چاوچنۆکانەن کە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بازارگەرمی بۆ دەکەن تا دەسەڵات و قەڵەمڕەوی خۆیان بسەپێن بەسەر گەلانی مافخوراودا.

دەنگی بانگەواز بۆ جیهانیبوون لە میصر و جیهانی ئیسلامیدا لە ساڵانی سیەکانی سەدەی بیستەمدا بەرزبوویەوە و کەسانی وەك سەلامە مووسا و چەندینی تر بوونە ئاڵاهەڵگری ئەو بانگەوازە، دواتر ئەو ئامانجانەی دەرکەوتن کە لە پشتەوە پیلانە تلموودیەکان دایاننابوون بۆ دەستگرتن بەسەر جیهاندا.

زۆرێك لە توێژەران پێیان وایە هەوڵی رۆژئاوا لە یەکخستنی مرۆیدا واتە پێدانی رەنگو مۆرکی ئەورووپی بە هەموو جیهان و لەناوبردنی بنەما و بەها تایبەکانی گەلانی تر و نەهێشتنی شەخسیەتی خۆیی و نموونەی باڵایان کە تەواو جیایە لە بنەما و تایبەتمەندیەکانی رۆژئاوا، ئەوەش راست نیە کە کەسانێك دەڵێن ئەوان ئەو یەکبوونە مرۆییەیان دەوێت کە ئایینەکان بانگەوازی بۆ دەکەن، بەڵام جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان ئامانجەکانی ئایینەکان و ئامانجەکانی صەهیۆنیەتی جیهانیدا، ئەگەریش

هەڵگرانی ئاڵای ئەو بانگەوازە ئەوانە بن کە بروایان هەیە بە رەگەزپەرستی و جیاکاری رەگەزی کە مرۆڤی سپی بە باڵاتر دەزانن یان بانگەواز دەکەن بۆ گەلێکی جیا و هەڵبژێردراو، ئەوە بارەکە قورستر دەبێت مرۆڤایەتی بچێت بەدەم ئەو جۆرە بانگەوازانەوە، بەڵکو بەدەمەوەچوون بۆ بانگەوازێکی تر دەبێت کە ئایینی حەق ئاڵاهەڵگریەتی و بێ هیچ ستەم و دوژمنایەتیەك خەڵکی کۆدەکاتەوە.

ئەوەی بە وردی بڕوانێتە هەموو بانگەوازە رووخێنەرەکانی بەهائی و رۆحگەرایی نوێ و بانگەوازە رووخێنەرەکانی تر، ئەم بانگەوازکردنە بۆ جیهانیبوون یان ئومەمیەت (Cosmopolitism)بەدی دەکات کە ئەنجامی پیلانە تلمودیەکان و ئەو بانگەوازە زیانبەخشانەیە کە جوولەکایەتی جیهانی دەستی زاڵە بەسەریاندا، ئەمەش هەوڵێکە بۆ تەنگپێهەڵچنینی جیهان لەژێر ناوی بیرێکی دیاریکراو و رێبازێکی دیاریکراودا، بێگومان ئەم بانگەوازەی جیهانیبووە مەترسیەکی گەورەی هەڵگرتووە دژ بە ئەو گەلانەی کە هێتا بونی نیشتیمانی و یەکبوونی نەتەوەیی خۆان تەواو نەکردووە و هێشتا بەدەست داگیرکاری یان شاڵاو یان دەستڕۆیی دەرەکیەوە گیرۆدەن، یان تا ئێستاش بنەما و پاڵپشتەکانی بیرکردنەوەی تەواو پێنەگەیشتون تا بتوانێت بەرنگاری بیری مرۆیی ببێتەوەو هەڵوێستی سەربەرخۆیی هەبێت.

# بەشی سێیەم

# ئەو بانگەوازانەی رووخێنەری نەفس و ئەخلاقن

## باسی یەکەم:

فرۆیدی٠( جنس-ئەخلاق ).

## باسی دووەم:

بوونگەرایی.

## باسی سێیەم:

هیبیەت.

# باسی یەکەم

# فرۆیدی

# ( بیردۆزەی جنس )

بیردۆزەی فرۆید بۆ شیکاری دەروونی قۆناغێکی ئەو هەوڵانە بووە کە فەیلەسووفان لە بواری ئاشکراکردنی دەروونی مرۆییدا ئەنجامی دەدەن، ئەم هەوڵانەش بە درێژایی مێژوو هەبوون، ئەم ڕێبازە ڕاست و هەڵەشی تێدایە.

بیردۆزەکەی فرۆید وەك ئەو بیردۆزانەی تر کە پەیوەندییان هەیە بە زانستە مرۆڤایەتیەکانەوە بڕێ ئەگەرن کە دەخرێنە بەر تاقیکردنەوە، لەبەرئەوەی زانستە مرۆڤایەتیەکان بە سروشتی خۆیان جیان لە زانستەکانی بیرکاری و سروشتی بۆیە ملکەچییان بۆ بڕیارەکانی ئەزموونی زانستی ماددی نکووڵی کردنە لە مرۆڤبوونی مرۆڤ و بەهەدەردانی لایەنی ڕۆحی و هزری و دەروونی مرۆڤ، ئەم لایەنە کە نەگونجاوە ئەو ئەنجامانەی بەسەردا بدرێت کە زانست سەبارەت بە ماددە یان ئاژەڵ پێی گەیشتووە.

بەڵام مەترسیدارترین شتێك لە فرۆیدیدا هەیە گواستنەوەو ناردنی ئەو ڕوانینەیە کە فەیلەسووفانی ئەورووپا دایاننناوەو پێیان وایە مرۆڤ گەورەی بوونە، تا دەگەنە ئەوەی بڵێن مرۆڤ ئاژەڵێکە کە ئارەزووەکانی زاڵن بەسەریدا، یان ئەو ئارەزووە جنسیەی کە سەرچاوەی یەکەمی پاڵنەرەکانی مرۆڤە زاڵە بەسەریدا، ئەم گۆڕانە مەترسیدارەش بەهۆی چەند

گۆڕانێکی جیاجیاوە هات کاتێك ڕوانین بۆ بوون بەلاڕێدا چوو و سنوری ئایینی بەزاندو پەیامی خوایی و پەیوەستی ئەخلاقی لە مرۆڤ داماڵرا.

بیردۆزەی ماددیگەری نکوڵی دەکات لە گەورەترین بڕیارەکانی ئایین کە بریتین لە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پابەندی ئەخلاقی کە بەدوای ئەمانەدا پاداشتی ڕۆژ دوایی دێت، هەرکات ئەو کۆتە نەما ئیتر وەرگرتنی دیدی ئارەزووپەرستی زۆر ئاسان دەبێت.

ئەمە مەترسیدارترین بنەرەتە کە فرۆید سەبارەت بە جنس بیردۆزەی خۆی لەسەر دامەزراندووە و بانگەواز دەکات بۆ ڕەهاکردنی ئارەزووەکان و ئازادکردنیان لە کۆتی ڕەوشت و ڕێساکانی ئایین.

لە بنەڕەتدا بیردۆزەکەی فرۆید تەنها ئەگەرێك بوو کە ئەو پزیشکە خستیەڕوو کە بە درێژایی تەمەنی لەناو نەخۆشە کەموێنەکان و تووشبوانی نەخۆشیە دەروونیەکاندا ژیانی خۆی بەسەردەبرد، ئیتر ئەوان کەرەستەو پێناوی دانانی ڕێبازەکەی بوون.

ئەو ئەگەرەش دەڵێت: هەموو پاڵنەری مرۆڤ سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جنس، بەڵام ئەو دوو پزیشکەی کە لە بیردۆزەی شیکاری دەروونیدا هاودەمی بوون و بریتی بوون لە ئەدلەر و لۆنج هاوڕای فرۆید نەبوون و دژی ئەو ڕوانینەی بون، کەچی ڕاکەی ئەو دوانە کەنارخرا و ڕاکەی فرۆید سەرخرا و بڵاوکرایەوە و پاڵێکی بەهێزی پێوەنرا تا ببێتە مەیدانی توێژینەوەو وانەکانی زانکۆکانەوە، کرا بە سەرچاوەیەك بۆ هونەر و چیرۆك، بێگومان ئەم جەختکردنەوەیە لە بیردۆزەیەك کە لەڕووی زانستیەوە نەسەلماوە و تەنها یەك کەس لە سێ کەس بڕیاری لەسەر داوە بەڕوونی

ئەوە نیشان دەدات کە لە پشت ئەمەوە ئامانجی سیاسی و ئارەزووی چاوچنۆکانی جیهانی هەیە.

جا ئەگەر پێناسی جوولەکەیی فرۆیدی دانیشتوی نەمسا لە ناو کۆمەڵگەیەکدا بخەینەروو کە رقیان بووە لە جوولەکە و پەیوەندی فرۆید بە هرتزل و چوونەپاڵ بانگەوازی صەهیۆنیەتی نیشان بدەین، ئەوکات دەزانین تا چ ئاستێ پاڵنەرەکان بەهێزبوونبۆ سەرخستنی رای لەوجۆرە تا بە تەواوەتی لە بازنەو ناوەندەکانی زانست و ئەدەب و رۆشنبیریدا زاڵ بێت، ئەو بازنەو ناوەندانە ئەو شوێنانەن کە صەهیۆنیەتی جیهانی دەستی گرتووە بەسەریاندا و لەوێوە سریالیەت و دواتر بوونگەراییش سەریهەڵدا، بەڵام هێندەی نەبرد پێ لاینەی تری زۆر مەترسیدارتر دەرکەوتن، ئەوە بوو بە بەراوردی زانستی ورد دەرکەوت هەموو بنەرتەکانی بیری فرۆید دەگەڕێنەوە بۆ تلموود، دکتۆر صەبری جرجیس لە کتێبەکەیدا( کەلەپووری فرۆیدی و پەیوەندی بە جوولەکەی صەهیۆنیەوە) بە روونی ئەوەی نیشانداوە.

بێگومان ئەوەی بە وردی بڕوانێتە ئامانجەکانی تلموودی و پیلانە صەهیۆنیەکان—وەك ئەوەی لە پرۆتۆکۆلەکاندا باسکراون— دەتوانێت ببینێت لەناوبردنی مرۆڤ و مەعنەویاتی و نیشاندانی وەك ئاژەڵێك کە هەموو هەڵسوکەوتی لەسەر بنەرەتی سێکس بێت ئامانجێکی حەقیقی جوولەکەیە کە توانیویەتی لە شوێنی خۆیدا پەیڕەوی بکات و لەنێو گەلان و چەندین نەوەدا وەك بیروباوەڕێکی راستی وەربگیرێت.

زانایانی تایبەتمەند لە چەندین شوێندا بەرامبەر بەو بیردۆزەی فرۆید وەستاونەتەوەو هێرشیان کردوەتەسەر:

**یەکەم:** زانایان لە نێویشیاندا ردین فاین تێبینی ئەوەیان کردووە شیکاری دەروونی بنیادێکی چەقبەستووی نەگۆڕاوە، ئەمە وایکردووە بە فرۆید تا چەندین جار لەسەر بنەمای ئەو تێبینیانە بڕواتەوە بە بڕوا سەرەکیەکانیدا، ئەو گشتگیرکردنانەی فرۆیدیش گۆڕانێکی گەورەیان داوە بە سیفەتەکانی، فرۆید بڕوای وایە بیردۆزەکانی بۆ جێبەجێ کردن گونجاون، بەڵام شیکاری دەروونی خستیە چەقبەستووییەك کە زاڵی و توانای پێ لەدەستدا، بەڵگەیەك نیە جەخت لەوە بکاتەوە زانستی دەرونناسی لە داهاتوودا لەسەر بنەما فرۆیدیەکان دەبێت.

**دووەم:** خاڵی لاوازی فرۆید وەك زانایەك ئەوەیە کە توێینەوە لە خۆیپ و منداڵی خۆی کردووە بە بنەمایەکی گشتی و دانانی چەند یاسایەکی گشتی لەسەر ئەو بنەمایە، فرۆید لە نووسینەکانیدا شتانێکی وای سەبارەت بە خۆی و ژیانی خستوەتەڕوو کە دەیسەلمێنێت شیکاری خەونەکانی و کێشەکانی منداڵی خۆی وەك جوولەکەیەکی ناو نەمسای دەمارگیری دژ بە جوولەکە کردووە بە بنەما بۆ گشت بڕیارە گشتگیرکراوەکانی، فرۆید رەفتاری وەك رەفتاری زانایان نەبووە، بەڵکو زیاتر لە پێشبینی کەرێك چووە نەك زانایەك.

**سێیەم:** فرۆید بە بیردۆزەو بیروراکانی بێ بوونی بەڵگەیەکی زانستی ئەگەرێك دادەنێت و دواتر بەراستی دادەنێت و دواتریش وەك راستیەکی زانستی سەیری دەکات کە هەڵەی نەبێت و بێ هیچ گومان بوونێك لەسەری بنیادی راکانی لەسەردەکات، بێگومان ئەو ئەگەردانەر بووە نەك تاقیکەرەوەی ئەگەرەکان.

**چوارەم**: فرۆید پشتی بەستووە بە ئەفسانە یۆنانیە کۆنەکان و چەند یاسای زانستی لەسەر داناون وەك پشتبەستنی بە گرێی ئۆدیب و گرێی ئەلکەترا، زانایان ئەوەیان سەلماندووە کە ئەوانە ئاسایی نەبون، بەڵکو دیاردەی کۆمەڵایەتی بوون لە کۆمەڵگەیەکدا ئەگەری بوونیان هەیە و لە کۆمەڵگەیەکی تردا بوونیان نەیە، مالینوفیسکی توێژەری دەروونی دەڵێت: گرێی ئۆدیب لە چەندین شوێندا کاریگەری نەبووە.

**پێنجەم**: توێژەران ئەوەیان تۆمارکردوە کە خودی فرۆید بە چەند تەنگژەیەکی دەروونیدا تێپەڕ بووە کاتێك چارەسەری نەخۆشیەکانی کردووە، فرۆید لە کاتی چارەسەرکردنی چارەسەری کیژە سیسلی تووش بوو بە گرێی ئۆدیبدا ئەوەی خستوەتەڕوو کە خۆیشی تووش بووە بەو گرێیە، وەك ئەوەی بەرەو لای دایکی دەڕوات و لە باوکی دووردەکەوێتەوە.

**شەشەم**: چەندین توێژەر ئاماژە دەدەن بەوەی جوولەکەیی فرۆید ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە دارشتنەوەی چەندین بیردۆزەو ئەگەری و شیکاریدا، چونکە ئەو سەر بە کەمینەیەکی ناحەزی ناو کۆمەڵگە بووە کە ئەو کەمینەیە زیاتر ناسراو بون بە حەزی سامان و داخراوی و دەمارگیری.[1]

**حەوتەم**: فەلسەفەی فرۆیدی میکانیکی جەبریە وەك ئامێرێکی بێ ئازادی ملکەچی تەواوی هێزە شاراوەکان سەیری مرۆڤ دەکات کە هەرگیڤ ناتوانێت بەسەریاندا زاڵ بێت مەگەر بە فرت و فێڵ.[2]

**هەشتەم**: یۆنج پێچەوانەی بیروراکانی فرۆد دەوەستێت و دەڵێت ئەو ڕاوبۆچوونانە یەك لایەنن و پێنەگەیشتون، پاڵنەری سێکسی ئەو گرنگیە

---

[1] – دکتور فاخر عاقل: بحث عن علم النفس الحديث.

[2] – دکتور یوسف مراد: شفاء النفس.

گشتگیریەی نیە کە فرۆید لە ژیانی منداڵیەوە بۆی داناوە، بەڵکو هێزی خودێتیە نەك پاڵنەری سێکسی کە دەسەڵاتی زاڵی ئیجابی ژیانە، ئەدلەریش ئاماژەدەدات بە هەڵەکانی فرۆید، گرنگی ئارەزووی سێکسی لەو شێوەدا هەڵدەوەشێنێ و دەیگێڕێتەوە بۆ پێکهاتەی شەخسی.

**نۆیەم**: توێژەران ئاماژە بەوە دەدەن فرۆید لە چەندین بۆنەدا دانی بەوەدا ناوە کە توێژینەوەکەی خۆی تەواو نەکردووەو بیردۆزەکەشی بە خودی خۆی بەس نیەو کەموکورتی هەیە.

یەکێك لە ئامانجە مەترسیدارەکانی فرۆید ئەوەیە مۆڵدانی ئارەزوو وەك شمشێری سەر گەردن نیشان بدات، بۆیە وێنەیەکی مەترسیداری پێ دەدات و داوا دەکات منداڵ هیچ ئاراستەیەکی پێ نیشان نەدرێت و هەرچی بنەما و ڕێسا هەن کە ڕێ دەگرن بە کەوتنی منداڵ لابرێن.

هەوڵی زۆر لە پشت فرۆیدەوە بوونە پاڵنەر بۆ بڵاوکردنەوەی بیروراکانی فرۆید تا بیانبەنە ناو پەروەردەی نوێوە، هەرچەندە ئەو بیردۆزەیە هێشتا لە رووی زانستیەوە نەسەلمابوو.

هاورێیانی فرۆید لەو بارەیەوە بەرامبەر بە مەترسی ئەو بیرورایە وەستان و لەگەڵ ئەو رایە نەبوون کە فرۆید خۆگرتنەوەی بە هۆکاری نەخۆشی دەروونی یان شێتی دەزانی، ئەزموونە سەرژمێریە جۆراوجۆرەکانیش ئەوەیان سەلماندووە کە لێدان یان بەرگرتن بە منداڵ نابێتە هۆی ئەو ئەنجامانەی کە فرۆید بە ئەگەر دایناوە.

دکتۆر ئەسکەندەر تۆماس ئەوەی راگەیاندووە کە چەندین توێژینەوە لەلایەن دەستەیەکی پزیشکانی دەروونیەوە کراون و دواجار گەیشتوونەتە ئەوەی بیردۆزەکەی فرۆید رەهایی نیە و سەرکۆنەکردنی باوکان لەلایەن

پیاوانی پەروەردەشەوە ڕێرەوی رووخێنەرە لە پەروەردەی منداڵاندا، زانایان باری ۱٥۸ منداڵی لاریێ نەبوویان خستوەتە بەر توێژینەوە کە هەژار و دەوڵەمەندیشیان تێدا بووە، ئەوە دەرکەوتووە کە منداڵەکان هەموو بە ساغ و تەواوی گەورە بون هەرچەندە باوکانیان لەگەڵیان رەق بون و کۆتی قورسیان لەسەر داناون.

دکتۆر تۆماس ئاماژە بەوەش دەدات ڕێرەوی منداڵ چەندین کارتێکەری لەسەرە نەك تەنها بارودۆخ و نێوەند و باری کۆمەڵایەتی بێت.

چەندین توێژەر سەرهەڵدانی زانستی دەروونناسی نوێیان خستوەتەروو دەڵێن زانستی دەرونناسی کاتێ تەوازوعی هەبوو سەرکەوتوو بوو، بەڵام کاتێك ویستی شوێنی فەلسەفەی ئەخلاق بگرێتەوە تێکشکا.

مامۆستا ئەحمەد خاکی دەڵێت: کاتێ بنەرەتەکانی زانستی دەرونناسی بە باسەکانی شیکاری دەرونی و وەسفی دەروونی کۆمەڵەوە دەرکەوتن بۆ جیهان، ئەوکات گومان لە بەهای فیکرەدا دروست بو و خەڵکی بەو چاوەی گەورەیی جارانەوە سەیری بیروباوەڕیان نەدەکرد.

ئەم گومانەش لەبەرئەوەیە کە زانستی دەرونناسی نوێ پێی وایە مرۆڤ لەبەردەم بڕێ پێناو و هۆکاردا ڕێ دەبڕێت کە عەقڵ زاڵ نیە بەسەریاندا، زانستی دەرونناسیش ناتوانێت نموونەی باڵامان بۆ بێنێتەدی چونکە توانای چەسپاندنی بەهایشتەکانی نیە چونکە زانستێکی وەسفیە کە لە بازنەیەکی بەرتەسکی ئەزموونەدا ڕێ دەبڕێ و زانستێکی ئەزمونیە، بۆیە چەند بارێکی کەموێنەو ئاساییشی چارەسەر کردووە بێ ئەوەی بڕێ پێوەر بدات کە مرۆڤ بتوانێت بیانکاتە ئامانج یان ڕێی خۆی، کاتێ زانستی دەروونناسی بەرامبەر فەلسەفەی ئەخلاق سەرکەشی نواند یهان چەندین

ئامانجی جێگری بڕوایێ بووی لەدەستداو ڕێبەرانی بیری بەرەو بارێكی گومانبرد كە ئیتر وایان لێهات خۆیشیان گومانیان دەكرد لە بەهاو ئاستی بیروباوەڕیان.

چەندین توێژەر پەیوەندی قووڵی نێوان فرۆیدیو ئایدۆلۆجیای تلمودییان ئاشكراكردووە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پرۆتۆكۆلەكان ئەم دەقە دەبینین(پێویستە كار بكەین بۆ دارماندنی ئەخلاق لە هەموو شوێنێك، ئەوكات زاڵبوون و دەستڕۆییمان ئاسان دەبێت)، (فرۆید لە ئێمەیە و بەردەوام پەیوەندیە سێكسیەكان دەخاتە بەر تیشكی خۆر تا لەبەرچاوی گەنجاندا شتێكی پیرۆز نەمێنێت و خەمی گەورەیان تێركردنی ئارەزووە سێكسیەكانیان بێت، ئەوكات ڕەوشتی گەنجانیش دادەڕمێت).

لەسایەی ئەم بیرەدا فرۆید كاری دەكرد، بیردۆزەكەی ئەو ئەوەبوو ئەخلاق بەربەستی بەردەم پێشكەوتنەو خۆگرتنەوە زیان بە بوونی مرۆڤدەگەیەنێت و لێبوردەیی جۆرێكە لە شوزوز، ڕەوشت ڕەقی تێدایە، لەپێناو دووركەوتنەوە لەگرێ و بارگرژیەكاندا گەنجان بێئاراستە یانبوونی ڕێساگەلێك دەهێڵێتەوە، ئامانج لەوەش دارماندنی ڕەوشتو لەناوبردنی بەرپرسیارێتی تاكەكەسیە.

دیارە ئەم بیرەی فرۆید هیچبەڵگەو پاڵپشتێكی زانستی نیەو برێ كینەن كە خراونەتە قاڵبێكی بریقەدارەوەو سوتەمەنی خۆیان بۆبەرەوبیرەوشتی بردنی دەروونی مرۆیی دۆزیوەتەوە، فەلسەفەشیان كردووە بە بیانوو و پاڵپشتی خۆیانو ئەوەیان داناوە بۆ كۆمەڵگەیەكی دیاری كراو كە سەرچاوەی هەموو پەیامەكانیشی بریتیە لە بتپەرستی بیری یۆنانی و پەیوەست بوون بە برێ بارودۆخ و ئایینی جگەلە ئیسلام و هێزە

شاراوەکان کە ئەمەیان بردووە بەرەو ئەدەب و چیرۆك و شانۆگەری و سینەما و رادیۆ و خانەی جوانکاری و شمەکی جوانکاری.

بێگومان فرۆیدی بەرهەمی وردترین قۆناغی ئایدۆلۆجیای تلمودیە، چەند توێژەرێکیش ئاماژەیان داوە بەم راستیە: سیجمۆند فرۆید ئەو کەسەی ویستی رێزی مرۆڤ بۆ خودی خۆی بە تەواوەتی لەناوبەرێت، هەرکەس خوێندنەوە بۆ فرۆد بکات دەگات بەوەی فرۆید بە تەواوەتی پیلانێکی بەزۆرسەپێنی جوولەکەیی جێبەجێکردووە و ویستوویەتی رەگەزی مرۆیی بە رەگەزێکی لێکهەڵوەشاو بخاتەروو کە خراپترین نیازەکانی لەخۆگرتبێ تا ئەوەی منداڵی کوڕ بە عاشق بوونی دایکی و ویستی کوشتنی باوکی تۆمەتبار دەکات، لەسەر ئەم بنەمایە رێبازی خۆی داناوە تا وا بکات خەڵکی داتەکێن لە هەموو بەرزی و رێز و سۆزێکی نەرم، ئەگەریش بگەڕێینەوە بۆئامانجەکەی دەبینین چۆن صەهیۆنیەت بۆ قبووڵکردنی ئەم رایە لای رای گشتی مەسیحی لە رۆژئاوا رێخۆشکەری کردووە و لەپشت بانگەشە زانستیەکانو جیهانی سروشتیەکانەوە(داروین) وستاوە و کۆمەڵگەی مرۆییدەبات بەرەو گومان کردن لە سروشتی خەلق، لە پشت داروینەوە کار دەکات کە بانگەواز دەکات بۆ سیاسەتی هێز و نەبوونی رەحم و سۆز، دواتر دەستگرتن بەسەر زانست و بیرەکاندا، بە دەستگرتن بەسەر بیری جیهانیدا لەرێی بواری خوێندن و رۆشنبیریەوە دەکرێت هەموو بیرێك لەناوبەریتو گومان لەسەرهەموو شتێ بنێیتەوەو ئاسۆی بنەرەتەکان بگۆڕیت، هەرکەس مێژووی فەلسەفە تەماشا بکات دەبینێت جوولەکە چەند رۆڵی هەبووە تیایدا و چۆن پیاوانی جوولەکە(فرۆید و مارکس و دۆرکهایم و لیڤی برێل و سارتەر) برێ فەلسەفەیان داناون کە رووخێنەری بەها مرۆییەکانن.

پیلانە نێودەوڵەتیەکانی صەهیۆنیەت ئاماژە دەدەن بە پێویستی وێرانکردنی جیهان پێش ئەوەی دەستی بەسەردابگرن، گرنگترین ئامانجێ کە بێگومان و دوودڵی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە تەنگپێهەڵچنین و بەجوولەکەکردن و زاڵبوون بوو بەسەر بیری رۆژئاواییداو بردنی بەرەو ئامانجە تلموودیەکان لەرێی نەهێشتنی بڕوابون بە خوا و لەناوبردنی رەوشت و نەهێشتنی بیروباوەڕی بڕوابوون بە پاداشتی رۆژی دوایی.

مامۆستا عەبباس مەحموود عەقاد برێ قسەی کەسانێکی هێناوە کە لەسەر ژیانی فرۆید نووسینیان هەیە بەتاییەت نووسینەکەی دکتۆر ئەرنست جۆنس کە گەورە خوێندکاری فرۆید بووە لە بەشی دووەمی ژیاننامەی فرۆیددا دەڵێت: فرۆید پێش ئەوەی بهێڵێت کەس دەستی بکات بە نووسینەکانی هەمو ئەو نووسینانەی دەسووتاند، کەسانی چواردەوری خۆی بە کەسانێکی جوولەکە قەرەباڵغ دەکرد، ئەو پزیشکە دەروونناسانەش کە لە شاری شیکاگۆ کۆدەبوونەوە بۆ ساڵیادی فرۆید و نزیکەی چوار هەزارکەس دەبون هەڵمەتێکی توندی فرۆید و رێبازەکەیان بەرکەوت کە کەسێکی بەرپرس لە بنکە زانستی و رەسمیەکەی ئەنجامیدا ئەویش دکتۆر بسیڤال سیلی بوو کە بەڕێوەبەری پەیمانگەی بوارە دەروونناسیەکان بوو لە ویلایەتی نیواز.

پوختەی هەڵمەت و هێرشەکەی ئەوەبوو کە ئەو کەمە شتەی لە پزیشکی فرۆید ماوەتەوە کەمەو جێی گرنگی نیە و بیروراکانیشی شتێك بۆ بەها مرۆیەکان زیادناکەن چونکە ئەو مرۆڤ بەرەو دواوە دەگەڕێنێتەوەو لایەنی مەنتیقی شاعیرانەی مرۆڤ لەبیر دەکات، ئەو لە ئافرەت تێنەگەیشتووەو حەزی نەبووە لە مۆسیقا و هەستی نەکردووە بە گەورەیی

بیروباوەڕ، هەروەها دەڵێت: جیهان توانی پاش کەمتر لە بیست ساڵ لە مەرگی فرۆید بەجوانی کێشانەی فرۆید بکات.

عەبباس عققاد لە زاری دکتۆرئەرنست جۆنزەوە سەبارەت بە فرۆید ئەو قسانە دێنێت کە دەڵێت: فرۆید بەهۆی هەندێ شتی کتوپڕەوە تووشی لەهۆشچوون بووە، لە تێکەڵ خەڵکی تردا رەق و سروشت توند بووە، خەونەکانی لایەنی شاراوەیان هەبوو، جۆرێ رارایی هەبوو کە وەك سەرمەستی لێکردبوو، دیارترین باری تایبەتی ئەوەبوو لەپێناو لێدانی بیروباوەڕو نەریتەکاندا زۆر وابەستەی لێکدانەوەی سێکسی بوو کە تەواو دەمارگیری و توانەوە لەو ڕێبازەیدا بەسەریدا زاڵبوو.

قسەیەکی فرۆید بۆ یونجی هاوڕێ ئەوەبوو: بەڵێنم بدەرێ رۆژێ لە رۆژان دەستبەردار نابیت لە بڕوابوون بە لێکدانەوە سێکسیەکان، بەڵام یۆنج بەرەبەرە خۆی پاك دەکردەوە لەو دەمارگیریە سێکسیە، وەك چۆنیۆنج راجیا بوو لە فرۆید هەرواش ئەدلەری خوێنکاریشی راجیا بوو لێی.

فرۆید کۆمەڵەیەکی گرێی دەروونی و نەریتی نامۆ بوو کە تا کۆتایی تەمەنی نەیتوانی عەقڵی شاراوەی لەو ۆتە دەروونیانە رزگار بکات، ئەو ناوی بیردەچوویەوە، ئەو پەرانەی لەسەر رۆژگارەکانی تەمەنی هەبوون دەیسووتاندن، بڕوای وابوو لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەمدا دەمرێت، کەچی لە سەرەتای جەنگی جیهانی دووەمدا مرد، لە رۆژێکدا بۆهێورکردنەوەی شۆڕشە هەستیو دەمارگیریەکانی بیست جگەرەی دەکێشا، زۆر دەترسا بە شەمەندەفەر گەشت بکات، کاتژمێرێك پێش وادەی خۆی لە وێستگەدا ئامادە دەبوو، هەمیشە کەنارگیر بوو و ڕێی نەدەدا کەس بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هاودەمی بێت.

لەم ساڵانەی دواییدا چەندین توێژینەوە ئەنجام دران سەبارەت بە کەوتنی ڕێبازی فرۆیدی، ئەمەش پاش ئەوەی لە دوو دەیەی کۆتاییدا کەوتە بەر چەند هەڵمەتێکی سەختی یەکدوای یەك کە ئەوەیان کردبووە ئامانج مۆرکی زانستی بوونی لێ داماڵن، توێژەران ئاماژە بەوە دەدەن ئەو کۆنگرەی کە لە ساڵی ١٩٧٠ لە ئینگلتەرا بەسترا بۆ پزیشکە دەروونناسیەکان خاڵێکی گرنگی مێژوویی بوو، ئیلیوت سلتیر زانای دەروونناسی وتەیەکی پێشکەش کرد کە تیایدا رایگەیاند بیردۆزەکەی فرۆید زانستی نیە بەڵکو ئەفسانەیەکی میسۆلۆجیایە کە لە منداڵدانی نازانستی بووندا لەدایکبووە، سلتیر دەڵێت لە داهاتوودا ئەو بیردۆزەی فرۆید داهاتووی نابێت، ئاماژەش دەدات بەو وتەی کارل پۆپەر کە دەڵێت شیکاری دەروونی نەیتوانیوە بیردۆزەیەك بێنێتەدی کە تێکنەشکێت.

لە ئەڵقەیەکی تری توێژینەوەییدا کە ئەکادیمیای زانستەکان لە نیۆیۆرك بەستی و هەژدە فەیلەسووف لەخۆدەگرتگورزێکی تر بە بیردۆزەی فرۆیدی کەوت کاتێك زانستی شیکاری دەروونی فرۆیدیان لە مەیدانی زانستەکان جیاکردەوە، پوختەی وتەکەشیان ئەوەبوو کە ئەو بیردۆزەی فرۆید کە لە ماوەی نیو سەدەی پێشوو دەرکەوت دەبوو ئێستا زانست بیسەلماندایە، کەچی تا ئێستاش بێ بنەمای زانستی و لە بازنەی بیردۆزەو ئەگەردا ماوەتەوەو ئەوەش مایەی شەرمە.

سلتیر دەڵێت: بیردۆزەکەی فرۆید زانایانی دەروونناسی دابەش کرد، زانستی نەخۆشیە دەروونیەکان بەدەست ئەو برینە سەختەوە دەناڵێنێت کە بیردۆزەکەی فرۆید تووشی کرد، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار، یەکەم ئەوەیە کە پەیوەستی زانست نیە، دووەمیش ئەوەیە ئەوەی پێشکەشی دەکات بە نەخۆش جیایە لەوەی کە زانستی پزیشکی لە هەر لقێکیدا

دەیهێنێتەدی، لابردنی ئەم جەستە نامۆیە(بیردۆزەی فرۆیدی) هۆکارە بۆ نەمانی برینی زانستە دەروونیەکان.

فەخری دەباغ پاش باسکردنی دەیان هەڵوێستی زانایان لە بەرنگاربوونەوەی بیردۆزەکەی فرۆید دەڵێت: هەرچیەك پێشتر باسمان کرد، ئەوەمان نیشان دەدات کە ئەو رەخنەی لە بیردۆزەکەی فرۆید دەگیرێت ئەوەیە بیردۆزەکەی زانستی نیەو بەبڕی پێویست ملکەچی شیکار و بەراوردکاری نابێت و دووبەرەکی و ناکۆکی لەنێوان زانایانی دەروونناسیدا دروست کردوەو زیاتر لە ئەفسانەو بیروباوەڕێکی پڕ نەریتی نامۆ دەچێت کە تەنها ئەوانە ملکەچی دەبن کە بڕوایان پێیەتی و شوێنکەوتەی ئەو ڕێبازەن.

ئەو توێژەرانەی کە بیری نوێیی فرۆیدییان پێیە ئاماژە بەوە دەدەن کە نەگونجانێکی گەورە هەیە بەتایبەت لە نێوان هەردوو غەریزەی سێکس و مەرگ و گرێی ئۆدیب و سێکس لای منداڵان، ئەوە ئەو چوار خاڵە بوون کە فرۆید پێچەوانەی فیترەتی مرۆیی و ئایینە و ئەخلاقیش بڕیاری لەسەر دان.

جۆزیف ریتۆلدز دەڵێت: زانستی رەگەزەکان گەیشتە بڕێ شاهید و ئەنجامی سەرسوڕهێنەر کە بڕێ ئەگەری ریشەیی فرۆید لەناودەبات وەك غەریزەی سێکس و مەرگ و قۆناغە سێکسیە منداڵیەکانی فرۆید و گرێی ئۆدیب.

ئەو ئەزموون و تاقیکردنەوانەی کران بۆ تاقیکردنەوەی هەندێ لەو چەمکانە ساختەی ئەو ڕێبازەیان دووپات کردوەتەوە و رۆبەرت سیرزیش لە کتێبەکەیدا(روانینێ لەسەر توێژینەوە مەوزووعیەکانی چەمکەکانی شیکاری دەروونی) ئەوەی سەلماندووە تا دواجار دەڵێت: لەسەر بنەمای

پێوەرەکانی زانستە سروشتیەکان ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە شیکاری دەروونی زانستێکی حەقیقی نیە، بەڵکو شیکاری دەروونی جەخت دەکاتەوە لە تەکنیکێك کە رێ نادات بە تێبینی کردنەوەو نیازێکی روونی نیە کە جەخت لە راستیو دروستی بکاتەوە، پاشان مۆرکێکی ناروونی بڕیارە خۆییەکان بە تێبینەر دەدات.

دواتر دەگاتە ئەوەی دەڵێت: بیردۆزەی شیکاری دەروونی کەلەسەر بنەمای غەریزەی چەسپاوی سێکس وەستاوەو بەرامبەر رەوشت و ئاکار وەستاوە نەیتوانیوە راڤەیەکی پێویست لەسەر ئەو جووڵە تەواوانە بدات کە وەك پەرچەکردارێك بەرامبەر چەند دیاردەیەکی دیاریکراوی کۆمەڵایەتی هاتوونەتە بوون، ئەو تاقیکردنەوانەی لە نێوان کرێکاران و گەنجان و جووتیارات و زەنجەکاندا کراون ناراستی رێبازەکەی فرۆیدیان سەلماندووە.

لە لایەکی ترەوە ئیڤان بافلۆڤ زانای دەروونناسی ئەوە رادەگەیەنێت کە بیردۆزەکەی فرۆید ئەو بیردۆزەیە کە هەموو بارگرژیەکان دەگێڕێتەوە بۆ چەند بنەمایەکی سێکسی تەواو، ئەمەش لەناوبەری دەروونی گەنجانەو تلیاکی لەناوبەری دەروونی نەوەکانی گەلە.

## ئەخلاق

مەترسیدارترین پەیامێك لە بواری ئەخلاقدا خرایەڕو ئەو بیردۆزەی لیڤی بریل بوو کە دەڵێت سروشتی مرۆیی ێگیر نیەو ئەو ئەگەرە دادەنێت کە هەموو سەردەمو رەگەزێ رەوشتی تایبەتی خۆی هەیە، ئەمەش راشکاوانەترین بانگەوازە بۆ لەناوبردنی پابەندی رەوشتیو لێکهەڵوەشاندنی،

ئەمەش ئەڵقەیەکی زنجیرەکەی فەلسەفەی ماددیگەریە کەلە بوارە جۆراوجۆرەکانی ئابووریو کۆمەڵایەتیو دەروونیدا پێشکەشی کردووە بۆ تەواوکردنی بازنەی دەستگرتن بەسەر جیهاندا و ئاراستەکردنی بە پێچەوانەی فیترەتو ئەو پەیامە مرۆییانەی کە چەسپاو و راوەستاوەنو بەرهەمی ئایینەکانو ئیسلامیش وەك کۆتا پەیام بە تەواوەتی خستویەتیەڕوو.

بێگومان هەوڵی لێدانی راستی یەکبوونی سروشتی مرۆیی هەوڵێکی بوێرانەیە، چونکە تاکەکانی رەگەزی مرۆیی لە چەند سیفەتێکی دەروونی و رەوشتی گشتیدا یەکدەگرن کە ئەوەش پەیوەستە بە یەکبوونی پێکهاتەی بیۆلۆجی و عەقلّی و کۆمەلایەتی مرۆڤەوە، شوێنەواری کەش یان رەگەز یان سەردەم چەند مەسەلەیەکی حساب بۆ راون لە بازنەی روانینی گشتیدا، جیاوازی نێوانیشی لە کەم و زیادەیدا ئەو بنکە بنەڕەتیە و سیفەتە چەسپاوە کرۆکیانە ناگۆڕێت کەهەن، بێگومان بیردۆزە فەلسەفیەکان کە لە بازنەی فەلسەفەی ماددیدا دەرکەوتن لە قۆناغی یەکەمدا هەوڵیانداوە رەوشت لە بازنەی ئاین دەربکەن و کەناری بخەن و رێبازێکیرەوشتی جیاکار دابمەزرێنن کە لەسەر بیرۆکەی واجب بوون وەستابێت، دواتر قۆناغی دووەم دێت کە بە تەواوەتی گرنگی زانستی رەوشت لەدیاریکردنی بنەماکانی رەوشتدا لەناودەباتو تەنها وەك دیاردەی کۆمەلایەتی باسی رەوشت دەکات و دژی ئەو راستیەیە کەدەڵێت سروشتی مرۆی چەسپاوەو بەجیاوازی کات و شوێن ناگۆڕێت.

ئەو رێبازە فەلسەفیانە لە مەسەلەی رەوشتدا بێرەوشتییان پێ بوو و دژی ئەو رێساو سنوورانە بوون کە هەبون و بە بێبەشکردن و خۆگرتنەوە وەسفیان دەکردن.

ئەمەش وەرگیراوی فەلسەفەی یۆنانی بتپەرستیە کەناسراوە بە ئەبیقۆری و پێی وایە چێژی جەستەیی بالاترین ئامانجی ژیانە.

بەمەش فەلسەفەی نویێ ڕەوشت لە واتا سوشتیەکەی خۆی دەردەکات، ئەو واتایەی کە وەك دیواری بەهێز بووە لەبەردەم چاوچنۆکیەکانی مرۆڤدا و ڕێی نەداوە تاك خۆی وێران بکات و ڕێسای پێویستی داناوە تا سەلامەتی تاك زامن بکات، بێگومان ڕەوشت و ئایینەکان بەشێك و پەیوەستی یەکن و هیچ جیابوونەوەیەك نیە لەنێوان ڕەوشت وئاییندا، بەڵکو کاریان بنیادنانی مرۆڤە لەسەر چەند بنەمایەکی چەسپاوی و وەستان بەرامبەر ڕووداوەکانی ژیان و خۆپاراستن لە دارمان لەژێر گورزی ڕووداوەکان یان هەڵەی هەڵسوکەوتەکاندا، بۆیە ئامانجی ڕەوشت ئەنجامدانی چالاکیەکە کە بێداریخوازی بەردەوامی هەبێت تا مرۆڤ لە ئارەزوو وچاوچنۆکیەکانی بپارێزێت و سنوور دابنێت تا نەکات بە پەستی و خاپە.

ڕێساکانی ڕەوشت پەیوەستی بیروباوەڕ بون تا پابەندی ڕەوشتی حەقیقی بێت، ئەم پابەندیەش پەیوەستی پاداشتی ڕۆژی دواییە، بێگومان ڕوابوون بەو پاداشتەی دوای زیندووبوونەوەو لێپێچینەوە پاڵنەری گەورەی بەخشینی بەرپرسیارێتی ڕەوشتیە لە شوێنی حەقیقی خۆیدا، کاتێك فەلسەفەی ماددی دێت و هەموو دیوارەکانی بەردەمی دەرووخێنێت و نکوڵی دەکات لە هەموو بەرپرسیارێتی و پاداشت و زیندووبوونەوەیەك، ئەوە مەسەلەکە بەرامبەر بە ڕەوشت ترسناك دەکات، بەتایبەت کاتێك بەرەو ئارەزووبازی هانی دەدات تا چی دەوێت بیکات وەك ئەوەی بانگەوازی بوونگەرایی بانگەوازی بۆ دەکات.

بەمەش مرۆڤ گەوتوەتە بارێکی مەترسیدار و تەنگژەیەکی گەورەوە کە بریتیە لە ڕارایی و ئەو فەوتانەی کە مرۆڤایەتی لەم سەردەمەدا لە ڕۆژئاوادا پێیدا تێدەپەڕێت، ئێمە پێشتر ئامانجەکە دەزانین و ئاگادارین ئایدۆلۆجیای تلموودی پیلانی بۆ داڕشتووە، پرۆتۆکۆلاتی صەهیۆنیش بە ڕاشکاوانە ئاماژەیان پێداوە، لە سایەی هەمووئەمانەدا هەر ڕوانینێ بۆ چەمکی ڕەوشت لە بازنەی فەلسەفەی ماددیدا ناتوانێت بگاتە شتێك، چونکە سەرەتای مەسەلەکە لە بنەرەتدا بریتیە لە ئامانجی مرۆڤ لەم ژیانەدا تا بزانێت بەرپرسیارێتی تاکەکەسیو پابەندی ڕەوشتی چیە.

بیردۆزەی ماددیگەری ناتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، ئەوانەی تەنها بڕوایان بە زانست هەیە ناگەنە شتێك، لیۆنارد داروین دەڵێت: زانست ناتوانێت ڕێنیشاندەری ئاکار بێت، ئەگەریش ویستێکی ئازاد هەبێت ئەوە دەبێت شتێ هەبێت لە دەرەوەی بازنەی زانست بێت، فەلسەفەی ماددیگەری بەس لەوەدا ناوەستێت کە ناتوانێت ئامانجی مرۆڤ لە ژیاندا دیاری بکات، بەڵکو بیرۆکەی ئەو ئامانجەش دەسەپێنێت، فەیلەسووفان دەڵێن دەرکەوتنی مرۆڤ لەم سەرزەویەدا هەروا و بێ ئامانج بووە، زانایانی ئەنسرۆپۆلۆجیا کە زۆربەیان جولەکە بون گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کۆمەڵگەی مرۆیی ئامانجێکی نیە، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هەیە بە ئایینی حەق و لە سایەی ڕاستیە گەورەکانی پەیامی ئیسلامدا دەڕوانن بۆ ژیان پێیان وایە ژیان ئامانجێکی هەیە و بەرپرسیارێتی و سپاردەی سەر شانی مرۆڤەکانە، تاقیکردنەوەی تواناکانی مرۆڤە لە بەجێگەیاندنی ئەرکی جێگرایەتی سەرزەویدا، لە بەجێگەیاندنی ڕۆڵی بنیاد لەسایەی سنوورو ڕێساکانی شەریعەتدا کە لە ڕوانگەی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتیشەوە دایناون.

ناکرێت خوا بێ ئامانج ئەم بوونەی دروست کردبێت، خوا دەفەرموێت(أفحسبتم أنما خلقناکم عبثا و أنکم إلینا لا ترجعون)، لە پەیامی ڕوونی خوداییەوە گرنگی ڕەوشت لە بنیادی تاك و کۆمەڵگەدا دەردەکەوێت، دیارە شارستانیەتی سەردەمیش ئایین و ڕەوشتی کەنار خستووە و تەواو بێئاگایە لە لایەنی ڕۆحی و دەروونی لە ژیانداو جەختی کردوەتەوە سەر لایەنی ماددی بەتەنها و لەوەشدا تا ئەوپەڕی سنوور چووە، بەمەش ناتەواویەکی زۆر کەوتوەتەوە کەسەرچاوەی ئەو تەنگژەیە کە مرۆڤی هاوچەرخی ئەمڕۆ بەدەستیەوە دەناڵێنێت.

**عەللامە جوود لە کتێبەکەیدا(سخافات المدنیة الحدیثة) دا دەڵێت:** ئەم شارستانیەتە هاوسەنگیەکی نیە لەنێوان هێز و ڕەوشتدا، ڕەوشت زۆر لە دوای زانستەوەیە، لە سەردەمی ڕێنیسانسەوە زانست بەردەوام لە سەرکەوتندایە، ڕەوشتیش بەردەوام لە داکەوتندایە تا ئەوەی مەودای نێوانیان تەواو زۆر بووە، لە سەدەکانی کۆتاییدا لە هەموو مەیدانەکاندا بێ جیاوازی زانست پێشرەوی کرد کەچی ڕەوشت بەپێی پێویست لەگەڵ زانستدا پێشڕەوی نەکرد، بەڵکو پێشکەوتنی زانست ئەو بارە مەترسیدارەی نایەوە کە بڕێ پێناوی زانست کرانە هۆکار و چەك بۆ دارماندنی ڕەوشت و پەرتکردنی چەسپاوی ڕەوشت و بانگەواز کردن بۆ بەستنەوەی بە کۆمەڵگەکان و دوورخستنەوەی لە سەرچاوە ڕەسەنەکەی کە مرۆڤە.

لە پەیامی ئیسلامدا ڕەوشت بیردۆزە نیە بەڵکو پەیڕەوە، میسالی نیە بەڵکو واقیعیە، ئیسلامیش ئەم مەترسیانەی تێپەڕاندووە کە بەرامبەر واقیع دەوەستن.

ئیسلام لە خاڵێکی بنەرەتیەوە دەستی پێکردوە، ئەویش داننانە بە ویست و ئارەزووە مرۆییەکاندا و بە حەقیقەتی واقیعی سەیرکردنیانە، دواتر بەدیهێنانی ئەو ویستانەیە هاودەم بە بوونی ئەو ڕێساو سنوورە ڕێکخەرانەی کە ڕێ نادەن بە گەندەڵی و بەریەککەوتن، بەمەش ئیسلام دوو مەترسی بڵاو تێدەپەڕێنێت:

مەترسی پاڵپێوەنانی مرۆڤ بەرەو وەستان دژ بە فیترەت یان ڕێنەدان بە هاوسەنگی نێوان مرۆڤ و فیترەت، ئەمەش هەندێ بانگەوازی دنیانەویستی و دوورگرتن لە کۆمەڵگە بانگەوازی بۆ دەکەن.

مەترسی پاڵپێوەنانی مرۆڤ بەرەو داکەوتن بەوجۆرەی پێچەوانەی فیترەت بێت کە ئەمەش هەندێ فەلسەفەی بێرەوشتی و زێدەرەوی لە دەروون و کۆمەڵگەدا بانگەوازی بۆ دەکەن.

ئیسلام کاتێك مرۆڤ لە شوێنی سروشتی خۆیدا دادەنێت کە پەیوەستە بە فیترەت و سروشتی خۆیەوەو دەکرێت پەیرەوی هەموو خواستەکانی بکرێت، ڕێگریش دەبێت لە بەردەم ئەو مەترسیە تەواوەی یان داخرانە تەواوەی کە هەیە، لە هەمان کاتدا وای لێدەکات توانای بەرپرسیارێتی تاکەکەسیو پابەندی رەوشتی هەبێت، ئەو دوانەش ئازادی ویستی مرۆڤیان لەخۆگرتووە تا ڕێپێدەر بن بۆ لەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەت.

ئەو بەرپرسیاریەتە ئەو پاداشتەیە کە لە ڕۆژی دواییدا دەبێت،ئەوەش ئەو ڕاستیەیە کە ئایینی حەق دایناوەو وەڵامی تەواوی پرسیاری هۆکاری بوونی مرۆڤە لەم ژیانەو حیکمەتی ژیانی سەرزەویەدا، بێگومان هەر هەوڵێکیش بۆ دروستکردنی ڕێبازێکی ئەخلاقی جیا لەم پەیامە بەوجۆرەی ئیغریقە کۆنەکان یان ڕۆژئاواییەکان لە ماوەی پەیوەندی ڕۆشنبیری

ئەورووپی بە مەسیحیەوە وتوویانە کە پێی وایە مرۆڤ دەتوانێت ئاراستەی ئەخلاقی لەسەر درك و عەقڵ یان واجب یان پاڵنەری ناوخۆیی یان دوورگرتنی دەروون لە شتە نزمەکان بێت، هەموو ئەمانە ساختەو ناراستین و ناتوانن پابەندی رەوشتی بێننەدی یان لە بازنەی فیترەتدا دابینێن وەك ئەوەی راستی بەخششی ئاینەکان ئەنجامی داوەو لە ئیسلامیشدا لە جوانترین شێوەیدا خۆی نواندووە.

ئیسلام رەوشتی لەسەر بنەمای بڕوابوون بە خوا و لە بازنەی بیروباوەڕدا داناوە، بۆیە رەوشتێکی دەرەوەی ئایینی پێ رەوا نیە، چونکە مونتەلەقی بەرپرسیارێتی رەوشتی لە بنەڕەتدا پەیوەندی هەیە بە بڕوابوون بە خواو زیندووبوونەوەو پاداشتو رۆژی دوایی، پەیوەستە بەوەی خوا زانایەو لەسەر هەمو جووڵەو هەڵسوکەوتێك لێپێچینەوە دەکات.

پێغەمبەر موحەممەد ئاماژەی بەوە داوە کە هاتووە تا تەواوی رەوشتەکان تەواو بکات، بۆیە چەمكو واتای رەوشتی خواپەرستی لە ژیانی مرۆییدا بەردەوام بووەو بەردەوام پەیوەندی بە ئایینەکانەوە هەبووە تا ئەوەی ئیسلام کۆتا وێنەی رەوشتی بەخشی.

ئیسلام واتای رەوشتی خۆی لەسەر بنەمای تەقوا و لەخواترسان داناوە نەك لەسەر بنەمای رەهبانیەت و خۆشی دنیا، هەروەها بڕیاری داوە دەبێت ویستەکانی مرۆڤ لە بازنەی ئەو رێسایانەدا بێنەدی کە دەروون و کۆمەڵگەش دەپارێزن.

لە راستیدا رەوشت پاککردنەوەو بەرزکردنەوەی دەروونو دوورگرتنیەتی لە خراپەو دارمانو بێڕەوشتی و پاراستنی لە ئارەزووبازی، بێگومان

بانگەواز بۆ رەوشتداری لە راستترین بنەمای ئیسلامدا هاتووە(ونفس و ما سواها فألهمها فجورها و تقواها قد أفلح من زكاها و قد خاب من دساها).

واتای ئازادی لە رەوشتی ئیسلامیدا رزگارکردنی مرۆڤە لەهەر کتێکی کۆیلایەتی، لەپێش هەموویشیانەوە رزگارکردنی لەدەست کۆیلایەتی بۆ ئارەزووەکانی، ئازادی ئەوکات کۆتایی دێت کە دەبێتە دەستدرێژی بۆ سەر ئازادی کەسانی تر.

روانینی فەلسەفە رۆژئاواییەکان بۆ دەروون وایە کە بە سروشتی خۆی خراپەکارە و مرۆڤ هەر بە لەدایکبوونی تاوانی لەسەرە، ئەمەش لە ئیسلامدا بەرپەرچ دراوەتەوە.بەردەوام چەمك‌و واتا رۆژئاواییەکان لە چەند ئەگەرێکەوە دەرکەوتون کە بەردەوام جێی گومانن و لەسەر بنەمای بیرۆکەی تاوان وەستاون، بیرۆکەی تاوانیش بیرۆکەیەکی کۆنی فەلسەفیە کە بە شێوەیەکی نوێ لە بیری رۆژئاوای مەسیحیدا نوێبوەتەوە، لەراستیدا ئەمەش راستیەکی مێژوویی یان زانستی نیە، بیرۆکەی تاوانی پێشوەختە هەولێدا زاڵ بێت بەسەر فەلسەفەی رۆژئاوایی و ئەدەب و چیرۆکدا، هەروەك لە چەمك‌و واتای رەوشت و راڤەی ئامانجی ژیان‌و بوونی مرۆڤ لەم سەرزەویەشدا کاریگەری قووڵی هەبوو، ئەم بیرە دیدێکی رەشبینی تاریکانەی هەیە بۆ مرۆڤو بە خراپەکار وەسفی دەکات، هەموو ئەوەش دەگێڕێتەوە بۆ ئەو تاوانە یەکەمینەی کە هۆکاری دەرچوونی ئادەم بوو لە بەهەشت، ئەم بیرە پێی وایە ئەو تاوانە هەر لە یەکەم رۆژەوە تا کۆتایی ژیان لەسەر گەردنی نەوەکانی ئادەم ماوەتەوە، بەڵام ئیسلام راستی ئادەمی خستەڕوو و ئەوەی نیشاندا کاتێك ئادەمهەڵەی کرد خوا لێی خۆش بوو، هەڵەکەشی تایبەت بووە بە خودی خۆیەوەو پەیوەندی نەبووە بەهیچ تاکێکی تری رەگەزی مرۆییەوە.

ئەو بیردۆزەی تاوانی پێشوەختە کە زاڵە بەسەر بیری ڕۆژئاواییدا مرۆڤ وا وێنا کراوە کە هەر لە بنەرەتدا خراپەکارە، بەڵام قورئان وای داناوە کە دەروونی مرۆیی ئامادەیە بۆ چاکەو خراپەش، ئەوەش ماوەتەوە لەسەر ئاستی توانای مرۆڤ لە دەروون پاککردنەوەو ڕزگارکردنی لە خراپەو پاڵنانی بەرەو چاکە، ئەرکی ئایین بە پەرستش و فەرزە بەردەوامەکانی لە شەوو ڕۆژدا ڕاچڵەکاندنی دەروون و نوێکردنەوەی ڕاچڵەکانی مرۆڤە و هاندانیەتی بەرەو کاری چاکە، بەشێك لە توانا و ویستی مرۆڤ لە سایەی بڕوابوونی بە خواو ترسان لە خوا ئەوەیە کە بەرپرسیارێتی وسزادان هەیە کە وادەکات مرۆڤ لە بازنەی ڕێسا کۆمەڵایەتیەکاندا دەرنەچێت، چونکە ئەو ڕێسایانە دەیپارێزن لە هەڵە، ئیسلام بەم هەنگاوە مرۆڤایەتی ڕزگار کردووە لە بیردۆزەیەکی خاوەن کۆت و بەندی سەخت لەسەر بوونی مرۆڤ.

ئامانجی ئیسلام لە ڕەوشتدا جیایە لەو ئامانجانەی کە هەریەك لە دنیاپەرستی و دنیانەویستی هەیانە، ئیسلام ڕەوشت دەبەستێتەوە بە ئایینەوەو دەیکاتە بەربەستێکی پتەو بەرامبەر لێکهەڵوەشان و گەندەڵیو خراپەی کۆمەڵایەتی و داڕمانی کۆمەڵگەکان، پەیوەندی دروست دادەنێت لەنێوان مرۆڤ و دەروونیدا و مرۆڤ و کۆمەڵگەدا، دەیکاتە پێناوێك بۆ چاکسازی ژیانی دنیاو پاداشتی ڕۆژی دوایی(وبتغ فيما آتاك الله الدار الآخرة ولا تنس نصيبك من الدنيا و أحسن كما أحسن الله إليك و لا تبغ الفساد في الأرض إن الله لا يحب المفسدين).

ئیسلام بە تەواوەتی جەخت دەکاتەوە لە پەیوەندی ڕەوشت بە پاداشتی ڕۆژی دواییەوە، ئەوەش یەکێکە لە گرنگترین ئەو خاڵانەی کە فەلسەفەکان هەوڵیان داوە لە ڕێی ڕێبازەکانی حلوول یان ئیتیحاد یان وەحدەتولوجودەوە بیشێوێنن، ئەوەش بەوەی بڵێن مرۆڤ بەشێکە لە زاتی

خواو کاریشی هەر وایە، ئەوەش هەوڵێکی پووچە بۆ لەکارخستنی فەرزەو ئەرك و بەرپرسیارێتیەکان‌و لەکارخستنی ئەو بنەما بنەرەتیەی کە بنەکای زیندووبوونەوەی دوای مەرگ و پاداشتی ڕۆژی دواییە(ئایا پاداشت بێت یان سزا)، ئیسلام جەخت دەکاتەوە لە بەرپرسیارێتی مرۆڤ لە کارەکانی‌و جەختیش دەکاتەوە لە ئازادی ویستی مرۆڤ، ئەمەش لە بەر ڕۆشنایی ئەو دوو ڕێیەی لەبەردەم مرۆڤدا دانراون تا ڕێی چاکە یان ڕێی خراپە بگرێتەبەر، خوای گەورە هەموو ئەو هاوکاریانەشی پێ بەخشیوە کە بەرەو ڕێی خواو حەقی دەبەن.

هێمایەکی دیاری ئیسلام سەبارەت بە ڕەوشت دانانی ڕێباز و بنەماکانە، بەستنەوەی ئیسلام و ئیمانە بەیەکەوە، پێکەوەبەستنەوەی زانست وکارە، دواندنی هەریەك لە عەقڵ‌و دڵە.

دیارترین دیاردەی ڕەوشتلە ئیسلامدا بریتیە لە میانەڕەوی و هاوسەنگی و گونجاوی لەگەڵ واقیع و دوورگرتن لە هەریەك لە پەرگیری و شلگیریە، کاتێك مرۆڤ بەرەو ویستەکانی هان دەدات بۆ هەر ویست و ئارەزوویەکی مرۆڤ بنەما و ڕێسای داناوە، بۆ نموونە لە ساماندا مافی داوە بە مرۆڤ سامان کۆبکاتەوە، هاوکات داوای لێکردووە زەکات بدات و خێر بکات و دووربێت لە چرووکی و پیسکەییش،لە بواری سێکسدا مافی داوە بە مرۆڤ لە سنوری خێزانداریدا و دوور لە زینا و لە بازنەی بنیادی خێزان و خۆشەویستی و میهرەبانیدا پەیڕەوی سێکسی هەبێت، هەر بەوەشەوە نەوەستاوە، بەڵکو حیکمەتی مەسەلەکانیشی پێداوە:

بۆ نموونە سامان ئەرکێکی تایبەتی هەیە کە بریتیە لە بنیادنانی ژیان و جیهادی ڕێی خوا، سامان لە بنەرەتدا بۆ کۆکردنەوەو هەڵگرتن داوا

نەکراوە، یان بۆ ئەوە نیە لە دەرەوەی ڕێساو سنوورەکاندا بەکاربێت، گرنگترینی ئەوانەش ڕزگارکردنیەتی لە سوو، یان بۆ نموونە سێکس گرنگیەکەی بتیادی ژیانو مانەوەی جۆرە، لە بنەرەدا خۆی داواکراو نیە، بەڵکو بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە باڵایە، لەرێی هاوسەرگیریشەوە بڕێ ڕێسای بۆ دانراوە، ڕەوشت خولەی ئەوەیەتی تاك لە داکەوتن وداڕمان و لێکهەڵوەشان بپارێزێت، لێرەوە ڕێساکانی خواردن و سامان و سێکس دەبینین ئامانجیان مانوەی نەوەکانی مرۆڤایەتیە تا توانای کاریان هەبێتو نەکەونە ژێر پێی ئارەزووەکانەوە، چونکە ئیسلام هەوڵ دەدات هاوسەنگی بپارێزێت لەنێوان عەقڵو دڵو پێویستی و ئامانجەکانو ڕۆحو جەستەدا، ئەمەش لە پێناو ئامانجێکی باڵادا کە بریتیە لە بەرزڕگارتنی ژیانو بەرزکردنەوەی مرۆڤ بۆ ئەو وێنە ڕێزدارەی کە وەك جێگری خوا لەسەرزەویدا شیاویەتی، بنەمای ڕەوشتی ئیسلام بریتیە لەوەی بەر نەگرێت بە ئارەزووەکانی مرۆڤ، بەڵام بیانپارێزێت لە دەرچوون و لادانو ڕێسایان بۆ دابنێت، بەتایبەت لەو شتانەی پەیوەستن بە خواردنو سامانو مانەوەو سێکسەوە.

بێگومان ڕەوشتی ئیسلامی ڕێبازێکی تاكو جیایە، وەك ئەو پەیامەی یۆنانیە نیە کە بانگەواز دەکات بۆدنیاپەرستیو ئارەزووبازی، وەك ئەو پەیامی بیروباوەرەکانی دنیانەویستی نیە کە دنیا بەرپەرچ دەدەنەوە، ڕەوشتی ئیسلامیش بەرهەمو گەورەیی جاهیلیەتی عەرەب نیە، بەڵکو ڕێبازێکی تەواوی پەیوەست بە بیروباوەڕە کە دان بە مرۆڤدا دەنێت وەك گشتێککە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا کاریگەری هەبێت وەك بواری سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو ئەدەبو پەروەردە، ئەمەش بەرنامەیەکی کرداریە نەك نەزەری و فەلسەفی، ڕەوشتی ئیسلامی لەسەر دوو بنەما

دامەزراوە، پابەندی و پاداشتی ڕۆژی دوایی، هاوکات ڕێی داوە بە بەدیهێنانی ویستەکان نەك بەرپێگرتنیان یان بە سووك گرتنیان، توانای هەیە و ڕەچاوی بارودۆخیشی کردووەو لێخۆشبوون و لێبوردەیی کاتی نارەحەتی و تەوبە قبووڵکردنی کاتی هەڵەشی لەخۆگرتووە، ئەمە وێڕای بوونی میانەڕەوی و واقیعی بوون لەڕێبازی ڕەوشتی ئیسلامیدا، لە هەمان کاتدا هەموو ئەو گومانانە تێکدەشکێنێت کە پێیان وایە ڕەوشت جیایە لە ئایین یان دەڵێن کەسی ملهوڕ دەڕێت بەڕەوشت بێت، بنەما ڕەوشتیە ئیسلامیەکان دیوارێکی بەهێزن دژ بە پشێوی و ستەم و خراپە بەگشتی، لە هەمان کاتیشدا نەرمییان لەخۆگرتووەو لەگەڵ ئەوە یەکدوایەیەکەکاندا لە بازنەی فراوانی ڕەوشتی ئیسلامیدا کاری خۆیان دەکەن.

تێبینیەکی گرنگ لەو بوارەدا بریتیە لە جیاکردنەوەی ڕەوشتی چەسپاو و نەریتی گۆڕاو لە بیری ئیسلامیدا، لە ئیسلامدا ڕەوشت چەسپاوە چونکە پەیوەستە بە مرۆڤەوە(لا تبديل لخلق الله) چونکە پەیوەستە بە هەموو بەها باڵاکانی ئایینەوە، بەڵام نەریتەکان گۆڕاون چونکە پەیوەستی پێناوی کاتین و دەستکردی مرۆڤن، ڕەوشتی ئیسلامی جیاوازیەکی تەواوی هەیە لە ڕێبازەکانی ڕۆشنبیری یان دنیاپەرستی یان واجب،بەگشتی ڕەوشت بریتیە لە تەقواو لەخواترسان.

## ئەخلاق و بیرۆکەی وەحدەتولوجود

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە وەحدەتولوجود نکووڵی کردنە لە ئولوهیەت و سەلماندنی بوونەوەرانە بەتەنها، وەحدەتولوجود ناونیشانێکی نوێیە بۆ ملهوڕی و نکووڵی ردن لە بوونی خوا، زمان پێچدانێکە بە بیری

تەنها بوونی ماددە مادەم شتێ لەپشت ئەم جیهانەوە نابینرێ، بەراستی بیرۆکەی وەحدەتولوجود بیرکردنەوەیەکی کۆنی هیندیە.

موسڵمانان بڕوایان وایە خوای گەورە واجبولمەوجودەو نهێنی هەمیشەیی و نەمرە کە سەردەم و شوێن سنووورداری ناکات، مومکینولوجودیش هەر شتێکە جگە لە خودا، بێگومان پەیامی وەحدەتولوجود مەترسیترین تیری ژەهراویە کە ئاراستەی ئەو پابەندیە ڕەوشتیە دەکرێت کە ئیسلام هێناویەتی، چونکە وەحدەتولوجود بەرپرسیارێتی ڕەوشتی لەکاردەخات کە بنەمای پاداشت و سزای ڕۆژی دواییە.

# باسی دووەم

# بوونگەرایی

یەکێك لەو بانگەوازە رووخێنەرانەی لە هەموو جیهاندا بازارگەرمی هەیە بریتیە لە بونگەرایی، ئەمەش دوو لایەن لەخۆدەگرێت: لایەنی فیکر کە خۆی دەنوێنێت لەو بیروراو بیردۆزانەی بانگخوازە کۆن و نوێکانی خستویانەتەروو، دیارترینی ئەوانەش بریتین لە کیرکەجرد و کامی و سارتەر، دووەمیشیان لایەنی پەیرەوە کە خۆی دەنوێنێت لەو دەستەو کۆمەڵە و وێنە جۆراوجۆرانەی کە رۆژنامە جیهانیەکان گرنگیەکی زۆریان پێداوەو بوەتە جێی سەرسوڕمان و گرنگیپێدانی گەنجان.

بوونگەرای لە هەندێ بارودۆخدا دەنگۆی فراوانی هەبوو چونکە پاش ئەوە هات کە رێباز و بیرە ماددیەکان و نکوولی کاران لە خوا و زیندووبوونەوەو رەشەبای بیری بەرزراگیری سێکس و بێڕەوشتی و ئارەزووبازی رێیان بۆ کردبوویەوە، دواجار دەگاتە ئەوەی بڵێت مرۆڤ ملکەچی بڕیارەکانی زانستە سەبارەت بە زیندەوەران و مادده، لە پەنجا ساڵەی کۆتاییدا شەپۆلێکی نکوولی لە ئایین و رەوشت لە هەموو جیهاندا زاڵ بوو، ئەو جۆرە بانگەوازانە دەرفەتێکی باشیان رەخساند بۆ گەشەپێدان و بڵاوکردنەوەی.

بوونگەرایی پەرچەکرداری چەندین شت بوو، لەوانە ئەو بانگەوازانەی کە پێیان وایە مرۆڤ بەکارهاتەی ئامێرێکی گەورەیە و بوون یان کیانێکی جیای نیە، لەوانەش هاواری جەنگی وێرانکەر و بەرهەمی لەدەستچوونی

ئەو بڕە گیانەی جەنگی جیهانی دووەم بوو، هێشتا مەترسی مووشەك و بۆمبە ئەتۆمیەکان هەرەشەیە بۆ سەر جیهان.

هەموو ئەم مەترسیانە کاتێ بەرەورووی دەروونی مرۆیی دەبنەوە- ئەو دەروونەی کە داماڵراوە لە بڕوابوون بە خوا- تەنها ڕێیەك بۆیان دەمێنێتەوە ڕێی لێکهەڵوەشانە، وا وێنا دەکرێت ژیان تاکە ئامانجە، لەهەمان کاتدا ئامانجێکە کە هەر سات هەڕەشەی ئاوابوونی لەسەرە، ئەوە ئەو دۆزەخەیە کە بوونگەرایی کردوویەتیەوەو پێی دەسوتێت تا خزمەتی ئەو ئامانجە گەورە بکات کە لە پشت بوونگەراییەوە خۆی شاردوەتەوەو بریتیە لە بڵاوکردنەوەی لێکهەڵوەشان و بردنی مرۆڤایەتی بەرەو وێرانکاری ڕەوشتی.

لێرەوە گەنجان هاواری سارتەر و ئەلبێر کامی سەرسامی کردون و تاکەرێی هەنگاو بەرەو ئەوێش لە توندوتیژی و بێرەوشتیو وێرانکردنی هێزە مرۆییەکانەوە دەبیننەوە، بوونگەرایی بەدەوری چەند چەمكو واتایەکدا دەخولێتەوە کە لە بنەرەتدا زادەی عەقڵی ماندوو و دەرونی ڕاران و دوورن لە سروشتی ڕەسەن و فیترەتی ساغی مرۆڤەوە، ئەو چەمكو واتایانەش لەم هاوارانەدا پوخت دەبنەوە:

ژیان بێ ماناو بێ ئامانجە، جیهان بۆ ئەوەیە تا مرۆڤ تیایدا بمرێت، تیایدا فیکر یەکبوونی بەسەردا سەپاوە، تیایدا مرۆڤ ڕارایی بەسەردا سەپاوە، مادەم ئێمە دەمرین بۆیە ژیان هیچ واتایەکی نیە، سەرکێشی مرۆییشمان هیچ مشتومڕێکی بۆ نیە، ئەمڕۆ وەك سبەینێ و سبەینێش وەك دوو سبەی وایە، هیچ شتێ تامو چێژی نیە، هیچ هیوایەك نەماوەو هیچ بێهیواییەکیش نیە.

ئەم جیهانە بێ مەبەست هاتووەتەبوون و بێ ئامانجیش ڕێ دەبڕێت، هەر منداڵێ بێ هۆکاری عەقڵی و بێ ئامانج دێتەژیان، ژیانی بارێکی لاوازی و دواتر کتوپڕ مردن بەخۆوە دەبینێت، هەموو دنیا فرت و فێڵە، ئێمە بێ هۆکارێکی عەقڵی هاتوینەتە بوون و جیهانیش بێ ئامانج ڕێ دەبڕێت.

دەکرێت بوترێت بوونگەرایی هەوڵێکی بیری ڕۆژئاواییە بۆ تێگەیشتن لە ژیان، تێگەیشتنێك جیا لە ئایین و ڕەوشتو لە بازنەی بیردۆزەی ماددیگەریدا، بۆیە کاتێك دەبینیت بیردۆزەی مارکسی لە بواری ئابووریدا کێەکانی ژیان چارەسەر دەکات، دەبینیت بیردۆزەی فرۆیدی جەخت دەکاتەوە لە بواری دەروونی، بیردۆزەی سارتەر بەرپەرچدانەوە ڕەهای هەموو بەها ڕۆحی و بیروباوەڕیەکانەو ئەوەش وەك چارەسەرێك دادەنێت بۆ پەیامی ئازادی مرۆڤ.

بێگومان بەرزراگیری بیردۆزەکەی فرۆید لە جەختکردنەوە لە ئارەزووی سێکسیدا و بەریەککەوتنی لەگەڵ بیردۆزەکەی لیڤی برێلدا کە پێی وایە ڕەوشت چەسپاو نیە، ئەمە دەرگایەکی فراوانی کردوەتەوە لەبەردەم کەوتن و دارمانێکی نوێدا کە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ڕێساو بنەمایانە لەناو دەچن کە چاکەو خراپە لەیەك جیادەکەنەوە، بەمەش دەرونی مرۆیی بەرەو مەترسیەکی سەخت دەچێتو ترس و بیم و لەناوچوون دەیگرێتەوە، واش دەزانێت ئەم لەناوبردنەی ڕێساو سنوورانە بەختەوەری و ئارامی و چێژوەرگرتنی پێدەبەخشێت.

بوونگەرایی بەرهەمی ئەو گۆڕانە مەترسیدارەیە کە بەرەو لێکهەڵوەشان دەچێت، دکتۆر حامید عەممار بە نەخۆشی سەردەم وەسفی دەکاتو دەڵێت: فرۆید بانگەشەی ئەوە دەکات پاڵنەرەکانی مرۆڤ و دیاردە

دەروونیە جیایاکان سەرچاوەکەیان وزەی سێکسی بەردەوامی لاشعوورە، لە دیدی خوێندنگەی فرۆیدیدا مرۆڤ وەك ئاژەڵێکی مرۆیی تەماشا دەکرێت کە ئارەزوو و پاڵنەرە فیترەتیەکانی ڕێی پێ دەبڕن.

بیروڕاکانی فرۆید لە کۆمەڵگەی نەمساییدا لە ۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا لەگەڵ ئارەزووی خەڵکدا دەگونجان، دواتر دوای جەنگی جیهانی یەکەم ئەو ئاراستانە بوونە پێناوێك بۆ راڤەی ئاکاری مرۆڤ، دواتر چەرمەسەری جەنگی جیهانی دووەك و پێناوەکانی وێرانکاری و لەناوچوون هاتنکە بوونە ئەزمونێکی رەقی مرۆیی کە زۆر سەختتر بوو لە جەنگی یەکەمی جیهانی، بەتایبەت لە ئەورووپادا بارەکە زۆر سەختتر بوو، لەو جۆرەی بارە سەختانەدا باری سایکۆلۆجی لەبارە بۆ دەرکەوتنی بیری بوونگەراییەکان و راڤە رەشبینیەکانیان، ئەو ویژدانە رارایەی مرۆڤ هەیەتی و هەست بەوە دەکات هەموو بوون بەرەو کەنارگیری و تاکبوونو نەبوون خەنگاو دەنێت، ئەو جیهانەی کە تیایدا دەژین جیهانێکی پەککەوتەی شیاو بە داشکانی خێرا و وێرانبووی تۆقێنەرە، ئەگەر بۆمان هەبێت پرسیار بکەین لەو هێزانەی کە بوونە هۆی هەردوو جەنگی جیهانی و ئامانجیان بۆ دانان لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی پشت ئەو دوو جەنگە و ئەنجامەکانی دواتریان، ئەگەر بۆمان هەبێت بە روونی داوای وەڵام لە ویژدانمان بکەین، ئەوا لە وەڵامدا پیلانە تلموودیەکان خۆیان دەنوێنن لە صەهیۆنیەتی جیهانیداو هەر ئەمانەش سازێنەری ئەو دوو جەنگە بوون، هەم خۆیان گڕەیان دەدا بە جەنگەکان و هەم ئەوانیش ئەو بانگەواز و ڕێبازانەیان دەهێنانە ئاراوە.

بێگومان ئەو لێکهەڵوەشان و پەرتبوونەی لە ڕێبازی بوونگەرایی‌و هەڵسوکەوتی شوێنکەوتوانیدا هەیە، بەڵگەیە لەسەر دابڕانی تەواو لە

هەموو سەرچاوەکانی بڕوابوون بەخوا و چاکەو میهرەبانی و خۆشەویستی و برایەتی مرۆیی‌و هەموو ئەو بەها مرۆییانەش کە سیستمی کۆمەڵگەو ژیانیان لەسەر وەستاوە.

بێهیوابوون لە ڕەحمەتی خوا و دابڕان لە بڕوابوون بەخوا و کەوتنەشوێن ماددیگەری ئەو بۆشاییە ڕۆحیەی لە دەروونی خەڵکیدا دروست کردووە، هەوڵەکەش هەر دێر زەمانەوە دەستی پێکردووەو نەوە دوای نەوە ئاڵوگۆڕی پێکراوە تا گەیشتوەتە خاڵێك کە کامی بە (دڵ تێکهەڵچوون) وەسفی دەکات.

بوونگەرایی لە نێوەندی سەدەی بیستەمدا بە نەخۆشی مرۆڤ و دەردی سەردەم وەسف کراوە، بە گشتی ڕارایی و بێهیوایی و لەناوچوون و هەستکردن بە نامۆیی بەرهەمی بوونگەرایی بووە.

بێگومان دەکرا ئەو هاوارە بڕوات و ئەو شوێنەوارە خراپانە لە هەموو جیهاندا جێ نەهێڵێت، ئەگەر بوونی ئەو هێزە شاراونە نەبوونیایە کە لەپشتەوە ببوونە سەرخەری تا ئاستێك وای لێهاتبوو کە لە پاریس بە فەرەنسی کتێبێك دەردەچوو لە هەمان کاتدا لە بەیروتیش بە عەرەبی دەردەچوو.

هەندێ دەپرسن بۆچی بوونگەرایی لە ئەورووپاو هەندێ ناوچەی جیهاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا؟ وەڵامەکەش روونە، چونکە هۆکارەکەی وەرگرتنی ڕێبازی ماددیگەری‌و بانگەوازی لێکهەڵوەشانە، بوونگەرایی بەرهەمی دیدی تاکگەراییشە، هەوڵی بەردەوامیش هەیە تا هەرکات لاواز بوو یان رووخا نوێ بکرێتەوە تا ئەوەی یەکێکیان سەدەی بیستەم بە سەدەی

سارتەر وەسف دەکات و پێی وایە سارتەر رەشەبایەو بوونگەرایيش سەرچاوەی هەموو رارایی و بارگرژیەکی سەدەی بیستەم بووە.

بە رامانێکی سادە لە ژیانی سارتەر دەزانین چ ئاکارێ لەپشت ئەم چەمك‌و واتایانەوە بووە، پەیامەکانی سارتەر کە ناوی بوونگەراییان لێنراوە تەنا دەنگدانەوەیەکی برێ هەستی دەرووی بون، سارتەر لە کتێبەکەیدا(وتەکان) دەڵێت: من ئەوەم بۆ خۆم دروست کردووە چونکە من کوڕی کەس نەبوم).

سارتەر دەیزانی کاتێك هۆشی کردوەتەوە باوك و دایکو خێزانی نەبووە، چونکە باوکی لە سێ مانگی یەکەمیدا مردبوو، دایکیشی کەسایەتی نادروست بووەو هەرگیز سارتەر هەستی نەکردووە بە سۆزی دایکایەتی، خێزانێکیشی نەبووە جگە لە باپیرە و داپیرەیەکی پەککەوتە کە ئازاردەری سارتەر و دایکیشی بوون و هۆکاری هەستکردن بە کەمی و پەستی بوون بۆیان.

دیدی سارتەر بۆ مرۆڤایەتی روانینێکی پڕ سۆزی شێواوە، بنەرەتەکەی سووکایەتیە، ئەو دەیویست جەخت بکاتەوە لە بوونی خۆی، بۆیە نکوولّی دەکرد لە کڵێسا و هەوڵی دەدا پەیامێکی هەبێت، ئەو لە ناو مندالآنی ئاساییدا منداڵێکی بێزراو بوو، بۆیە بوونگەرایی داهێنا.

زۆربەی توێژەران ئەو هەڵگەرانەوەی سارتەر دەگێڕنەوە بۆ چەمك‌و واتاکانی مەسیحیەتی رۆژئاوا کە نەیانتوانیوە سارتەر بەختەوەر بکەن یان ئەو هەستەی پێ بدەن کە هەستی قووڵی بۆ خۆی هەبێت، لایەنێکی تری سەرچاوەی شۆڕشو لادانەکانی ئەوەیە کە ژیان لە دیدی کۆمەڵگەکەی ئەودا بەهای نەبوو، بیرۆکەی تاوانی پێشوەختە هەبوو، هەوڵ دەدرا

جەستەی مرۆیی لە هەموو ویست و ئارەزوویەك رزگار بکرێت، هەموو ئەمانە وایانکرد خەڵکی چاوەڕێ مەملەکەتێك بن جیا لەم جیهانەو کەنارگیر و رەهبانیەتی تێدا بێت دوور لە کۆمەڵگەو لە جەرگەی بیاباندا بێت، ئەوە ئەو لادانە مەترسیدارە بوو کە بەرەورووی ژیانی سارتەر بوویەوە، بۆیە دواتر فەلسەفەکەی کاریگەر بوو بە هەموو ئەو هۆکارانە، سیمۆن دی بۆفوار ئاکاری سارتەری لە ژیاندا وێنا کردووەو دەڵێت: رقی بوو لە ماف و ئەرکەکان، لای ئەو هەموو شتێك لە ژیاندا کەمبەها بوو، لەوە تێنەدەگەیشت کە پیشەو هاوڕێ و سەرکردە بڕێ بنەما هەن کە جێی رەچاون، هەرگیز گەورەی خێزان نەدەبوو، تەنانەت ژنی نەدەهێنا، سارتەر هاوسەرگیری بە شتێکی گەورە دانەدەنا، هێندەی ئەوەی کەسێکی شۆڕشگێڕ بێت کەسێکی پشێوی ساز بوو، باری ناو کۆمەڵگەی بە شتێکی سووك سەیر دەکرد، بەوجۆرە دەبینین سارتەر دژ بە ئەو بارە ئایینیە بوو کە ئەورووپای تێدا دەژیا، هەر لەوەشەوە کەوتە دژایەتی هەموو بەهاکانی رەوشت و بیروباوەڕ، لەوەشدا لێکچووی فرۆید و مارکس بوو، چونکە ئەوانیش بانگەوازیان دەکرد بۆ دارماندنی بڕیارەکانی ئایین و کینەی زۆری دژ بە کڵێسا.

لەم مونتەلەقەوە ئایدۆلۆجیای تلموودی ئامانجێکی خۆی لە دژایەتی ئایین بە فەلسەفە بەدیکرد کە ماوەیەکی زۆر بوو هەوڵی بۆ دەدا، فەلسەفەی بوونگەراییش ناوی لێنرا فەلسەفەی لێکهەڵوەشێنی یان فەلسەفەی عەدەم، ئەمەش لەگەڵ فەلسەفەکانی تردا لەوەدا یەکدەگرێتەوە کە نکوڵی دەکات لە جیهانی پشت ماددە، لەوەشدا لێی جیاوازە کە بانگەوازەکەی بەکەمگرتنی دنیایە.

بێگومان ڕێبەرانی بانگەوازی بوونگەرایی هەموویان کەسانی نامۆ بون و ژیانیان پڕبوە لە بارگرژی (کیرکەجورد – گابرێل – ماسیل – هێرگرد – سارتەر)، نووسینەکانی کیرکەجورد ماوەی سەد ساڵ داپۆشراو بوون تا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا جوولەکایەتی تلموودی ئەو نووسینانەی دەرکرد و کەوتە بڵاوکردنەوەو وەرگێڕانیان.

هرگرد جەنگێکی بێ بنەمای دژ بەهەموو مەسیحیەت ڕاگەیاند وەك شوێنپێهەڵگرتنی بانگەوازێك کە توندتر بوو لەوەی نیتشە، مێژوونووسان ئاماژە دەدەن بە بڕێ لادانی بنەرەتی لە کەسایەتی هەریەك لە فرۆید و نیتشەدا، سەبارەت بە کیرکەجوردیش ئەوا دایکی خزمەتکارێك بووە کە باوکی بە نهێنی لەگەڵیدا دەستی تێکەڵکردووە، هەروەها پشتی چەماوە بوو بووە، ئەمەش وایکردووە هەست بە کەموکورتی بکات، بۆیە کەناری گرتووە لە کۆمەڵگەو دژایەتی کۆمەڵگەی کردووە، نووسینەکان بیست نووسین بون کە تیایدا بە سەختی هێرشی کردوەتە سەر کۆمەڵگە ئایینیەکەی و هەوڵیداوە کڵێسا لەناوبەرێت و بیری مەسیحیەت تێکبشکێنێت و خەڵکی بانگ بکات بۆ تەنها بڕوابوون بە خۆیان، لێرەوە بوونگەرایی بوو بە جەنگێك دژ بە هەموو ئایینەکان.

یەکێکلە مەترسیدارترین بانگەوازەکانی فەلسەفەی بوونگەرایی بانگەواز کردنیەتی بۆ نکووڵی کردن لە ئولوهیەت و پەرستشی خود، مرۆڤ بانگ دەکات تا بە تەواوەتی چێژ وەربگرێت لە بوونی و گەورەترین پشکی چێژ و ئارەزوو بۆ خۆی بەدیبێنێت.

هەڵوێستی سارتەر بەرامبەر بە ئولوهیەت لە تێگەیشتنێکی هەڵەوە دەردکەوێت کە مرۆڤ بە خوا دادەنێت، بۆیە بانگەواز دەکات بۆ

بەخوادانانی هەموو مرۆڤێك، ئەگەر سارتەر بە واتای دروستی خۆی لە ئولوهیە تێبگەیشتایە(خوای گەورە کە مندالّی نیە و لە کەسیش نەبووە و پەیوەندی بە کەسەوە نیە و کەس بە هیچ جۆرێك بۆی نیە لە رووی ئیتیحاد یان وەحدەتولوجودەوە پەیوەندی هەبێت پێیەوە) ئەوا هەلّوێستێکی تری دەبوو.

بیردۆزەی بەخوادانانی مرۆڤ کە فەلسەفە یۆنانیەکان بانگەوازیان بۆ دەکرد و چەند بیروباوەڕێکی تریش پەیڕەویان دەکرد، دەرگایەکی فراوانی کردەوە بۆ بانگەواز بۆ مرۆڤپەرستی و بەخوادانانی هەموو مرۆڤێك.

لە رۆمانی (الذباب)دا سارتەر خواوەندی خواوەندەکان(ژووپیتەر) دەدوێنێتو بەو واتا هەلّەیە وەسفی دەکات کە لە فەلسەفەی یۆنانیدا سەبارەت بە خوا هەیە، سارتەر دەلّێت: هەرکە منت دروست کرد خێرا لێتجیابوومەوە و خۆم دامالّی لە گەڕانەوەی ریشەییم بۆت.

ئەم پەیامە لە ئیسلامەوە زۆر دوورەو ئیسلام واناڕوانێت بۆ خوایەتی و بڕوای بە خوایەتی باوکایەتی نیە.

هەندێ لە توێژەران ملهوڕی سارتەر بەوە وەسف دەکەن کە زۆر زیاترە لە ملهوڕی سەردەم، ئەو تەنها نکولّی کردنی نەگرتوەتەبەر، بەلّکو لەبەرامبەر خوادا مرۆڤ بە خوا دەزانێت یان ئەو پەیامەی خۆی رادەگەیەنێت(خوا هەیە بۆیە مرۆڤ نەبووە).

سارتەر ئەم پەیامەی لە نیتشەوە و سەرچاوە بتپەرستیە یۆنانیە کۆنەکانەوە وەرگرتووە، بێگومان سارترە و نیتشە زۆر کاریگەر بون بە پەیامی لارێی خواوەندی زالّی ناو بیری رۆژئاوا کە لە پێش سەردەمی رێنیسانسدا زالّ بوو، ئەگەر بیری رۆژئاوایی لەگەلّ وەرگرتنی رێبازی

زانستی ئەزوونیدا پەیامی ئیسلامی سەبارەت بە خوایەتی لە بیری ئیسلامیەوە وەربگرتایە، ئەوا جیاوازیەکی زۆر دەبوو لە ئاراستەی فەلسەفەی نوێدا، چونکە ئیسلام بڕوای نیە بەو قسەی دەڵێت خوا مرۆڤی لەسەر شێوەی خۆی دروست کردووە، ئەم وتەیە لەلایەن قورئانو سوننەتی صەحیحەوە پاڵپشتی نەکراوەو و زیاتر لە پەیامی غەنووصیەتی کۆن دەچێت.

(وما قدروا الله حق قدره)، لە شانۆیی مێشوولەدا بیرۆکەی زاڵبوونی خواوەند بەسەر مرۆڤدا وێنەیەکی فەلسەفەی یۆنانیەو بیرێکی ساختەیەو گەڕانەوەیە بۆ ئەو بارە نارەوای مرۆڤ کە دواتر ئیسلام راستکردنەوەی کرد بۆ چەمکو واتای پەیوەندی خوا بە مرۆڤەوە کە بریتیە لە پەیوەندی میهرەبانی و لێبوردەیی، هەروەك فەلسەفەی بوونگەرایی پەیوەستە بە تاوانی پێشوەختەی مێژووییەوە.

**دکتۆر موحەممەد غەلاب دەڵێت:** سەرچاوەی رارایی یان هەندێ جار سەرچاوەی خەفەتیش لای ئەو بیریارانە ئەوەیە کە مەسیحیەت رازیکردنێکی تەواوی نیە بۆ ئەو داواکاریانەی عەقڵ کە بۆ تێگەیشتنی هەر شتێ بێت، بەڵکو زۆربەی جار بیروباوەری تەسلیمی بر و هزر لە پەیامەکەی دەردەکات، چونکە هەندێ بنەمای هەن کە لەگەڵ عەقڵدا بەیەکدەکەون، باسکال دەڵێت: تاوانباری رەگەزی لە دیدی خەڵکدا جۆرێك شێتیە، بەڵام ئایین بەوجۆرە پێشکەشی دەکات، بۆیە پێویستە لەگەڵ عەقڵ دووربگرن چونکە عەقڵ شتی وای قبووڵ نیە کە مرۆڤ تاوانی پێشوەختەی لەسەر بێت.

فەلسەفەی بوونگەرایی وەك بەرنگاربوونەوەیەکی فەلسەفەی مارکسی دێت: بانگەواز دەکات بۆ قوربانی دان بە کۆمەڵگە لەپێناو تاکدا، ئەمە

بەرامبەر بە ئەو بانگەوازەی مارکسیەت کە داوا دەکات تاك قوربانی بێت لەپێناو کۆمەڵگەدا.

ئەوان دەڵێن تاك لە مارکسیەتدا بەشەکیەو لە بوونگەراییدا ئەصل و بنەڕەتە، هەرچەندە داوا دەکات ڕێزی مرۆڤ بەرزڕاگیرێت خاوکات لە بازنەی فەلسەفەی ماددیدا هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات و وەك ئاژەڵێکی ماددی خاوەن ئارەزوو بۆی دەڕوانێت و خۆی بێئاگا دەکات لە لایەنە ڕۆحی و دەروونی و هزریەکانی مرۆڤ، ئەمەش بانگەوازێکە بۆ خۆرزگارکردن لە هەر کۆت و ڕێسا و بەهایەك، لەبنەڕەتیشدا پشت دەبەستێت بە نکوولی کردن لە ئولوهیەت و زیندووبوونەوەو پاداشت و ئەخلاق،لە بنەڕەتدا بە بیری بێهیوابوون لە ژیان هەنگاو دەنێت، بەرامبەر بە مەسیحیەت و بیری ئاینی ڕۆژئاوایی و کڵێساش دەوەستێت، مارکسیەت بوونگەرایی بەوە دەناسێنێت کە بانگەوازێکە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێنماییە عەقڵی و ڕەوشتیەکانی غەنووصیەت و بەکەمدانانی زانست و ئەخلاق.[1]

دکتۆر روجیە گارودی بەمجۆرە بوونگەرایی وەسف دەکات: بوونگەرایی فەلسەفەی داگیرکەرە، فەلسەفەی دارماندنی نەوەکانە، فەلسەفەی داڕووخانی کەسێتی مرۆییە، فەلسەفەی لەپێخستنی دەروونی مرۆییە لە بواری چێژ و ئارەزووەکاندا بەجۆرێك وای لێبکات نەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات یان بوونی خۆی دووپات بکاتەوە، فەلسەفەیەکی ماددیە کە ئامانجی چێژوەرگرتنی خێرا و ترسانە لە مردن.

چەندین بیریاری ڕۆژئاوایی بەرامبەر بیردۆزەی بوونگەرایی وەستاون و مەترسیەکانی ئەو بیرەیان لە چەند خاڵێکی بنەڕەتیدا:

---

[1] – مادة الوجودية في قاموس السوفييتي.

**یەکەم**: مرۆڤ وا لێدەکات کەنار بگرێت لە کۆمەڵگە.

**دووەم**: پێی خۆشە لایەنە ناشیرینەکانی سروشتی مرۆیی بخاتەروو و بانگەواز دەکات بۆ لێکهەڵوەشان.

**سێیەم**: هەوڵدەدات فەرمانە خواییەکان لەکار بخات و نکوولی دەکا لە بەها نەمرەکان.

**چوارەم**: بانگەواز دەکات بۆ بێهیوایی رەها و رەشبینی تەواوەتی و دارمانی ژیان.

**پێنجەم**: بانگەواز دەکات بۆ هەڵ"ەرانەوە دژ بە واقیع و هەموو بەهاکان و چی پەیوەندی هەبێت بە غەیبەوە هاودەم بە دەروونی مرۆیی بەرپەرچ دەداتەوەو بە هەموو جۆرێك دژ بە ئیمان دەوەستێت.

**شەشەم**:نکوولی دەکات لە بەرهەمی بەها و ئەزمووە مرۆییەکان و بانگەواز دەکات بۆ ئەوەی مرۆڤ سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە.

**حەوتەم**: زانست و ئایینو رەوشت بەکەم سەیر دەکات.

**هەشتەم**: یەك خالی کرانەوە بەرەو پێشرەوی یان بنیادی ژیان یان کارکردن لەپێناو کۆمەڵگەیەکی باشتری تێدا نیە.

**نۆیەم**: فەلسەفەیەکە تەواو رۆچووە لە تاکگەراییدا، نکوولی حەقیقەتی مەوزووعی واقیعی مرۆیی دەکات.

**دەیەم**: رەوشتی بووگەرایی رەوشتێکی ناساغە، پڕە لە رارایی و بێهیوایی و رەشبینی و حەزی مەرگ و لێڵی و خۆویستی تەواو.

**یانزەهەم**: بانگەواز دەکات بۆ سووربوون لە بێهیوایی و ماندانی خۆکوژیدا.

**دوانزەهەم**: بەستنەوەی کۆمەڵگەکان و لێدانیان و لەناوبردنی هیوا و ڕەوشت و غیرەت و دژایەتی کردنی مەردی و نەبەردی و قوربانیدان کارێکی تری بوونگەراییە.

**سیانزەهەم**:بانگەواز بۆ دوورکەوتنەوەو نەهێشتنی بنەما ڕەوشتیەکان.

توێژەران بەرامبەر بەم چەمكو واتایانە وەستاون و ساختەی ئەم پەیامەیان ئاشکرا کردووەو زۆرێکیان بە ڕوونی ئەوەیان ڕاگەیاندووە کە بوونگەرایی دیاردەیەکی کاتی تەواوبووە کە پاش ماوەیەکی کەم ڕۆژ تێیدەپەڕێنێت.

بێگومان بانەوازی بوونەرایی بۆ ئێمەو کۆمەڵگەو بەهاکانمان تەواو نامۆیە، چونکە بەرهەمی برێ باری تەواو جیاواز لەباری ئێمەیە، بە گشتی بەرهەمی چەند کۆمەڵگەیەکی دیاری کراوە لە چەند بارێکی تایبەتدا.

ئێمە دەزانین هەموو بیری ڕۆژئاوایی لەم دواسالانەدا بە تەنگژەیەکی سەختدا تێدەپەڕێت و هەڕەشەی زۆری لەسەرە، صەهیۆنیەتی جیهانیش لەڕێ ئایدۆلۆجیای تلموودیەوە تەواو تەنگی پێهەڵچنیوەو هەموو هێزێکی لێ دابڕیوەو پاڵپشتە ئەخلاقیەکانیشی لەناوبردووە وبە تەواوەتی دووری خستوەتەوە لە پەیامی ئایینی حەق.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە زۆرێك هەن لە وڵاتانماندا ئەو ڕاستیە دەزانن، کەچی لە ڕوانگە بریقەدارەکانەوە دەڕواننە ئەو بانگەوازانە، لەکاتێکدا کۆمەڵگەکانی ڕۆژئاوا خۆیان ئەو پەیامو ڕێبازانەیان تێپەڕاندون لەبەر نەشیاوی و خراپییانو تەواوی نەگونجانیان لەگەڵ فیترەت و سروشتی مرۆییو بەها باڵا مرۆییەکاندا، بەراستی بوونگەرایی بەرهەمی تەنگژەی مرۆڤی سەردەمو داوی بیردۆزەی ماددیگەریە کە ئارەزووبازی

بەرزرادەگرێت و ڕێی ئارەزووبازی دەکاتەوە، ئەمەش پاش ئەوەی دیواری ڕێساو سنوور و بەهاکان دادەڕمێنێت.

دیارترین مەشخەڵی بیرو ژیار و کۆمەڵگەی ئێمە ئەو بەسترانەوەی نێوان ڕۆح و ماددەیە کە هەیە، هاوسەنگی نێوان دنیا و ڕۆژی دواییە لە بازنەی یەکخواپەرستی پوختو بڕوابوون بە زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوە، ئایین بەشێکە لە کۆمەڵگە و بیری و سیستمی ئێمە، ڕەوشت دابەشکارێکی هاوبەشە بەسەر هەریەک لە پەروەردەو بواری کۆمەڵایەتی و سیاسەت و ئابووریشدا.

# باسی سێیەم

# هیپیەت

بانگەوازی هیپیەت کۆتا بەرهەمی ئەو گۆڕانکاریانەیە کە کۆمەڵگەی سەردەم لە ڕێی ڕێبازە ماددیگەریەکاندا پێی گەیشتووەو هەنگاوێکیشە بۆ ئەو دژایەیەی بەرامبەر بە هەموو بەها و ڕێسا و ڕەوشت و بیروباوەڕە مرۆییەکان دەکرێت، بانگەوازی هیپیەت پێی وایە مرۆڤی سەردەم هاواری دەست ڕارایی و پەرتبوونیەتی‌و وەڵامی پرسیارەکانی دەست نەکەوتووەو ناتوانێت لە نهێنی بوونی خۆی تێبگات، ئەمانەش تووشی نامۆییەکی سەختیان کردووە، بێگومان ئەو هاوارەی نامۆیی و ترس لە نەزانراوی زاڵکردووە بەسەر کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا، بوەتە سەرچاوەی ڕێگریەکی گەورە لە بنیادی گەلاندا، ئیدی هەرچەندە چی پێناوی خۆشگوزەرانی لە دەوری خەڵکدا هەن کەچی خەڵکی لە بۆشاییەکی دەروونی و ترس و دوورەپەرێزیدا دەژین.

هەموو ئەو ئایدۆلۆجیا و سیستم و ڕێبازانەی هەوڵیاندا ڕێبازی ژیان پێشکەش بە مرۆڤ بکەن شکستیان هێنا، یان تەنگژەی مرۆڤیان بەتەنگژەی گەدەو خواردن داناوە، یان پێیان وایە دەبێت ئارەزووەکان تا ئەوپەڕی سنوور بچن، بۆیە خەڵکی بەدوای ئارەزووەکاندا ڕاودەنێن، دواتر مرۆڤ لەو گەشتەی گەڕایەوە، ئەمە شتێکی نامۆ بوو لەو کۆمەڵگانەدا کە لەخشتەبردن و ئارەزووبازی دایگرتون.

وەڵامەکەش یەك شتە: چێژی ئیمان و بەخششی ڕۆح و ئارامی سوکنایی دەروون نەماوە، گیان ئازادی و متمانەو میهرخوازی خۆی لە تاکە سەرچاوەیەوە لەدەستداوە، توێژەران هەوڵیانداوە سەرچاوەکانی بانگەوازی هیبییەت بدۆزنەوە کە کۆتا هاواری ڕزگاربوون و دەروونە لە هەموو بەها و ڕێساو کۆتێك، کەچی تاکە وەڵامێك دەستیان کەوت بریتی بوو لە نامۆیی.

کۆلن ولسن لە کتێبی (نامۆ) دا دەڵێت: نامۆیی نەخۆشیەکە کە ڕیشەی قووڵی هەیە و پەیوەستە بە لەتبوونی دەروونەوە لەبەر نەبوونی یەکانگیری لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەی کە تیایدا دەژی، نامۆیی هاوچەرخ جیایە لەو امۆییەی کە لە سەرەدەمانی پێشوودا هەبو، نامۆ جاران وابوو هەرچەندە سەرسام و گوماناوی بوو کەچی ئیمانی لەدەست نەدەدا و بێهیوا نەدەبوو لە گەیشتن بە حەقیقەت، بەڵام نامۆیی ئێستا نامۆیی مرۆڤێکی دەستەوسانە کە بڕوای نیە بە بوونی هیچ شتێك، جاران نامۆکان هەوڵیان دەدا هاوکات لەگەڵ جیاوازیەکانیاندا یەکانگیری لەگەڵ جیهاندا بێننەدی، بەڵام نامۆکانی ئەمڕۆ بە تەواوەتی کۆمەڵگە ڕەفز دەکەنەوەو لێی دادەبڕێن.

توێژەران ئەو تەنگژەیە دەگێڕنەوە بۆ بنەرەتە دێرینەکانی، لەوانەش ولسن باسی لێوە دەکات کە لەو کاتەوەی نیتشە بانگەوازی دەکرد بۆ بنیادی کۆمەڵگەکان لەسەر بنەمای هێز و بەهێزان و کوشتنی نەخۆش و پەککەوتەکان ئەم تەنگژەیە ڕێی خۆی بڕیوە.

هەموو چیرۆك و ڕۆمانەکان ئەو مۆرکە تاریکەیان هەبوو کە بیری ڕۆژئاوایی وەریگرتبوو و بریتی بوو لە بڕوابوون بە تاوانی پێشوەختە.

دیستۆفسکی لە ڕۆمانەکەیدا وێنەی ئیڤان دەخاتەڕوو و دەڵێت بیرۆکەی ئازر بیرۆکەیەکی خۆسەپێنی ناو ئەو بوونەیەو سەختە ریشەکێش بکرێت.

ولسن پێی وایە ئەو مۆرکە کە زاڵ بووە بەسەر ئەدەبی ڕۆژئاواییدا پوختەکەی لە یەك دەستەواژەدا خۆی دەبینێتەوەو بریتیە لە بیری ئەو مرۆڤەی کە بڕوابوونی بە خوا لەدەستداوەو بەیلیشی نەبووە بۆ ئەو کەموکورتیە، ئەوە تنگژەی عەقڵی زاڵبوو بەسەر مرۆڤدایە.

عەقڵی رەها بوەتە پێگەی پرشنگدانەوەی سۆزداری لە مرۆڤدا، ئەوەش بیروباوەڕی ئایینیە، دواتر ئەو گۆڕانکاریە نوێیانە هاتن کە خۆیان دەبیننەوە لە (فرۆید و مارکس و لیڤی برێل و دۆرکایم و سارتەر)، هەموویان مرۆڤ دادەڕمێنن و بەرەو ئارەزووبازی دەبەن تا بیری لای تێرکردنی سێکسی و ئارەزووەکان بێت، ئیتر ئەو مرۆڤە دەبێتە رووتێکی بێ بەرگ، کیانی ویژدانی و هەستی دەروونی و ویستی رۆحی مرۆڤ تووشی چەقبەستوویی و نکووڵی و خۆگرتنەوەی حەقیقی دەکات، ئیتر هەر دەبێت هەست بکات بە نامۆیی و هەڵگەڕانەوەو رارایی، چونکە هێزێکی حەقیقی لە ناخیدا بەند بووە، لەکاتێکدا هێزەکانی تر ئازاد دەکات، هاوسەنگی سروشتی نێوان هێزەکانی مرۆڤ(بە رۆح و ماددەوە) پێناوی ژیانی حەقیقین.

ئەوە ئەو تەنگژە حەقیقیەیە لە پشت بانگەوازی هیبیەتەوە کە بە نامۆیی جموجووڵیەوە بەشێکی زۆری جیهانی ئەمڕۆی گرتوەتەوە و لە بەهاکانی کۆمەڵگەکان دەریکردوون و گێڕاویەتەوە بۆ رەوشتی دارستان و مۆرکی ئاژەڵی، ململانێیەکی سەخت هەیە لە نێوان واقیعی ماددی تەواو

ئەو هێزە بەندکراوانەدا، جاران لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دەسەڵاتی کلێسا قەوارەی ماددی بەند دەکرد و داوای دنیانەویستی و رەهبانیەت و کەنارگرتن لە ژیان و نکوولّی کردن لە دیدە فیترەتیە رەسەنەکانی ناو دەروونی دەکرد.

کاتێك ئەو کۆتە شکا و نەما مرۆڤ لە روانگەیەکی ترەوە گەیشتە ئەوپەڕی رێ، وەتە بەندکردنی هەست و رۆحانیەت و رەهاکاکردنی ئارەزووەکان وبانگەوازی دەکرد بۆ بتپەرستی و بێڕەوشتی.

لێرەوە تەنگژەی نوێی مرۆڤ هەمان تەنگژەی کۆنە بەلاّم لە روانگەیەکی ترەوە، فەلسەفە و رێباز و ئایدۆلۆجیاکان نەیانتوانی هاوسەنگی و دادپەروەری و تەواوکاری و میانەڕەوی نێوان دوو رەگەزی بنەڕەتی مرۆڤ ببەخشن کە بەهیچ جۆرێك نابێت یەکێکیان پشتگوێ بخرێت و ئەوی تریان لەسەر حسابی لایەنەکەی تر بەرزتر راگیرێت.

ئەو چارەسەرانەی کە ئەلبیر کامیو سارتەر باسیان کردون نەیانتوانیوە تەنگژەکە چارەسەر بکەن، بەڵکو تەنگژەکەیان زیاتر کردووە، دوو بوونگەرا لە سەرچاوەیەکی تەواو ماددیەوە دەرکەوتون، بانگەواز کردن بۆ رزگاربوون لە بەها یەکدوای یەکەکان بانگەوازکردنە بۆ رزگار بوون لە ئایین و بیروباوەڕ و بڕوابوون بەخوا، ئەمەش چارەسەری کێشەکە نیە، بەڵکو ئاڵۆزتری دەکات، رێی رووناکی نیە بەڵکو رێی زیاتر بەرەو تاریکی چوونە.

هەستکردن بە رارایی ناروونی وا کە مرۆڤی سەردەمی گیرۆدە کردووە بەرهەمی زاڵبوونی ماددەو بانگەواز کردن بۆ بەخواکردن و پیرۆزراگرتنی عەقلّ و بەکارهێنانی زانستە بۆ جەنگ هەڵگیرساندن، رێیەکیش نیە بۆ گەیشتن بە چارەسەر مەگەر بە گەڕانەوەیەکی تر بۆ ئەو حەقیقەتە

رەسەنانەی کە مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتاوە دەیزانین، ئەویش بریتیە لە گەڕانەوە بۆ فیترەت و ئایینی حەق، ماددە هەموو شتێك نیە، عەقڵ ئامێرێکە لە دراوە بە مرۆڤ بۆخزمەتو بنیادی ژیانی، شارستانیەت بۆ خزمەتی جەنگ و وێرانکاری نیە، بەڵکو بۆ خزمەتی مرۆڤایەتیە تا بەرەو پێشەوە پێشڕەوی پێ بکات، پێشڕەوی مەعنەوی و ماددیش پێکەوە، بۆیە ڕێی راست بریتیە لە رزگار بوون لەو بەها ساختە نارەوایانەی کە ڕێبازە ماددیگەریەکان دایانهێناون.

دکتۆر موصتەفا بەدەوی دەڵێت: تەنگژەی نوێی مرۆڤ بریتیە لە تەنگژەی ئەو مرۆڤە هەستیارە ژیرەی کە بڕوابوون بە خوای لەدەستداوە، شتێکی وایشی دەست نەکەوتووە کە پێویستی سۆزداری خۆی پێ پڕبکاتەوە کە جاران ئیمان بۆی پڕدەکردەوە، ئەویش تەنگژەی یاری زانست و بیرکردنەوەی عەقڵیە تیایدا کە رۆڵێکی زۆری هەیە و دواجار بوەتە هۆی لاوازی بیروباوەڕی ئایینی، ئەو تەنگژەیە ئەنجامێکی نامۆیە کە بریتیە لە ناوزڕاندنی مایەپووچی عەقڵیو بیرکردنەوەی عەقڵی.

کۆلن ولسن دەگاتە هەمان ئەنجام و بانگەواز دەکات بۆ وەرگرتنی هەڵوێستێکی ئایینی و بەدیهێنانی گونجاندن و هاوسەنگی نێوان سێ هێزەکەی مرۆڤ: جەستەو عەقڵ و سۆزداری، چونکە مرۆڤ یەکەیەکی دابەش نەبووە، ولسن دەڵێت: رامانی رۆحی لەوانەیە مرۆڤ و بوون پێکەوە یەکبخات، ئەو رامانە توانای ئەوەی هەیە عەقڵ لە دەسەڵاتی ماددە رزگار بکات و وای لێ بکات لایەنەکانی سروشت لە دەوری گەشە پێ بدات، ئەوکات هەموو شتێك واتای رۆحی هەیە.

زەوی و ئاو و ڕووناکی و بەرهەم و گوڵ لەو بارەدا هەرگیز نابنە تەنها دیاردەیەکی سروشتی کە مرۆڤ سوودیان لێ وەربگرێت تا ئەوەی ئەگەر سوودەکەی نەما بیرکردنەوە لێیشی سوودی نامێنێت بەڵام دەبێتە بڕێ شتی پێویست بۆ بەدیهێنانی یەکبوونی نێوان مرۆڤ و بوون.

ولسۆن پێی وایە تەنگژەی نامۆیی لەدەستدانی ئیمانە، تیایدا لە بارێکی ڕاڕایی و دوودڵی و سزادا دەمێنێتەوە تا ئەوەی زاڵ دەبێت بەسەر شتێکدا کە سۆزی لەدەستچووی ئایینی پێ تێر دەکات، ئەوکات ئەو ڕوانینە نامێنێت کە بیرکردنەوەی نامۆ خراپەی تێدا زاڵە.

هەروەها پێی وایە پشت بەستن بە تەنها بیرکردنەوەی عەقڵی توانای چارەسەری کێشەکانی نامۆیی نیە، چونکە پێ ئیمکانیاتی تر لە مرۆڤدا هەن کە دەبێت بقۆزرێنەوە، ئەوانیش بریتین لە ویست و عەقڵ و سۆزداری، ئەو نامۆیەی کە بیروباوەڕی ئایینی لاواز بووە بە هۆی زاڵبوونی بیرکردنەوەی عەقڵی ڕەهاوە کە دیاردەیەکی گشتی ناو ژیانی ئەمڕۆمانە، پێویستیەکی تەواوی هەیە بە بەدیلێك تا سۆزداری ئایینی بۆ تێربکاتەوە و ئەو فریاگوزارەی بۆ بێت کە بەدوایدا دەگەڕێت، بانگەوازیش دەکات پێش هەموو شتێك مرۆڤی هاوچەرخ ڕزگار بکرێت لە بڕێ بیروباوەڕی وەهمی کە گرنگترینیان بیرۆکەی تاوانی پێشوەختەیە کە زاڵە بەسەر مرۆڤی مەسیحیدا و بەربەستی بەردەم ڕوانینی حەقیقیە.

هەروەها پێی وایە دەبێت کەسی نامۆ لەو بیری تاوانە یەکەمینە ڕزگار بێت چونکە لە سنووری تێگەیشتنیدا ئەمە ئەو بەربەستەیە کە ناهێڵێت ڕۆحی مرۆڤ بگات بە حەقیقەت.

ئەگەر کۆلن ولسۆن راستی پێکابێت ئەوا هەڵەی کردووە لە چارەسەردانانیدا، چونکە داوای روانینێکی صۆفیگەرایی دەکات و داوای ئەوە دەکات ویست شوێنی ئیمان بگرێتەوە، کاتێ رووەو فەلسەفەی کۆنی هیندی هەنگاو دەنێت داوای ئەو بەخششەی لێ دەکات کە دەکرێت مرۆڤی هاوچەرخ لەم تەنگژەیدا وەك دەرمان بەکاری بهێنێت، ئەمە ئەو چەرمەسەریەی بیری رۆژئاوایە کە پیلانەکانی ئایدۆلۆجیای تلموودی صەهیۆنی بەسەریدا زاڵە، چونکە کاتێ دەردەکەوێت مرۆڤ کێشەکەی خۆی دۆزیوەتەوە خێرا بەرەو گیرۆدەبوونێکی تری دەبات، چی دەبێت ئەگەر رووەو ئیسلام هەنگاو بنێن، بەراستی تەنها لە ئیسلامیشدا بەخششی حەقیقی دەستدەکەوێت، فەلسەفەی هیندی کۆن کە هیوای پێ دراوە تا چارەسەر بدات بەم تەنگژەی ئێستای مرۆڤایەتی، تەنها بارێکی تری نامۆییو رارایی و گیرۆدەیی دەبەخشێت، وەك وەحدەتولوجودو حلوولو ئیتیحادو برێ چەمكو واتای بتپەرستی کە مەترسییان کەمتر نیە لە مەترسی بتپەرستی ئیغریقی سازێنەری تەنگژەکەو بەدیهێنەری نامۆیی، فەلسەفەی هیندیش زیاتر نامۆییەکە خەست دەکاتەوەو هەرگیز ئەو ویستو وزەی پێ نابەخشێت کە کۆلن ولسۆن بانگەوازی بۆ دەکات، هەرگیز حەقیقەتی ئیمانیشی پێ نابەخشێت مەگەر کاتێك بڕوابهێنێت بە خوای تاكو تەنهای بێ هاوەڵو خولقێنەری هەموو شتێك، بەدیهێنەری بوونو مرۆڤ.

حەقی خۆیەتی بڵێین ولسۆن و کەسانی تریش لە بانگەوازیان بۆ رزگاربوون لە دەسەڵاتی عەقڵ و ماددەو تاوانی یەکەمین برێ هەنگاوی روونیان ناوە، بەڵام بەداخەوە نەیانتوانیوە مەترسیەکە تێپەڕێنن یان

هۆکارەکانی تەنگژەکە تێبگەن، چونکە لە مونتەلەقی فەلسەفەی ماددیەوە هەنگاویان ناوەتەوە.

ئەو مۆرکە رەشبینیەی کە نغرۆ بووە لە پەیامی ناخۆشیو رەقیو تۆڵەسێنیو ئازادیدا، دەگەڕێتەوە بۆ پەیامی هەڵەی رۆژئاوا بۆ کۆتایی تراژیدی پاڵەوانەکان کە خۆی دەبینێتەوە لە ململانێی نێوان خواوەندەکانو مرۆڤدا، بوونی ئەمەش وەرگیراوە لە پەیوەندی فەلسەفەکان بەو شوێنەوارانەوە کە جێماوەی بیروباوەڕە کۆنەکانو نەیانتوانیوە بە رووی جیاکاری بکەن لەنێوان خوای تاکو تەنهاو مرۆڤو جیهاندا، ئەو هەڵەی پەیوەندی هەیە بە بوونە خوای مرۆڤ و پەرستشی پاڵەوانەکانو بوونیان بە خواوەندو ریزبەندی خواوەندەکان لە بیری رۆژئاوایدا، ئەم بیرە ناتوانێت روانینێکی پرشنگداری راوەستاو لەسەر هیوابوون بە خوا بدۆزێتەوە ە میهرەبانی و لێبوردەیی و برایەتی روناکی کردبێتەوە و دوور بێت لەو رەقیەی نیتشە و تاکپەرستی و بەخوادانانی بوونو چەمکی هەڵەو تاوانی پێشوەختەو ۆتانەهاتنی نارەحەتیەکانی مرۆڤ، مرۆڤ تاکە بوونەوەر نیە، بەڵکو بەندەو دروستکراوی خوایەو خوا لەسەرزەویدا جێگری کردووەو لە تاقیکردنەوەدایە لەسەر توانای بەجێگەیاندنی راسپێراوی، ئەمەش بەپێی ئەو رێسایانەی بۆ دانراون و لەسەر بنەمای پاراستنی کۆمەڵگەو بەرزراگرتنی پایەی لەئاست ئاژەڵاندا و رێزگرتنی بە پێکهاتەی ماددەو رۆح و دڵ و عەقڵ و دنیا و رۆژی دوایی، بێگومان چەمکو واتای فەلسەفەی کۆنی بتپەرستی کاتێ تێکەڵ بوو بە بیروباوەڕ وێنەیەکی تاریك و ناشیرینی بەخشی بە واتای (الله)، کاتێ عەقڵی رەخنەگر هات نکوولی کرد لەو چەمکو واتایانەو هەستی کرد بە دەستەوسانی ئەو بیروباوەڕانە لە ئاست بەخششی حەقیقیدا، ئەوە ئەو تەنگژە حەقیقیەتی کە بەرەو نکوولی کردن لە خواو لە گومانکردن لە

هەموو رەحمەت و گەورەییەکی دەبات، هەر ئەمەشە باوەڕی خەڵك دەلەرزێنێ و بیروباوەڕیان دەشێوێنێ‌و رێ نادات لە ئایینی حەق تێبگەن و دەمارگیرین بەرامبەر ئەو ئایینە، هێشتا نەگبەتیەکە لەوەدا قووڵ بوەتەوە کە لە بتپەرستی ئیغریقەوە بەرەو غەنووصیەتی کۆنی رۆژهەڵاتیان دەبات، ئەمەش نامۆیی و بەریەککەوتن زیاتر دەکات،خوا دەفەرموێت( وأن هذا صراطي مستقيما فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرق بكم عن سبيله).

دیارترین بەخشی عەقڵ لە گەشتی بێ بەڵگەی‌و بەرزراگیری و تاککەرایی‌و هەڵگەڕانەوەی بەرامبەر رێرەوی بوون و سوننەتە سروشتیە مرۆییەکان و هەوڵی لەناوبردنی ئەو سوننەتانە بە نکووڵی کردن لە خوا و گەڕان بەدوای رێی تری وادا کە یەکدوای یەك رووخێنەری یەکترن بریتیە لە بێتوانایی لە بەخشینی هەر راستیەك بە دەروونی مرۆیی یان کردنەوەی هەر دەلاقەیەکی رووناکی.

هاواری ئەمڕۆ لە بەرنگاربوونەوەی ڕاڕایی و نامۆییدا ئەوەیە هەرچیەك مرۆڤایەتی هەوڵیداوە لە گەشتی دورودرێژی بەدوای حەقیقەتدا بەدیبهێنێت سەرینەگرت و فەلسەفەش سەرکەوتوو نەبوو، مێژوو و زانست سەرکەوتوو نەبوون، زانست هەموو توانا و هەوڵەکانی خۆی بەکارهێنا کەچی دانی نا بە دەستەوسانی خۆی لەبەردەم پرسیارە هەمیشەییەکاندا(بۆچی دەژین؟) تەنانەت خودی زانستیش وەك کۆتا قەڵغان کەوت و شکستی خوارد، دەی ئەگەر فەلسەفەو مێژوو و زانست سەرکەوتوو نەبوو ئیتر فریاد رەس چی بێت و بەرەو کوێ هەنگاو بنێین؟ ئەمە ئەو هاوارەی ئەمڕۆیە کە ناویان ناوە کۆمەڵگەی نامۆیی مرۆڤ.

لێرەدا مارکوز که فەیلەسوفێکی صەهیۆنی ناسراوە وەڵام دەداتەوەو دەڵێت: کۆمەڵگەی نامۆیی مرۆڤ دەبێت لە مێژوودا نەمێنێت، چونکە ئێمە جیهانێکی نوێ دروست دەکەین، ئەمە هەمان وەڵامی ڕۆحگەرایی نوێیە و بەهائیەتیشە.

مارکۆز پێی وایە سەرمایەداری و مارکسیەتیش شکستیان هێناوەو ڕێی بەردەم پێشبینی نارِوون و نادیار کراوەیە.

بانگخوازانی جیهانیبوون کە پەیامی خۆیان لە ئایدۆلۆجیای تلموودیەوە وەردەگرن بێدەنگن لە نیشاندانی وێنەی نوێی کۆمەڵگەدا و دەستەدەستەی گەنجان بەرەو ڕەدکردنەوەو نامۆیی دەبەن بێ ئەوەی یەك مۆمیان لەبەردەمدا بێت، ئەگەر هەموو بەربەستەکان نەمان ئیتر ئەو پرسیارانە چییان لێ دێت؟ بەدڵنیاییەوە جارێکیتر دەنەونە زیندوکردنەوەی غەنووصیەی ڕۆژهەڵاتی کۆن.

مەهاریشی بانگەواز دەکات بۆ ڕامان لەسەر نەشوەو کەیف لە سایەی مارجوانادا، ڕامانی خود و گەڕان بەدوای حەقیقەت لە سەرچاوەکانی دەروونیدا، بەڵام چ دەروونێ دەتوانێت ڕێنموون بێت؟ بەخشش هەرگیز لەناوخۆوە نابێت، بەڵکو لە کەونی فراوانەوەیە، بەخشش لە دەرەوە دەبێت: لەو کەونە فراوانەی خواوە کە حەقیقەت نیشان دەدات(قل انظروا ماذا في السموات والأرض)، (إن في خلق السموات و الأرض واختلاف الليل و النهارو الفلك التى تجري في البحر بما ينفع الناس و ما أنزل الله من السماء من ماء فأحيا به الأض بعد موتها و بث فيها من كل دابة و تصريف الرياح و السحاب المسخر بين السماء والأرض لآيات لقوم يعقلون).

تەنها لە ئیسلامدا ڕووناکیەك هەیە کە ڕێی ڕاست ببەخشێت بە مرۆڤایەتی.

بانگەوازەکەی مەهاریشی گۆڕا بۆ رامان لە رێی مادده سڕکەرەوە (ماریجوانا-ل-س-د)، دواتر لەوێوە بەرەو ماددەیەکی کاریگەرتر دەچێت، ماددەی ت، ماددەی س-ت-ب- کە کاریگەریەکەی ٧٢ کاتژمێری تەواو بەردەوام دەبێتو بارێکی هەڵچوونی سەخت دروست دەکات، بۆچی دەیانەوێت مرۆڤ لاواز و پەککەوتە بێت؟ ئایا ئەوەیە بەختەوەری و چێژ و مەعریفەو گەڕان بەدوای حەقیقەتدا؟ نا بەراستی ئەمە بێهواییەکی مرێنەرە، ئەمە هیوابڕانە،موسڵمان مەگەر کاتێك بگات بەو بارە کە ئیمانی خۆی لەدەست دەدات، موسڵمان هەرگیز بێهیوا نابێت و ئومێدی بە رەحمەتی خوا دەمێنێت و رێی لێ ناشێوێ.

کۆمەڵە بوونگەراکان بەهۆی هیبیەتەوە بوونە چەند کۆمەڵەیەکی راکردوو لەواقیع و بەرەو توندوتیژی و خراپە هەنگاویان نا و روویانکردە ماددەی سڕکەرەکان و برێ بیری نوێی تەواو سلبی بەناوی پیۆصۆفی ناو فەرهەنگی هیندۆسی کۆن و براهاما و بوژا و جینا.

بتپەرستە رۆژهەڵاتیەکان چەندین خواوەندیان دەپەرستو تاکەرێیان ببوو بە پاشەکشە لە ژیان، گوازرانەوەی گەشتی دووردرێژ لە تپەرستی یۆنانیەوە بۆ بتپەرستی غەنووصی تەنها لە وێنەدا گۆڕاوەو بەس ئەگەر نا هەر یەك کەرەستەن، چونکە بڕوابوون بەوەی بوونی ماددی خوایە ئەوپەری پەیامی ماددیگەریە، هەر ئەمەش رێبازی وەحدەتولوجود و حلوول و ئیتیحاد دەنوێنێت.

لەراستیدا ئەم ژیانە یان شاخ و دەریا و رووبارەکان خوا نین، بەڵکو خوا بەدیهێنەری هەموو ئەوانەو هەموو بوونە، ئەمە واتە شکستی فەلسەفەی ماددیگەری نەبوویە سەرکەوتن بۆ توێژەران کاتێك لەبری ئەو

فەلسەفەیە رووبانکردە فەلسەفەی غەنووصی رۆژهەلاتی، بەلکو شکستەکەیان قورستر بوو، لەو پەڕی بێرەوشتیەوە رووبانکردە ئەوپەڕی دنیانەویستی و دوورگرتن لە ژیان، لە ئارەزووبازیەوە رووبانکردە خۆگرتنەوەی تەواو لە ئارەزووەکان، هەردوو رێبازەکەش پەرگیری و ترس و نامۆیی و رەشبینییان لێدەکەوێتەوە، ئەوان پێیان وایە کەسە راراکان ئێستا بەرێی بووزا و براهاما و جینادا وەك دەستەو تاقمێك رووەو هیواو ئومێد هەنگاو دەبڕن، بەلام ئێمە دەلێین ئەو هەنگاونانەیان نەك بەرەو هیواو ئومێد نیە بەلکو رووەو ئەوپەڕی نامۆییە، تەنها رێ مابێت بەس ئیسلامە، دەی با تاقی بکەنەوە.

## مرۆڤ لە تەرازووی ئیسلامدا

بێگومان مرۆڤ ئامانجی فەلسەفەو بانگەوازە رووخێنەرەکانەو جێی تاقیکردنەوەی ژیان و مردنیشە، ئەو بانگەوازانە هەولْ دەدەن بەرنامەیەکی بۆ دابنێن کە لە فیترەتی مرۆیی دەری بکاتودووری بخاتەوە لەو رێبازەی کە ئایینی حەق دایناوە بۆ مرۆڤ، هەولەکەش پەیوەستە بەچەند شتێکەوە، گرنگترینیان:

**یەکەم**: هەولدان بۆ ئەوەی بلێن عەقلی مرۆڤ بەسە تا رێی ژیانی مرۆڤ دیاری بکات و رێنموونی بێت، بەلام عەقلی مرۆڤ ئامێرێکە کە بە تەنها ناتوانێت رێنموونی ببەخشێت و رێنموونیش پەیوەستە بە سروشەوە، سروش ئەو زانستە خواییەی کە هیچ گومانێکی لەسەر نیەو بە دلنیاییەوە مرۆڤ بەرەو رێی راست دەبات، لەکاتێکدا گومان و دوودلی چواردەوری

هەموو ئەو بانگەواز و فەلسەفانەی تری گرتووە کە لە پشتەوە چاوچنۆکی مرۆیی خۆی مۆڵداوە.

بەراستی مرۆڤ ناتوانێت تەنها بە عەقڵی مرۆیی ڕێی روون ببینێت، عقڵی مرۆیی توانای تەواوی نیە بۆ بینینی هەموو شتێك، بەڵکو تەنها لە جیهانی هەستپێکراودا توانای هەیە، بەڵام لە جیهانی غەیبدا ڕێنموونی سروش نەبێت عەقڵ هیچی پێ ناکرێت.

**دووەم:** هەوڵدان بۆ ئەوەی مرۆڤ لە هەموو کۆتەکانی رەوشت داماڵن یان بەرەو ئارەزووبازی ببەن.

بێگومان فیترەتی مرۆیی ڕێی چاکەو خراپە دەزانێتو ڕێنمونی ئایینی خوای وەرگرتووەو دەزانێت لە دنیادا لە تاقیکردنەوەدایە.

ئیسلام دان دەنێت بە ویست و ئارەزوەکانی مرۆڤداو لە بازنەی برێ ڕێسادا مافی پەیرەوی ئەو ئارەزوانەی داوە، گرنگترین ڕێساش بریتیە لە میانەرەوی و دادپەروەر بون و پاراستنی کیانی خۆی، ئیسلام مەترسی دەرچوون لە رەوشتو ئاکاری بۆ مرۆڤ خستوەتەڕوو.

**سێیەم:** هەوڵدان بۆ ملکەچکردنی مرۆڤ بۆ بیردۆزە مادیەکان، بێگومان مرۆڤ بۆ ملکەچکردنی وا نابێت، چونکە مرۆڤ وەك پێکهاتە رۆح و جەستەشەو دەبێت زانستێکی نوێ زاڵ بێت پێچەوانەو جیا لە بیردۆزەی ماددیگەری، چونکە ماددیگەری لەسەر بنەمای ماددیگەری دەروانێتە ژیان، بۆیە ڕێبازی توێژینەوەی مرۆڤ دەبێت گشتگیر و تەواو بێت و لەسەر بنەمای عەقڵو جەستەو رۆح بێت.

بێگومان ئەوەی وا بڕوانێتە مرۆڤ کە تەنها عەقڵو جەستەیەو پێت وابێت ڕێبازی زانستە ماددیەکان یان ئەو ئەزموونانەی بەسەر ئاژەڵاندا

پەیڕەو دەبن بۆ مرۆڤ دەبن، ئەوە بە تەواوەتی پێچەوانەی واقیعی مرۆڤن و دەتگەیەننە بڕێ ئەنجامی ناحەقیقی.

**چوارەم:** هەڵەی بە بتپەرست دانانی مرۆڤ و دواتر گەیشتنی بە یەکخواپەرستی: چونکە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە لە بنەرەتدا یەکخواپەرست بووە، دواتر هەڵەی بتپەرستی هاتوەتە مەیدان و پەیامە ئاسمانیەکانی لارێ کردووە، بەردەوام ئایینەکان یەکدوای یەك هاتون بۆ راستکردنەوەی ئەو لارێکردنە.

**پێنجەم:** هەڵەی پەیامی پەرەسەندنی رەها، ئەو پەرەسەندنە لە بۆشایی دا روونادات و دەبێت خاڵێکی بنەرەتی هەبێت بۆ مرۆڤایەتی کە بتوانێت بەدەوریدا بخولێتەوەو و بجوولێت.

**شەشەم:** مرۆڤ ئاژەڵ نیە وەك ئەوەی فەلسەفەی ماددیگەری دەیڵێت، مرۆڤ بە لەدایکبوونی هەڵەی لەسەر نیە وەك ئەوەی لە بڕێ بیروباوەڕدا باسکراوە، مرۆڤ ملکەچ بە تەناسوخ نیە وەك ئەوەی بووژیەت باسی دەکات، مرۆڤ کۆیلەی ئارەزووەکانی نیە، بەڵکو توانای هەیە لەرێی ئایینەوە رووەو چاکەو رێنموونی هەنگاو بنێت، خوا دەفەرموێت(ونفس وما سواها فألهمها فجورها و تقواها) (قد أفلح من زكاها و قد خاب من دساها)، ئامانجی ئیسلام ئەوەیە هاوسەنگی لە مرۆڤدا بێنێتەدی، ئیسلام نە خۆبێبەشکردنی پێ قبووڵە نە بێڕەوشتی.

بێگومان سورشتی مرۆڤ پێویستی بە ئاراستەکردنێکی خودایيە، سروشتی مرۆڤ سەرپێچی نیە(فطرة الله التى فطر الناس عليها لا تبديل لخلق الله)، مرۆڤ لە سورشتی خۆیدا بەرەو خۆشی هەنگاو دەبێت، کە خراپەش هات جەنگی دژبە بێهیوایی دەکات، چارەسەریش بۆ مرۆڤ لە نوێژ و

پەیوەندی بوونە بە خواوە، هەرگیز مرۆڤایەتی ناتوانێت بێباك بێت لە ڕێنموونی ئایین با چەندە لە ڕووی ماددیەوە پێشکەوێت، سروشتی مرۆیی بیرچوونەوەو بێئاگایی لەگەڵە، بۆیە بەردەوام پێویستی هەیە بە بێدارکەرەوەیەك، قورئانیش بێدارکەرەوەیەتی و گوێ و دڵەکان رادەچڵەکێنێت.

لە تەشریع و ئەخلاقیشەوە بە ڕوونی ئەوە دەردەکەوێت کە مرۆڤ پێویستی هەیە بە بڕێ یاسا کە ڕێی راستی بۆ زامن بکات تا لە سنووری خوا دەرچوون رەوا نەکات مەگەر لە باری زۆر زۆر پێویست نەبێت، بۆ رەوشتیش بە هەمان شێوەیە.

لێرەوە گرنگی بوونی دوو دیاردەی خۆرێکخستن و داخ خواردنەوە دەردەکەوێت کە لە سەردەمی نوێدا ناوی خۆگرتنەوەیان لێنراوە، هەرچەندە سروشتی مرۆیی بە هەموو تواناکانیەوە ناتوانێت رێی سەختی دەرچوو لە سنووری خوا بگرێتەبەر، ئەگەر مرۆڤ نەیتوانیایە دژی قەدەغەکراوەکان بوەستێت و زاڵ بێت بەسەریاندا ئەوا خوا فەرزی نەدەکرد لەسەری.

لێرەوە پیسی ئەو بانگەوازە دەردەکەوێت کە دەڵێت ئەو خۆگرتنەوەیە زیانی هەیە بۆ دەروون یان بۆ عەقڵ، زیان لەوەدایە کە ئەوەی خوا حەلاڵی کردووە تاك لەخۆی حەرام بکات یان دژی سروشتی مرۆیی بێت یان بەبگرێت بە پاڵنەرە مرۆییەکان، ئەمەش ئیسلام قبووڵی نیە، بەڵکو ئیسلام ڕێی داوە بەو پاڵنەرو ئارەزووانەو داوای کردووە لە بازنەی ڕێسا دروستەکاندا پەیرەو بکرێن، ئەوە هەندێ ئایینن حەرامیان کردووە یان رای هەندێ پزیشکە کە پێیان وایە ئەو ئارەزوانەش نەخۆشییان لێدەکەوێتەوە.

بەلاّم ئیسلام دان دەنێت بە حەقیقیەتی بوونی ئەو ئارەزوو وپالنەرانەدا و دواتر هەنگاو دادەنێت بۆ پەیڕەویان، ئەگەر نەکرا خۆراگرتن.

بێگومان مرۆڤ دروستکراوە تا کار بکات و هەولّ بدات و بجولّێت و بەرگری بکات، دەبێت هەولّی خۆی لەسەرزەویدا نویّ بێتەوەو هەولّەکەشی بۆ ئامانجەکەشی ئیجابی بێت، بۆیە بەردەوام پێویستی هەیە بە بیرخستنەوەو ئاراستەبەحشین، بەردەوام پشت بە خوا ببەستێت، پشت بەستن بەخوا داوای ڕێنموونی خوایە لە کارو جوولّەدا نەك لە دانیشتن و پالّدانەوەدا، بۆیە مرۆڤ بەسروشتو پێکهاتەی خۆی بەردەوام پێویستی بە بیرو و بیرخستنەوە هەیە، دەبێت بەردەوام ئامانجی خۆی دیاری بکات و بەدوای ئەو هێزەدا بگەڕێت کە سەرکەوتنی ناو ژیانی بۆ دێنێتەدی، ئەوەش تەنها لە بڕوابوون بەخوا و لەخواترسانو هیوابوون بە خوادایە.

بۆیە ئەو قسەی دەلّێت مرۆڤ پێگەیشتووەو پێویستی بە ڕێنمایی ئایین نیە پیلانێکی تلموودیە لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە مەترسیدارەکانی تلموودیدا، دەی با زۆر وریا بین و تا دەکریّ بێدار بین بەرامبەر هەرچیەك لە دەورماندایە.

## مـــردن

ئەو هاوارەی لە ترسی مردن بەرزبوەتەوەو لووتکەی هەولّێکە کە بیردۆزەی ماددیگەری پێی گەیشتووەو لە ناخی خەلّکدا دروستی کردووە، وایکردووە تەواو لە مەرگ بترسنو حەز بە ژیان بکەن، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە هەندیّ زانا پێیان وایە کاربکرێت لەپێناو درێژکردنەوەی ژیان و لەناوبردنی پیریدا تا دژ بە سوننەتو مۆرك و پێکهاتەی کرۆکی بوونی ژیان بوەستنەوە.

بێگومان زانست ناتوانێت لەو بوارەدا ڕێنموونی بەخش بێت، چونکە مردن ڕاستیەکی تەواوە، لە هەندێ چەمکی زانستدا مەرگ وەك غەریزە باس کراوە، ژیانی بێ مەرگ بوونی نیەو مرۆڤ دەبێت لەدایکبوون و مەرگیشی بێتە ڕێ، لە پەیامی ئیسلامدا مردن کۆتایی ژیان نیە، بەڵکو قۆناغێکی گواستنەوەیە لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر، مرۆڤ هاتوەتە دنیا تا ئەرکی خۆی لەسەرزەویدا بەجێبگەیەنێت، بۆیە پاش ماوەی ژیانی خۆی دەمرێت و دەچێتە قۆناغی دووەم کە قۆناغی مەرگە، قۆناغی مەرگیش بە زیندووبوونەوەی گشتی و گشتگیر کۆتایی دێت، ئەمەش پێشەکیە بۆ لێپێچینەوەو پاداشتی کردەوەکان، ئەمەش پێشەکیەکە بۆ ژیانی هەتاهەتایی بەهەشت یان دۆزەخ.

ئەمە تێگەیشتی ئایینەکانە کەسروش پێی بەخشیوین تا ئەرکمان لە ژیاندا بزانین و تێبگەین ژیان صودفە نیەو هەرلەخۆوە نەبووەو گاڵتە نیە، بەڵکو پلانێکی پێوەختەی بۆ دانراوە لەلایەن خوای داناو زاناوە، ئەرکمانە بەوجۆرەی ڕزگاربوون لە دۆزەخمان بۆ زامن بکات ئەرکمان بەجێبگەیەنین، ژیانمان هەرگیز بێ واتا و ئامانج نەبێت، ژیان بێ هۆکار و ئامانج نەبێت، بەڵکو ئەو بێمانابوونەی ژیان قسەی بێ بەڵگەی ماددیگەراکانە، هەر بۆیە هاواریان لێهەستاوە دژ بە مەرگ لەپێناو مانەوە لە دنیا و خۆدوورگرتن لە مردن، ماددیەکان هەرگیز حەز بە مەرگ ناکەن، هەرکامیان حەز دەکەن هەزار ساڵ بژین-وەك قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە- چونکە ئەوان لە ژیانی پاش مردن دەترسن.

بێگومان لە پەیامی ئیسلامدا مردن پاڵنەرێك بەهێزی گاڵتەپێنەکراوە، موسڵمان لە مەرگ ناترسێت، بەڵکو خۆی بۆ ئامادە دەکات و لەوپەڕی هەوڵدا چاوەڕوانی دەکات، لووتکەی خۆئامادەکردنیشی شەهیدبوونە لەڕێی

خوادا، بەڵام مەرگ لە پەیامی فەلسەفە ماددیەکاندا کۆتاییە، بۆیە چاویان لەوەیە خێرا ئارەزووەکانیان بێننەدی و سنوورە حەرامکراوەکان ببەزێنن و ئەو ڕێسایانە ببڕنکە ئایین دایناون بۆ پاراستنی تاك و کۆمەڵگە.

کاتێ مرۆڤ گومان دەکاتلە زیندووبوونەوەی پاش مردن، ئیتر ژیانی دەشێوێ و تێکدەشکێ، چونکە ئەوە وای لێدەکات تەواو ملکەچی ئارەزووەکانی بێت و هەموو بەهاو گەورەییەکان وەك شتانێکی بێ بەها سەیر بکات، لێرەوە بانگەوازی فەلسەفەی ماددیگەری بە هەمو لق و بەشەکانیەوە(دەهریەو بوونگەرایی و فرۆیدی و هتد) بۆ لەناوبردنی دیواری بەهێزی پاراستنی کەسێتی مرۆییە کە ئەویش دیواری زیندووبوونەوەیە، کە ئەوە نەما مرۆڤ هەر ڕێگەیەك دەگرێتەبەر تا پابەندی ڕەوشتی و دەروونی نامێنێت و جەستش دادەڕمێت، ئەم بانگەوازەش زۆر مەترسیدارە چونکە مرۆڤ بەرەو وێرانکاری بانگ دەکات، لەکاتێکدا ئیمان و باوەرداری پاڵنەری مرۆڤە بۆ بڕوابوون بە زیندووبوونەوە کە ئەمەش مرۆڤ دەبات بەرەو بەهێزی و پەیوەستی لەپێناو بنیادنانی ژیانی دنیاش و پاراستنی.

حیکمەتێکی باڵای خوای گەورە ئەوەیە کە وادەی مەرگ و کۆتاییەکەی بەنادیار هێشتوەتەوە تا مرۆڤ بەردەوام سەرالّی هەوڵدان بێت و وریای خۆی و جووڵەی بێت، هەرکات مرۆڤ بە حەق بڕوای هێناو زانی دنیا ڕێی چوونە بەرەو ئاخیرەت ئیتر مردن نایترسێنێت، بێگومان ژیانی دنیا پەیوەندیەکی ریشەیی هەیە بە ژیانی ڕۆژی دواییەوەو بەشێك و قۆناغێکە لە قۆناغەکانی ئەزموونێکی تەواوی مرۆڤ.

# بەشی چوارەم

# ئەو بانگەوازانەی بیر و رۆشنبیری دادەڕمێنن

باسی یەکەم: بانگەواز بۆ زیندووکردنەوەی ئەوەی پێش ئیسلام هەبووە.

باسی دووەم: ئیسرائیلیات.

باسی سێیەم: رۆژئاواگەری( رۆژهەڵاتناسی و موژدەبەری ).

باسی چوارەم: زیندووکردنەوەی هیلینیەت.

باسی پێنجەم: بانگەواز بۆ گشتی بوون.

# باسی یەکەم:

# بانگەواز بۆ زیندووکردنەوەی ئەوەی پێش ئیسلام هەبووە

لەم ساڵانەی دواییدا بانگەواز بۆ زیندوکردنەوەی ئەوەی پێش ئیسلام هەبووە نوێکراوەتەوەو تا ئەو ڕێباز و ئایینانەی پێش ئیسلام هەبون زیندوو بکرێنەوە، هەوڵ دراوە بۆ کۆکردنەوەی هەوڵەکان لەپێناو زەقکردنەوەی مەشخەڵەکانی ئەو مێژووەدا و هەوڵدان بۆ دروستکردنی فەرهەنگێکی هزری یان ئەدەبی بۆ ئەو هەولانە.

بۆ ئەوەش لە هەمو بەش و ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا کار کراوەو لە هەر پارچەیەکی جیهانی ئیسلامیدا ەخت کراوەتەوە لە مێژووی ئەو ناوچە لەپێش ئیسلامدا تا بتوانن زیندووی بکەنەوە و لەڕێی هزر و ڕۆشنبیریەوە پەیوەستی بکەن بە ئێستاوە، دیارە پێش هاتنی ئیسلام ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی ئەمڕۆ چەند شارستانیەتێکی جیاجیایان تێدا بووە کە دیارترینیان بریتین لە فیرعەونی و فینیقی و فارسی و یۆنانی و هیندی، هەموو ئەمانەش سەرچاوە یەکەمینەکانیان ئایینە ئاسمانیەکان بون و دواتر لەرێ لایانداوە و برێ واتا و پەیامیان وەرگرتون کە بەگشتی دەسەڵاتداری و خۆبەگەورەگرتن‌و دوژمنکارییان لەخۆگرتووە، لە بازنەی ناوخۆییشیاندا ناسراون بە سیستمی جیاکاری تەواوی نێوان دو چین: چینی دەسەڵاتدار و چینی کۆیلەکان.

فەلسەفەکانی ئەو شارستانیەتانە سیستمی کۆیلایەتییان بە زەقی نیشانداوەو شەرمیان لێ نەکردووە، وێڕای دوژمنکاری و ستەم بەرامبەر بە

گەلانی دەوروبەریان، بەردەوام وێنەی ململانێ نێوان فارس و ڕۆم لە پێش ئیسلامدا دیارترین نموونەی ئەو ڕێبازەی بوو کە ئەو شارستانەیتانە گرتوویانەبەر، هەوڵەکانی بەدواداچوون و گەڕان بەدوای شوێنەوارەکانی ناو وڵاتانی ئیسلامیشدا هۆکارێکی مەترسیدار بوون بۆ سازدانی ئەم پرسە سەر لەنوێ بۆ زیندووکردنەوەی شوێنەواری ئەو گەلە کۆنە بتپەرستیانەی کە ستەم دایپۆشیبوون‌و لە ڕێبازی حەق و دادپەروەری لایاندابووو سەرقاڵی ستەم و بێڕەوشتی بوون تا ئەوەی لەناوچوونیان بوو بە پەندێ بۆ ئەوانەی ورد دەبنەوە لە دروست بوون و ڕووخانی دەوڵەتان، هەروەك بانگەواز بۆ زیندووکردنەوەی ڕێبازەکانی پێش ئیسلام پەیوەست کراوە بە نەتەوایەتی لاواز و کەمینەکان، لە وڵاتانی ئیسلامیشدا بانگەواز بۆ فیرعەونیەت و فینیقیەت و ئاشووری و بەربەری و چەندینی تر دەرکەوتەوە و لە پشتیەوە بانگخوازانی و هێزە داگیرکەرەکان هەبوون کە چەندین پاڵنەریان هەبوو بۆ ئەو وروووژاندنە، بەڵام ئەو بانگەوازانە هێزی خودێتی خۆیان نەبوو و نەیانتوانی بەردەوام بن، چونکە ئەو فەرهەنگەی لێیان بەجێمابوو توانای ئەوەی نەبوو بنکەیەك دابمەزرێنێت تا لەوێوە هەنگاو بنرێت.

ئیسلام ماوەی چواردە سەدەیە هاتووەو بوونی هزری و کۆمەڵایەتی ئەو گەلانەی نەهێشتووە و وێنەیەکی نوێیی بوونی ئەوانەی پێکهێناوە کە تا ئەمڕۆش زیندوو و نوێگەرە.

لەبەرئەوەی ڕێبازی ئیسلام ڕێبازێکی خواپەرستیە و لەسەر فیترەت دامەزراوە و پەیوەستە بە دەروون‌و عەقڵی مرۆییەوە، بۆیە موسڵمانانی لەسەر ئەو مۆرکە تایبەتیە داناوە کە بە تەواوەتی ڕۆچون تیایدا و دوورکەوتنەوە لێی بووە بە شتێکی مەحاڵ.

موسڵمانان دوو جار بەم ئیسلامە مێژووی کۆنی خۆیان تێپەڕاندووە، جارێك لەو ڕووەوە کە ئیسلامٍ لە پەیامی بتپەرستی و دوانەخوایی و فرەخودایی و پیرۆزراگرتنی تاك و دانانی پاڵەوانەکان بە خوا ڕزگاری کردون، جارێکیش ئەو کاتەی هەموو بیری مرۆیی کۆکردەوەو چاکەکەی لیّ چۆڕاوە کرد و ئەوەشی پەیوەست نەبوو بە بنەڕەتە ڕەسەنەکانی یەکخواپەرستی و دادپەروەری و بروابوون بە غەیب و بەرپرسیارێتی تاکە کەسی و پەیوەستی ئەخلاقیەوە لێی دوورخستەوە.

بێگومان ئەو وەرگرتن و داڕشتنەوەیەی ڕۆشنبیری گەلان لە ئیسلامدا لەجێی میراتی ئایینەکان و پەیامە ئاسمانیەکانە و لایەنی پرشنگداری فەرهەنگ و بیری مرۆییە، ئەو ساختەو ناراستیانەش کە مابوونەوە و لە کرۆکی پوخت دەرچووبوون ئەوە بیری ئیسلامی دووری خستنەوەو نەرێنی لێکردن.

# بتپەرستی

ئەو ڕێبازانەی بانگەواز دەکەن بۆ زیندووکردنەوەی ڕێبازەکانی پێش ئیسلام ئامانجیان ئەوەیە بتپەرستی و جاهیلیەت زیندوو بکەنەوەو لە کۆی کاریاندا هەوڵ دەدەن دەروون و بیری موسڵمانان وا لێبکەن فرەخودایی و بتپەرستی قبووڵ بکەن و بە سادەیی بڕواننە دورەپەرێزی ئیسلام لەو شتانە یان وەستان بەرامبەر بەو فرەخوداییە.

برێ نەریت و سیستم و ئەزمون و بار هەبون کە لە دەروونی ئیسلامیدا قبووڵ نەکراو بوون پەیوەستن بەو بتپەرستیەوە وەك نەریتەکانی تەرم

ئەسپەردەکردنو نوێژی زیندوان بۆ مردوان و نەریتە کۆمەڵایەتیەکانی ڕۆژی لەدایك بوون و خۆشی و ناخۆشیەکان، ئێمە دەزانین لە سەردەمانێکی پاش هاتنی ئیسلامدا ئەم شتە بتپەرستیانە بازارگەرمیان بۆ کراوەو لە شێوەی ئاهەنگ و میهرەجانو جەژن و بۆنەکاندا ڕێکخراونەتەوە بەتایبەت ئەوانەی پەیوەستن بە نیل و چنینەوەی بەرهەم و لەدایك بوون و مردن، ئەو نەریتانەش تا ئێستاش باون لەکاتێکدا تەواو پێچەوانەی واتاو بەها ئیسلامیەکانن، ئەمە وێڕای ڕێخۆشکەری ئەو بانگەوازانە بۆ زیندووکردنەوەی ئەو مەراسیمانەی کە ئیسلام قبووڵیان ناکات و مرۆڤی لەو مەراسیمە نارەوایانە رزگار کردووە.

موسڵمانان بەهۆی ئیسلامەوە رزگاریان بوو لە هەرچیەك کە پەیوەستە بە بەرد و ئاژەڵو رووبار پەرستیەوە، بەڵکو تەنها خواپەرستی دروست دەزانن کە دوورە لە هاوەڵ بڕیار دان بۆ خوا و بتپەرستی و فرەخودایی و بەخواکردنی خەڵك، هەروەك ئیسلام مرۆڤی رزگار کرد لە پەرستشی سروشت(خۆر و مانگ) و رایگەیاند ئەوانە لەلایەن خواوە دابین کراون بۆ خزمەتی مرۆڤ.

چەمکی وەسەنیەت بە هەر بیوباوەڕێك دەوترێت کە خوا بە تاك و تەنها نەزانێت، واتاکەش دەگەڕێتەوە بۆ پەرستشی بەرد و بتەکان، یۆنانیە کۆنەکان (ئیغریقیەکان) و خەڵکی نیمچە دوورگەی عەرەبیش جیا لەوان هەردووکیان بتپەرستیان هەبووە، بتپەرستی یۆنانی ریشەیی و کۆن بووەو ئایدۆلۆجیای تەواوی هەبووە، چەندین فەیلەسووف هەبووە وەك ئەفلاتۆن و ئەرستۆ، چەندین شاعیری وەك ئەسخیلۆس و سۆفۆکلیس، بیورباوەڕە بتپەرستیەکان جۆراوجۆرن، هەیانە سورشت دەکاتە خوا یان بەشێکی سروشت بە خوا دەزانێت وەك خۆر و مانگ یان بڕێ ئاژەڵ یان مرۆڤ بە

خوا دەزانێت ئایا تاك بێت یان خێزان یان کۆمەڵێك، ئەوەش وەك پەرستشی پاشا و خێزانە فەرمانرەواکان لای هەندێ گەلی کۆن وەك میصریە کۆنەکان یان گەلە نوێیەکانی وەك یابان و هیندەکان، یان پەرستشی پێغەمبەران و پاڵەوانان و کەسە پیرۆزەکان و پیاوچاکان، بۆیە ئیسلام سوورە لەسەر بەرگرتن بەهەر زێدەڕۆییەك لە ڕێزلێنانی پاڵەوانان و پیاوچاکاندا تا بەپێی تێپەربوونی سەردەم ۆرێ پەرستشیان نەکرێت.

ئیغریقەکان بروایان هەبوو بە فرەخودایی، بۆیە هەر خوداوەندێ هێزێکی سروشتی تایبەتی بەدەستەوە بووە، لەوانە زیۆس خواوەندی جوانی و ئەپۆلۆ خواوەندی خۆر و نیبتۆن خواوەندی دەریا.

یۆنانیەکان سورشتی خواوەندەکان و سروشتی مرۆڤەکانیان لەیەك جیانەکردوەتەوە، بۆیە ئەو کینە و ناپاکی و ڕەقی و خراپە و ترس و حەزی تۆڵەیەی لای مرۆڤ هەیە بۆ خواوەندەکانیشیان ڕەوا بووە، خواوەندەکانیان پێیان خراپ نەبووە ژنی خواوەندەکانی تر خراپ بکەن، لەبیری یۆنانیەکاندا خواوەندەکانیان ڕەوشتە خراپەکانیان لەخۆگرتون.

یەکێکی تر لە بیروباوەڕی بتپەرستی بریتی بووە لە بڕوابوون بە خوایەتی هەندێ بونەوەری نادیار و پەرستنیان وەك فریشتە و جنۆکە و شەیتانەکان و ڕۆحەکان، یان بەخوادانی بەشێکی مرۆڤوەك عەقڵ، برێ بیروباوەڕی ملهوڕیش هەبون کە نکوولّییان دەکرد لە بوونی خوا و ژیانی ڕۆژی دوایی.

# جاهیلیەت

بتپەرستی نیمچەدوورگەی عەرەبی جیاواز بووە لە بتپەرستی فارسی و ئیغریقی، چونکە بتپەرستی نیمچەدوورگەی عەرەبی تەنها ماوەیەکی مێژوویی بووە کە پاش بانگەوازی یەکخواپەرستی هاتووە، ئەو بانگەوازەی کە ئیبراهیم و ئیسماعیل ئالآهەڵگری بوون، زۆربەی عەرەب ئایینی ئیبراهیمیان وەرگت، بەڵام لەگەڵ بەرەوپێشچوونی سەردەمداو بەشبوونی ئەو عەرەبانە بە ناوچەکاندا کە پارچەبەردی کەعبەیان لەگەڵ خۆیان دەبرد و بەپیرۆز سەیریان دەکرد، دواتر ئەو بەردانەیان کردن بە خوا، بەرەبەرە لەمەوە یەکخواپەرستی دیار نەما و پەرستشی بتو پەیکەرەکان دەرکەوت و قوربانی دەکرا بۆ ئەو بتانە.

ئەمەیە کە مێژوونووسان بە جاهیلیەت ناوی دەبەن و ماوەی نزیکەی چوارسەد ساڵ بووە، ئەمەش کورتترین ماوەی بتپەرستی جیهان بووەو جیا بووە لە بتپەرستیە دێرینەکان یان ئەو جاهیلیەتەی هەر لە ریشەوە هەبووە، بۆیە بتپەرستی ئەو ناوچەیە وەك هی هیندی و چینی و فیرعەونەکان و یۆنانەکان نەبووە کە ئەفسانەیان هەبێت.

نیمچەدوورگەی عەرەبی چەند ئایینی تێدا بوو وەك جوولەکەیی و مەسیحی، بەڵام ئەو ئایینانەیان ەرنەگرتبوون و لەسەر پاشماوەی حەنەفیەتی ئیبراهیمی مابوونەوەو ئەو ئایینەش تا سەردەمی موحەممەدی شوێنەواری مابوو.

بەڵام بتپەرستی یۆنانی نموونەیەکی مەترسیداری فرەخودایی و هاوەڵ دانان بوو و فەلسەفەو واتای تایبەت و مەرسیداری خۆی هەبوو.

بۆیە ئیسلام زۆر جەختی کردوەتەوە لەو شتانە تا ساختکانیان ئاشکرا بکات، پێشڕەوی ئەوانە ئەو بیرەیە کە باسی دێرین بوونی جیهان دەکەن و بروایان وایە خوا ئاگادار نیە بە شتە لاوەکیەکان و نکوولّی دەکەن لە زیندووبوونەوەی جەستەکان و پیرۆزراگرتنی عەقلّ.

پەیامێکی تری بتپەرستی ڕۆژهەلاّتی لە واتای غەنووصیەتدا بریتی بوو لە وەحدەتولوجود و لول و ئیتیحاد و دوانەی بوون و حەدەس و ئیشراق و نەهێشتنی ئەرك و بەرپرسیارێتی.

بێگومان بانگەواز بۆ زیندووکردنەوەی ماوەی پێش ئیسلام ئامانجی بلاّوکردنەوەی بیری تلموودیە کە جوولەکە دایڕشتووەو لە واتای پەیامی مووسا دەریکردووە و ئامانجی بەدیهێنانی ئامانجێکی دیارە کە بریتیە لە بەرزراگرتنی جنس و رەگەز بۆ دەستەیەکی تایبەت.

توێژەرانئەوەیان تۆمار ردووە کە ماسۆنیەت هەموو بیری مرۆیی بتپەرستی پێش ئیسلامی دارشتوەتەوە و بە فەرهەنگێکی مرۆیی داناوەو بانگەوازی بۆ دەکات، ئەوەش پێناوێکی دەسەلاّتداری شاراوەیە، لە چەند کتێبی فێرکاریدا وەك کتێبەکانی ئاداب و بیروباوەردا ئەو کارە مەترسیدارەیان دەردەکەوێت کە هەولّ دەدەن ئەفسانەو بتپەرستی میصریە کۆنەکان و کلدانی و هیندی و فارسی و عیبرانی و یۆنانیەکان زیندوویکەنەوە، ئەو هێمایانەش زیندوویکەنەوە کە هەبون وەك مار و ماسی و گا کە خۆر لەسەر هەردوو شاخیەتی و گای بالّدار و ئەبیلهول و هەرەمە سێگوشەکان و چوارگۆشەکان و بازنەکان و ژمارە پیرۆزەکان وەك ٣ و ٧ و ٩ و ئەو بۆنانەی کە هەبون و جادووگەری، هەموو ئەمانە لەیەك بواردان، تلمودیەت تەواو سوورن لەسەر ئەو فەرهەنگەو لە هەموو

سەردەماندا کار دەکەن بۆ نوێکردنەوەو پێدانی وێنەیەك و وتنەوەی لە کۆمەڵە نهێنیەکاندا، بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە مەهابەهاراتا و رامایانا و زاندفستا و ئیلیاژە، تلموودیە ت و مەنشا پێشڕەوی ئەو کتێبانەن کە لەسەر رەگەزپەرستی وەستاون، ئەمەش مەترسیدارترین پلشخانی پشت زیندووکردنەوەی ئەزموونی پێش ئیسلامە.

دایگرکەر لە هەوڵی گەورەی خۆیدا بۆ رۆژئاواگەری‌و پەرتکردنی یەکبوونی هزرو ئوممەت هەوڵ دەدات چەند بنەمایەکی خێڵایەتی‌و دەمارگیری ردروست بکات، ئەمەش بە جەختکردنەوە لەسەر چەند رەگەزێکی دیاریکراوو رێنەدان بە گەشەکردنی یان تێکەڵبوونی لە کۆمەڵگەکاندا، یان وروژاندنی‌و قووڵکردنەوەی ناکۆکیەکانی لەگەڵ کەۆمەڵەکاندا.

ئەمە یەکێك بوو لە مەترسیدارترین هۆکارەکانی پشت بەستنی قەڵەمڕەوی بیانی بۆ داورووخاندنی یەکبونی پەیوەندی کۆکەرەوە، ئەمەش وەك رێخۆشکەریەك بۆ بڵاوکردنەوەی قەڵەمڕەوی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، دەستەو تائیفە ئەرمەنی و جوولەکەییەکانی وەك دەونەمە لە تورکیا کاریگەری قووڵیان هەبوو لە پەیڕەوی پیلانە بیانیەکاندا بۆ دەسەڵات گرتنە دەست، لەکاتێکدا رۆژێك لە رۆژان مەسەلەی تایەفەگەری لە ئیسلامدا باس‌و خواس نەبووە، بەڵکو دستە و تایەفەکان بەوپەڕی جیاوازیانەوە ئازادی خۆیان هەبووە لە کۆمەڵگەدا، شەریعەتی ئیسلامی سیستمی پارێزگاری و چاودێری بۆ داناون‌و رێزی ناوە لە ئەهلی کیتاب و پاراستنی پەرستگاکانیان، لە سەردەمی ئیسلامیدا ئەو دەستەو تاقمانە گەیشتبوونە لوتکەی پێشڕەوی و رێزلێگیران، لە شارستانیەتی ئیسلامیشدا رۆڵی خۆیان گێڕاوە، لەگەڵ هیچ دەستەیەکی تریشدا هیچ ناکۆکی و

ململانێیەکیان نەبووە مەگەر لەسایەی قەڵەمڕەوی داگیرکاریدا کە بە بیانووی ئەوەش هاتووە ئەو دەستە و تاقمانە بپارێزێت.

بزاڤە نیشتیمانیەکان توانییان بە پەیوەستی دان لەنێوان ڕەگەزە جیاجیاکانی ناو ئوممەت ئامانجەکانی قەڵەمرەوی بیانی لەناوبەرن و دەسیسەی بیانی نەهێڵن و ئەو ئارەزووبازی و ناکۆکیە کۆنانەی کە داگیرکەر دەیویست بیانورووژێنێت لەناوبران.

# هەرێمچێتی

بانگەوازکردن بۆ هەرێمچێتی یەکێك بوو لەو بانگەوازانەی کە ئامانجی پەرتکردن و دووبەرەکی بوو تا جەخت بکاتەوە لە پەیڕەوی سیاسەتی قەڵەمڕەوی بیانی، ئەو ئامانجەش بەروونی لەپشت بانگەوازەکانی تۆرانیەت و فیرعەونیەت و فینیقیەت و بناگەوازەکانی ترەوە دەرکەوتووە.

دیارە جیهانی ئیسلامی پێشتر ئەو چەمكو واتایانەی نەدەناسی و تەنها یەکبوونی هزری هەبو کە بنەرەتی یەکبوون بوو، ئەمەش وەرگیراوی ئیسلام بوو کە ببوە سەرچاوەی پەیوەندی و بەیەککگەیشتن، بەڵام قەڵەمڕەوی داگیرکاری بۆ ڕاوەستانی پایەکانی قەڵەمڕەوی خۆی دەبوو ئەو کۆمەڵە یەکڕیزە دابەش بکات بۆ چەند ڕەگەزێك کە هەندێکیان بکەونە شوێن ڕەگەز و هەندێکیان بکەونە شوێن ئایین و زمان، بەردەوامیش هەوڵ داوە تا ناکۆکیە مەزهەبیەکانی نێوان نەوەکانی یەك ئایین دروست بکات، پەیامی بەرتەسکی نەتەوەپەرستیش پاڵنەرێکی گرنگ بوو بۆ ئەو کارەی داگیرکەر.

گواستنەوەی پەیامی نەتەوەپەرستی ڕۆژئاوایی بۆ ناو موسڵمانان هۆکارێك بوو تا بارگرژی درووست بکات و پەیوەندی نێوان عەرەبایەتی و ئیسلامیش لە واتای ڕەسەنی خۆی بباتە دەرەوە.

هەوڵی یەکەمی قەڵەمڕەوی بیانی ئەوەبوو نەتەوایەتی وەك هەرێمچێتیەکی بەتەسك بێت و لە واتای نیشتیمانی و بەرزراگیری ڕەگەزی و مێژوویی ناوچەو هەرێمێکدا بەرتەسك بێتەوە، کاتێك ئەو هەوڵە سەری نەگرت و چەمك و واتای عەرەبچێتی بەرامبەر قەڵەمڕەوی بیانی دەرکەوت، ئەوکات ڕۆژئاوا هەوڵیدا ئەو پەیامەی لە بەها حەقیقیەکانی خۆی و ناوە ڕەسەنەکەی بەتاڵ بکاتەوە، بۆیە بانگەوازکردن بۆ نەتەوەپەرستیەکی جیا لەڕووی فەرهەنگ و ڕۆشنبیریەوە دەرکەوت و بانگەواز کرا بۆ نەتەوەپەرستیەکی عەلمانی بەو شێوەی کە ڕۆژئاوا دەیویستو دەیناسی، ئیتر بێ ئەوەی گوێ بدەن بەو جیاوازیە گەورانەی سەردەم و ریشەو بارودۆخ، هەروەها بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو راستیەی کە ئوممەتی عەرەبی ناتوانێت لە بزاڤی کۆمەڵایەی و هزری خۆیدا لە بەها بنەرەتیەکانی دەستبەردار بێت و کشانی نەفسی و ڕۆحی و ڕۆشنبیری خۆی لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا بوەستێنێت.

## فیرعەونیەت

دۆزینەوەی گۆڕستانی توت عەنخ ئاموون لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستەمدا و بوونی ئەو شوێنەوارە سەرسوڕهێنەرانەی تیایدا بوون، ئەم دەروازەیە بوو بە سەرەتاو سەرچاوەیەك بۆ زیندووکردنەوەی ئەزموونی پێش ئیسلام لەڕووی بنیادی گۆڕەکان و کۆشکەکان لەسەر ڕێرەوی فیرعەونی و بانگەوازکردن بۆ زمان و ئەدەب و فەرهەنگی فیرعەونی، بەڵام

هێندەی نەبرد هەڵگرانی ئەو بانگەوازە شکستی خۆیان ڕاگەیاند و نەیانتوانی ئەو جۆرە فەرهەنگە بەدیبهێنن تا ببێتە خاڵی سەرەتایان، ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە پەیوەندی نێوان میصریەکان و فیرعەوینەکان ماوەیەکی زۆر دوورودرێژە تەواو پچڕاوە، ئەمەش بەهۆی ئیسلامەوە کە دەروون و عەقڵی مرۆڤی بە تەواوەتی گۆڕیوە پاش ئەوەی مرۆڤی میصری لە بتپەرستی فئازاد کرد و بەرەو ڕێبازێکی خواپەرستی برد کە بنەڕەتەکەی فیترەت بوو، قووڵکردنی ئیسلامیش لەلایەن میصریەکانەوە موعجیزەیەکی گەورەی ئیسلام بو پاش ئەوەی نزیکەی هەزار ساڵ لەنێو بتپەرستی فیرعەونی و یۆنانی و ڕۆمانیدا ژیابوون، نیشانەی ئەو شکستە قورسەش ئەوەبوو ە یەکێك لە بانگخوازانی فیرعەونگەرایی بەناوی دکتۆر موحەمەد حوسەین هەیکەل دانی پێدا دەنێت و لە پێشەکی کتێبەکەیدا (ف منزل الوحی) دەڵێت: من سەراڵ بووم لە مێژووی کۆنماندا لەسەردەمی فیرعەونەکاندا دەروازەیەکم دەویست بیدۆزمەوە بۆ سروشی ئەم سەردەمە تا بنەرەتێکی نوێی بۆ دابمەزرێنێت، کەچی سەردەم و جیاوازی عەقڵی پەیوەندی نێوان ئێمەو ئەو سەردەمەیان پچڕاندووە، لەوانەبوو ئەوە گونجاو بوایە بۆ ڕاپەرینێکی نوێ، دواتر سەیرم کرد بینیم مێژووی ئیسلامیمان بە تەنها ڕوێنەر و بەرهەمدەرە، ئیسلام ژیانێکی تێدایە کە دەروونەکان دەجووڵێنێت و گەشەو باڵایان پێدەدات.

مامۆستا ئەحمەد حەسەن زەیات دەڵێت: ئەوە میصری خاوەن شارستانیەتە کە لەسەر بنەمای سیانزە سەدەو سێیەکی مێووژ عەرەبی وەستاوەو پێشینەی خۆی سڕیوەتەوە وەك چۆن خۆر تاریکیناهێڵێت، ئەگەرنەتوانن ئەو ڕۆحە لەناوبەرن، ئەگەر دەتانەوێت با بەزۆریش بێت ئەو ڕابردووە بسڕنەوە، پاشان بزانن لە میصرا چی لەدەست سەردەمدا

دەمێنێت، بزانە جگە لە پاشماوەی ستەم و قامچی‌و هونەری خوراف سەرقاڵ بە مەرگ و کڕنووش بۆ بەردەکان هیچی تر دەمێنێت تا ئاستێك خۆی بێئاگا دەکات لە ژیان و نکوولّی لێ دەکات.

میصری ئیسلامی هەر دەبێت بەشێك بێت لە شکۆی عەرەبی چونکە سەرچاوەیەکی تری نیە بۆ زیندووبوونی و بەهێزبوونی و بنەرەتی رۆشنبیریەکەی، مەگەر تەنها لە پەیامی عەرەبدا(پەیامی ئیسلامیدا) ئەوانەی هەبێت.

ئەوەی سەبارەت بە جەنگێك دەوترێت کە ماوەیەکی زۆر بەردەوامە ئەوەیە کە گەیشتووە بەم ئامانجانە:

**یەکەم:** فیرعەونیەت لەگەڵ رۆحی سەردەمدا ریّ نابڕێت و رۆشنبیریەکی نیە و هەر لە دەرکەوتنی ئیسلامەوە وەستاوەو چەقی بەستووە، مێژوویەکی ئیجابی کارا ئێمەی لە مێژووی فیرعەونی جیاکردوەتەوە کە بنەرەتەکەی ئیسلام و زمانی عەرەبیە.

**دووەم:** ئەوە سەلماوە کە ئامانجی هەوڵەکە بریتیە لە کەنارخستنی رۆشنبیری عەرەبی لە هزری ئیسلامی‌و کەنارخستنی شەخصیەتی میصری لە پەیوەستی عەرەبی، بەڵام هەوڵی گەورەی جیاکردنەوەی نێوان میصریەمان و عەرەبایەتی و ئیسلام ئەوپەڕی بێهیواییە، هەوڵی پەیوەستبوون بە فەرهەنگێکی فیرعەونیش شتێکی مەحاڵە.

**سێیەم:** لە توێژینەوە مێژووییەکانەوە ئەوە روون بوەتەوە کە فیرعەونەکان شەپۆلێکبون لە نیمچە دوورگەی عەرەبیەوە هاتون و لەنێوان زمانی هیرۆگلیفی و زمانی عەرەبیشدا پەیوەندیەکی گەورە هەیە کە دوپاتی ئەوە دەکەنەوە لە یەك بنەڕەتن.

**چوارەم:** ئامانجی گێڕانەوەی فیرعەونیەت هێنانی واتاو پەیامە بتپەرستیە فیرعەونیەکانی پەیوەست بە بتپەرستی یۆنانیو بتپەرستیەکانی ترە تا سەرلەنوێ مرۆڤو پاڵەوانەکان بپەرستڕێن و ململانێی نێوان خوداکان ڕوویدات لەسەر ئامانجە هەستیەکان و ویستەکانی دنیا.

**پێنجەم:** ئەوە سەلماوە کە فیرعەونیەت سیستمێکی کۆمەڵایەتی و هێزێی پاڵنەر بەرەو ئازادی و یەکسانی نیە، بەڵکو سیستمێکی کۆیلایەتی و چەد کۆتو بەندێکی دواکەوتەیی هزری و کۆمەڵایەتیە.

## فینیقیەت

هەروەها فینیقیەتیش یەکێکە لەو بانگەوازە ڕووخێنەرانەی کە قەڵەمڕەوی داگیرکاری بۆ دابەشکردنی یەکبوونی ئوممەتی ئیسلامیو یەکبوونی هزریو نوێکردنەوەی مێژووی کۆن بە هەموو هەڵەو کەموکورتیەکانیەوە لەپێناو لەناوبردنی واقعی ئیجابی زیندووو بەرزراگرتنی هەرێمچێتیو ڕەگەزپەرستیدا ورووژاندوویەتی، ئەوانە ئەو پەیامە گومڕاییانە بوون کە پێش ئەوەی ئیسلام بێت و موسڵمانان لە یەکبوونی یەکخواپەرستیدا کۆ بکاتەوە بڵاو بوون.

بانگەوازی فینیقیەت لە لوبنان بۆ بانگەشە ئیستیعماریەکان دەرکەوەتەوە تا لوبنانیەکان لە عەرەبایەتی دووربخەنەوە، ئەوان دەیانوت یۆنانیەکان نەوەکانی ئەو فینیقیە کۆنانەن کە دانیشتوانی ئەو کەناراوەانە بون پێش هاتنی عەرەبەکان، بۆیە لەڕووی مێژووییەوە عەرەب نین، بەڵکو تێکەڵەیەکی نەوەکانی فینیقیەکان و میرنشینە خاچپەرستیەکانن.

ئەم بانگەوازە بۆ سووریاش دەرکەوت تا دەریای سپیش بگرێتەوە، لەسایەی ئەم بانگەوازەدا بانگەواز دەکرا بۆ عامیەتی لوبنانی و نووسینی زمانی عەرەبی بە پیتی لاتینی و بەرزراگرتنی شێوەزارە ناوچەییەکان.

فینیقیەت گرنگی دەدات بە بەرزراگرتنی ناوچەگەری بەرامبەر بە عەرەبایەتی و بەرزراگرتنی رۆشنبیری فەرەنسی بەرامبەر بە بیری ئیسلامی و هەوڵدان بۆ بەرزراگرتنی شێوەزارە گشتیەکان و زمانە بیانیەکان بەرامبەر بە زمانی عەرەبی و دروستکردنی چەند قەوارەیەك کە لەو واقیعەی ئوممەتی ئیسلامی لەوێ چواردە سەدەیە تیایدا دەژی هیچ بنەرەتێکیان نیە.

توێژینەوەکانی شوێنەوار و مێژوو کە دوورن لە کارتێکەرەکانی داگیرکەر یان بیری شعووبیەت یان بانگەوازی رۆژئاواگەری ئەو راستیەیان ئاشکراکردوە کە فینیقیەت وەك فیرعەونیەکانو شەپۆلەکانی تر کە لە سەرچاوە دایکیەکەیان جیابوونەتەوە شەپۆلێکی هاتووی نیمچەدوورگەی عەرەبین.

# باسی دووەم:

# ئیسرائیلیات

یەکێك لە هەرەشە گەورەکان کە ڕوویکردە ئیسلامو بیرو ڕۆشنبیری ئیسلامی بریتی بوو لە دیاردەی ئیسرائیلیات کە بڕێ زێدە زانیاری مەترسیدارو بیردۆزەی ساختە بوون کە وەرگیراوی بڕێ دەقی کۆنی بتپەرستی مەجووسی دوور لە پەیامو خودێتی ئیسلام بوون کە لەگەڵ درێژەی سەردەماندا دزەیان کردە ناو موسڵمانانو مەبەستی دوژمنانی ئیسلامیش لەو زیادکردنە ئەوەبوو ئیسلام لە کرۆکە ڕەسەنەکەی دوور بخەنەوەو مۆرکێکی تایبەت پێ بدەن و ساکاری و ڕوونی و ئاسانی ئیسلام نەهێڵن.

بە گشتی بڕێ وردەکاری زۆری پووچ و بێ بنەمایان زیاد کردووە کە لەبنەڕەتدا لەگەڵ واتای یەکخواپەرستی ئیسلامیدا یەکناگرنەوە، ئەو واتایەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە بڕوابوون بە غەیب و زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دوایی کە لە قورئانی پیرۆزەوە وەرگیراوە بۆ بارودۆخ و مەسەلە جیاجیاکان، بەتایبەت لەوەدا کە پەیوەستە بە جیهانی غەیب و ئەودیو جیهانی هەستپێکراو.

دیارترین دەردێ کە بیری ئیسلامی بەهۆی ئیسرائیلیاتەوە تووسی بووە بابەتەکانی ناو کتێبەکانی مێژووی غەزا و جەنگەکانن، زانایانی موسڵمان هەر لە دێرزەمانەوە هەستیان کردووە بەو مەترسیە تا ئەوەی لە ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەوە دەگێردرێتەوە وتوویەتی: سێ شت

هەن هیچ بنەرەتێکیان نیە: تەفسیر و چیرۆك و غەزاکان، واتە سەنەدی صەحیحی موتەصیلیان نیە، زیانێکی تری هەوڵەکانی ئیسرائیلیات دانانی فەرموودە بوو کە دەیاندانەوە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) لەپێناو پاڵپشتی هەڵوێستێ یان کۆمەڵەیەك یان شارێك، بەڵام توێژەران و لێکۆڵەران هەموو ئەو ساختانەیان ئاشکرا کردون.

هەروەها ئەو بەسەرهات و ئەفسانانەی کە هەندێ کاهینی جوولەکە دایاننابوون وەك کەعبی ئەحبار و وەهب بن منبهو ئیبن سەلام و چەندیی تر.

ئەوەی مەترسی ئەو دیاردەیە ئاشکرا دەکات ئەوەیە کە لە سەردەمی ئیمامی بوخاریدا نزیکەی سەد هەزار فەرموودە هەبون کەچی ئیمامی بوخاری تەنها ٢٥١٣ فەرموودەی قبووڵ کردووە.

دیاردەی ئیسرائیلیات پەیوستیەکی زۆری هەیە بە تەفسیرەوە کە هەندێ تەفسیر و ئەفسانەی نائیسلامی لە فەرهەنگی یۆنان و فارس و هیند و جوولەکەوە براونەتە ناو تەفسیرەوە کە پڕن لە ئارەزووبازی سەرشێوێن.

هەندێ لە موسڵمانان بەهەرچی بیروباوەڕی نائیسلامی هەیە دەڵێن ئیسرائیلیات بەتایبەت ئەو بیروباوەڕو ئەفسانانەی کە جوولەکەو مەسیحیەکان هێناویانەتە ناو ئیسلامەوە.

دیارترین بواری ئەو ئیسرائیلیاتانە بریتیە لە بواری فاڵچیەتی و هەواڵدانی پێشوەختە بەتایبەت سەبارەت بە بیرۆکەی مەهدی چاوەروان کراو ە کاریگەریەکی خراپی هەبووە لە سەردەمانی لاوازیدا، ئەو تەفسیرانە بۆ ئایەتە قورئانیەکان و فرەرۆی لە وەسفی فریشتەکان و بەهەست و دۆزەخ و رۆژی زیندووبوونەوەدا و وێناکردنی بە جۆرێك کە لە بنەرەتە قورئانیەکەی دەریدەکات بەرهەمی ئیسرائیلیات بووە.

مێژوونووس و توێژەران ئاماژەیان بەوە داوە کە ئەو فاڵچیەتیانە لەسەر دەستی قەشە و روهبانەکان و قیبت و جوولەکەکان و ئەوانەی تر هێنرانە ناو موسڵمانان کە ئاڵای دوژمنایەتی ئیسلامیان هەڵگرتبوو تا ساختە بخەنە ناو بنەڕەتەکانی ئیسلامەوە.

لەگەڵ وەرگێرانی فەلسەفەی یۆنانی و هیندی و فارسیدا زێدەکاری تریش زیاد کرا بۆ ئیسرائیلیات ە بەرهەمێکی گەورەی بوو بۆیان و کەسە شعوبیەکان و دوژمنانی ئیسلام لە کۆندا وەك چەکێك بەکاریان دەهێنا بۆ چاولابردن لەسەر کرۆکی ئیسلام و دەرکردنی لە کرۆك و بەهاکانی و دەرفەتدان بە کاریگەری بەخشینی پەیامە بتپەرستیو دوانەخوداییەکان تا هێرش بکەنە سەر ئیسلام.

بیریارانی موسڵمان بەرامبەر بەو پیلانە ئیسرائیلیە باتینیو مەجووسیە وەستاونو تەفروتونایان کردووە، پێشڕەوی ئەوانەش (جاحظ) لە کتێبی (البیان والتبیین)و دادوەر ئیبنولعەرەبی (العواصم من القواصم)و ئیبنولجەوزی (تلبیس إبلیس)، هەروەك هەریەك لە ئیبن حەزم و غەزالیو ئیبن خەلدون بەرامبەر بەو پرسانە وەستاونو بەریان گرتووە بە بیروراکانی باتنیەتو مەجووسیەتو کەزدەکیو مانەویو بیرە نارەواکانی تر.

لە ماوەی لاوازی و دواکەوتەییدا چەندین کتێب دەرکەوتن کە زانایانێکی وێژەر نەیاننووسی بوون و چەندین فەرموودەی نادروست کۆکرانەوەو چەندین درۆی لکێنراو بە ئیسلامەوە دانران، لەپێشڕەویئەو نوسینانەش بریتی بوو لە (بدائع الزهور) و (العرائس فى القصص و الأخبار).

هەندێ کتێبی تەفسیری وەك ئەوانەی سەعلەبی و کسائی و خازن پڕن لە چەندین ئیسرائیلیات، هەروەك تەبەریش لە تەسیرەکەیدا چەندین

ئیسرائیلیاتی هێناوە، نموونەی ئەو جۆرە گێڕانەوانە دەماودەم ڕۆیشتون و هەندێ چیرۆك خوێن لەناو خەڵکدا باسیان کردون، ئەوەی هەڵە بوو ئەوە بوو ئەو گێڕانەوانە برانە قۆناغی تۆمارکردنەوە، ئەمەش هاریکار بووبۆ بڵاوبوونەوەی ئەو ئەفسانەو سەرشێوێنیانە لە دەروونی خەڵکیدا.

کاریگەری ئیسرائیلیات بۆ ناو بیری ئیسلامیدا لەو قۆناغانەدا نەوەستا، بەڵکو تا ئەمڕۆش کاریگەریەکی زۆر قووڵیان هەیە، بەڵکو پێناوی کارای نانەوەی گومان و چەمكو واتای هەڵەن لە بواری ڕۆشنبیری ئیسلامیدا، پێشڕەوی ئەوانەش شرۆڤەی مەسەلەی تاوانە کۆنەکە و ڕزگگار بوون و فیدابوونە، هەموو ئەمانە هێنراوەتە ناو توێژینەوەی ئیسلامیەوە بێ ئەوەی لێکۆڵینەوەیکی ڕوونیان بۆ بکرێت و هەڵوێستی ئیسلامیان لەسەر باس بکرێت، ڕۆژهەڵاتناسان لەو بوارەدا ڕۆڵی گەورەیان بینیوە کە ئەو جۆرە ئیسرائیلیاتانەیان لە مادەکانی دائیرەتولمەعاریفدا باسکردووە، جوولەکەش کە زۆر جەختی لەو شتانە کردوەتەوە کاریگەری کارای هەبووە، وایان لێکراوە وەك لایەن و بنەمایەکی بیری ئیسلامی سەیر بکرێن، ئەگەر سەیری دائیرەتولمەعاریف بکەیت لە بەشی وشەکانی رەجعیەت و وەصیەت و ئیتیحاد و حلوول و چەندین چەمکی تردا، دەبینیت ئەو ماددانە هێنراونەت ناو موسڵمانان و گومانیان بۆ دروست دەکەن.

هەروەك دەستتێوەردانی غەنووصیەت و هیلینیەت لەبیری ئیسلامیدا کاریگەری زۆری هەبوو تا چەندین ئیسرائیلیات بهێننە ناو بیری ئیسلامیەوە، نموونەی ئەوەش هەندێ فەرموودەن لەو بارەوە کە هەوڵیانداوە پێگەیەکی دیار بدەن بە عەقڵ یان وا وێنای پێغەمبەری خوا بکەن کە جیا بێت لەوەی لە قورئاندا باس کراوە، یان شتی وا بدەنە پاڵ خودا کە شیاو نین بە شکۆی ئەو، لەو فەرموودە ساختانەی دانراون

ئەوەیە کە دەڵێت(یەکەم شت خوا دروستی کرد عەقڵ بوو)، یان (من پێغەمبەر بووم کاتێك کە هێشتا ئادەم لەنێوان قوڕو ئاودا بووە)، یان(من کەنزێکی شاراوە بوم و حەزم کرد بناسرێم).

ئیمامی ئیبن تەیمیە بە سەختی هێرش دەباتە سەر ئەو فەرموودە هەڵبەستراوو ناراستانە و ساختەو ناراستییان دەسەلمێنێت و ئەوەش ئاشکرا دەکات کە ئەوانە پەیوەستن بە چەمكو واتاکانی فەلسەفەی یۆنانیەوەو لەگەڵ کرۆکی ئیسلامدا ناگونجێن، هەروەك زانایانی تریش ساختەی هەندێ ناراستییان پەیوەست بە هەندێ خواپەرست خستوەتە روو وەك ئەوەی چەند ماریان قووت دابێت ولەسەر شمشێر چوبن بەڕێدا و هاوشێوەی ئەو ئەفسانانە.

لێکۆڵەران بۆ ئەو لادانانە هەندێ رێسایان داناون، بۆ نموونە زانایەك دەڵێت: ئەگەر بینیتا کەسێك کە کەراماتی پێدەدرا تا ئاستێك بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە و لەسەر هەوا بوەستێت، ئەوە پێ هەڵنەخەڵەتێن تا بزانن لە مەسەلەی فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپە و پاراستنی سنوورەکانی شەریعەت و پەیڕەوی شەریعەتدا چۆنە.

ئیمامی غەزالی لەو بارەیەوە دەڵێت: ئەگەر کەسێکت بینی دەفڕی و بەسەر ئاودا دەچوو بە رێگەدا و هواکات شتێکی دەکرد پێچەوانەی شەرع بوو بزانە ئەوە شەیتانە.

زۆربەی توێژەران پێیان وایە زۆربەی فەرموودە هەڵبەستراوەکان کە لە ئیسرائیلیاتن بە پیلانو فێڵ و دژایەتی دانراون و پێناوی جەنگی هزری و بیروباوەری بوون کە جوولکەو سەرکەشانی دەستە بیدعەچیەکان دژ بە موسڵمانان هەڵیانگیرساندووەو هەموو پێناوێکیان گرتوەتەبەر لەپێناو

پەرتکردنی یەکبوونی موسڵمانانو دەرکردنیان لە ئایینی ڕاست و بەهێزیان و بڵاوەپێکردنیان لە ڕێی ڕاستیان،[1] هەندێ توێژەر ئەو دیاردە وا وەسف دەکەن کە تەنها جەنگێکی حەقیقیە دژ بە کتێبەکەی خوا کە مەبەستیانە هەرکەس تەفسیری قورئان دەخوێنێتەوە لەو واتایە دەری بکەن کە خوای گەورە دەیەوێت، ئەوان دەیانەوێت لە ڕێنموونی مرۆڤەوە بیبەن بەرەو بڕێ چیرۆك و ئەفسانەی گاڵتەبازاڕ، دواتر ئەو ئەفسانانە لەسەر یەك کەڵەکە ببنو ڕێ بگرن بە ڕێرەوی بیرە ساغ و سەلامەتەکان.

## ئەفسانە

باسی ئیسرائیلیات پەیوەندی هەیە بە باسی ئەفسانەوە، ئیسلامیش بەرنگاری بوەتەوەو ساختەی ئەفسانەشی خستوەتەڕووو عەقڵو دەروونی مرۆیی لە خورافە رزگار کردووە.

ئەفسانەش پەیوەندیەکی پتەوی هەیە بە بتپەرستی یۆنانی و فارسی و هیندیەوە و ئیغریقەکانیش لەو بوارەدا زۆر ڕۆچون، بەڵکو چەندین چیرۆکیان هەیە کە بەو چیرۆکانە ڕاڤەی ژیان و سروشت و چاکەو خراپە دەکەن، ئەوان بڕوایان وابوو ئەو مەسەلانە بە دەست چەند خواوەندێکی نێرو مێن، ڕۆژئاواییەکان ئەفسانەو ئایین بەیەکەوە پەیوەست دەکەن، لەکاتێکدا ئیسلام ڕزگاربوونی تەواو لە هەر ئەفسانە یان خورافە یان وێنەیەکی ناڕوون ڕادەگەیەنێت.

---

[1] - قرار مجمع البحوث الإسلامية في ١٠-٣-١٩٧٢، و الشيخ عبدالجليل عيسى.

عەرەبەکانی پێش ئیسلام زۆر بەکەمی خورافەیان دەزانی، ئیسلامیش کە هات ئەوەشیسرپیەوەو لەشوێنیاندا برێ چیرۆکی حەقیقی دانا کە لەمێووی گەلاندا هەبون، بەلام فیرعەونەکان و فارس و هیندیەکان برێ ئەفسانەیان هەبون کە لە بنەڕەتیاندا هاوبەش بون، ئەو ئەفسانانە مۆرکی بتپەرستییان هەبووە.

چەندین توێژەر ئەو بنەڕەت هاوبەشەو بەیەککەیشتنە ریشەییەی ئەفسانەکانی یۆنان و مەسیحیەت و فیرعەونەکانیان خستوەتەڕوو، ئەو ئەفسانانەش کە وەرگێڕاون بۆ سەر زمانی عەرەبی وەك کلیلەو دمنە و هەزارو یەك شەوە، ئەوانە هی فەرهەنگی پێشئیسلامی هیندی و فارسی و فیرعەونی و ینانیەکان بون، کتێبی عەهدی قەدیم چەندین ئەفسانە لەوانەی لەخۆگرتووە، ئەدیبان و پیاوانی فیقهو هونەر لە رۆژئاوا ئەو فەرهەنگەیان قۆستوەتەوە.

سەبارەت بە چیرۆکی جەماوەری ئەمەش پاشماوەی ئەو ئەفسانانەیە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سەبارەت بە جەنگەکان هەبون، قورئانی پیرۆز هەموو ئەو فەرهەنگە کۆنەی لە تەرازووی رەخنەدا داناوە و چی ساختەیەکیان هەبووبێت ئیسلام ئاشکرای کردووەو راستیەکانیشی نیشانداوەو ئەفسانەو ناراستیەکانی نەهێتووەو ئەو راستیانەشی بە روونی نیشانداوە کە پەیوەستن بە روداوەکانی سەردەمانی کۆنەوە و ئەوانەش کە پەیوەستن بە کرۆکی ئایین و پەیامی پێغەمبەرانو خەباتیان بۆ بەرنگاربوونەوەی درۆزنان و ناراستان.

رۆژئاواییەکان بۆ لێدانی بیرو ئەدەب و رۆشنبیری ئیسلامی تائاستێکی زۆر ئەو ئەفسانانەیان بەکارهێناون تا هەوڵ دبەن سەرلەنوێ نوێییان

بکەنەوەو بڵاویان بکەنەوە، زۆر نووسەر و ئەدیب هەوڵیانداوەوەریانبگێڕن‌و ئەدەبی ئیسلامی لەو ئەفسانانەدا نغرۆ بکەن، لە خودی ئەدەبی عەرەبیشدا هەوڵدراوە ئەفسانە کۆنەکان بدۆزرێنەوە، لە گرنگترین ارەکانی رۆژهەلاتناسان و موژدەبەران بریتی بووە لە گەڕان بەدوای ئەفسانەکاندا.

رینان دەڵێت: عەرەب وەك هەموو گەلە سامیەکانی تر لە شیعرو بیروباوەڕیدا ئەفسانەی نیە، ئەوەی بیر چووە کە جوولەکایەتی تلموودی پێگەی گەورەی هەموو ئەفسانەکانی مرۆڤایەتیەو چی ئەفسانەی بابلی و ئاشووری و هی تر هەن هەمویان پەیوەستن بەو بتپەرستی و بێڕەوشتیەوە کە تلموودیەت بڵاوی کردوەتەوە.

هەندێ هەوڵیان داوە ئەفسانەی عەرەبی پێش سەردەمی ئیسلام زیندوو بکەنەوە، بیریارە موسڵمانەکان ژیاننامەی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) لە هەموو ساختەو ئەفسانەیەك پاك راگرتووەو رێبازێکی لێکۆڵینەوەی زانستییان گرتوەت بەر کە لەم سەردەمەدا بە گەورەترین رێبازی توێژینەوەی زانستی دادەنرێت، بەڵام هەندێ نووسەر لە سەردەمانی دواتردا هاتن و جارێکی تر ئەفسانەیان خستەوە ناو ژیاننامەی پێغەمبەری خواو برێ ئەفسانەی نوێیشیان دروست کردن، ئەوەش بە روونی لە کتێبی (علی هامش السیرە) دا دەردەکەوێت.

لێکۆڵەران بەرامبەر بەو ئاراستەیە وەستاون‌و بە ئاڕاستەیەکی مەترسیدار وەسفی دەکەن پاش ئەوەی موسڵمانان بە درێژایی سەردەمەکان سوور بون لەسەر پاکراگرتنی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا لە گێڕانەوە خەیاڵیەکان، چونکە ئیسرائیلیات هەوڵی داوە ئەو ئەفسانانە بلکێنێت بە ژیانی پێغەمبەری خواوە، پەیوەست بەمەش بڵاوکردنەوەی ئەفسانە لە بواری جادوودا، هونەری جادوویش هونەرێکی کۆنی جوولەکە بووە کە تیایدا

زۆر هەڵکەوتە بون و بەردەوام سوور بون لەسەری، دجادوویش کارێکی ئەفسانەو کۆکردنەوەی خورافەکانە، بۆ نموونە پیرۆزی درەخت و شاخ پەیوەستە بەوەوە، کاهینی و نوشتەو فاڵچیەتی پەیوەستە بەوەوە، چونکە کاهینیەت هەوڵدانە بۆ زانینی غەیب و داهاتو، فاڵچیەتیو کتێب گرتنەوەش گێڕانەوەی رابردووە، ئەو دوانەش هەردووکیان دوو هەوڵن بۆ پێشبینی.

ئیسلام هەموو ئەم فەرهەنگەی بە ئەفسانەو خورافەکانیەوە بەرپەرچ داوەتوەو بە تەواوەتی لە بازنەی بیری موسڵمانانا نەیهێشتووەو لەسەر بنەمای دڵنیایی و بەڵگەو ئەزموون رایهێناون، لەسایەی ئەم پەیامەی موسڵمانانا مرۆڤایەتی سەردەمی جادوو و ئەفسانەو ئەستێرەگەرایی و تەلیسم و نوشتەو قوربانیکردن بۆ داو بەردی تێپەڕاند، بەراستیش جادوو پەیوەستیەکی روونی هەیە بە بتپەرستی و ملهوریەوە، دەروونە بتپەرستی و ملهوریەکان هیوای چاکەینا لەدەستداوە وەك چۆن مۆرکی گەشبینی و مرۆیی بوونیان لەدەستداوە، بەڵام کەسی موسڵمان و باوەڕدار هەرگیز لە رەحی خوا بێهیوا نابێت و لە هیچ ناترسێت، لێرەوە بتپەرستی پەیوەستیشە بە بوونی ترس لە جیهانە نادیارەکان و مەترسی شەیتان و جنۆکەو تاریکیەکان، ئیسلام مرۆڤایەتی لەوەش رزگار کردووە لەوەی نوێژبکات یان داوای لێخۆشبوون بکات لای ئەو شتانەی پێیان دەوترێت خوای چاکە بەس بۆ ئەوەی منداڵو بەرهەمیان پێ ببەخشن، یان ئەوانە بکەن بۆ خواوەندەکانی خراپە تا لە خراپە بیانپارێزن، بەڵکو رێبازێکی یەکخواپەرستی داوە بە مرۆڤ کە بڕوابوون و هیوابوونە تەنها و تەنها بە خوای تاك وتەنها و بەتنها ترسانە لەو، هەر خوایە تاکە سەرچاوەی چاکەو خراپە و هەر ئەویش خراپە لەسەر کەسەکان لادەبات و چاکە دەبەخشێت، خوا دەفەرموێت(إن یمسسك الله بضر فلا اشف لة إلأا هو وإن یردك بخیر فهو علی کل شيء قدیر).

# باسی سێیەم

## ڕۆژئاواگەری( ڕۆژهەڵاتناسی و موژدەبەری ).

پێش ئەوەی لە سەرەتاکانی ساڵانی سییەکانی سەدەی بیستەمدا پێنج ڕۆژهەڵاتناسەکە کتێبەکەی خۆیان بنووسن(وجهة الاسلام) وشەی ڕۆژئاواگەری نەناسراو بوو و لەسەر زمانی خەڵك نەدەوترا تا ئاستێك دەوترێت بڵێین یەکەم کەس ئەم چەمکەی خستەڕوو بریتی بوو لە (هاملتۆن جب)ی گەورەیان، مەبەستی پێی ڕێژەی کاریگەی ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی بوو لە ئیسلامدا، پێناوەکانی ڕۆژئاواگەری جەختیان دەکردەوە لە بواری پەروەردە و خوێندن و ڕۆژنامەگەری و بنەرەتەکانی ژیان، زیاتریش هەوڵیدەدا دووبەرەکی لەنێوان ژیانی زەمەنی و ژیانی ڕۆحی ئاینیدا دروست بکات.

مەبەست بەمەش ئەوەیە ئامانجی دامەراندنی دووبەرەکیە لەنێوان بەها تەواوکارەکانی ئیسلامدا کە هەم ئایینەو هەم ڕێبازی ژیانە، ئەمانە مەبەستیان بوو ئیسلام بکەنە ئایینێکی لاهوتی و لایەنەکەی تری لێ داماڵن کە بریتیە لە سیستمی کۆمەڵایەتی و ڕێبازی ژیان.

جب دەڵێت: ئیسلام تەنها توانایەکی کەمی هێزی خۆی لەدەستداوە، بەڵام وەك سیستمی ژیانی کۆمەڵایەتی بڵێیت ئەوا لە کورسی و دەسەڵاتی دابەزیوە، لەپاڵ ئەوەدا یان لەسەروو ئەوەوە هێزێکی نوێیی خاوەن دەسەڵات دامەزراوە کە هەندێ کات لەگەڵ نەریتو سیستمە کۆمەڵایەتیەکانیدا نەیارو نەگونجاوە.

مەبەستی بەوەش زاڵبوونی بانکی ئەورووپییە کە سیستمی سووخۆری تیایدا زاڵەو دەسەلاتداری و سەپاندنی یاسا دانراوەکانە.

ئارنۆلد توینبی لە کتێبەکەیدا (جیهان و رۆژئاوا) باس لە رۆڵی ئەفسەرانی تورکیا دەکات لە بزاڤی رۆژئاواگەریدا کە چۆن هەوای رۆژئاواگەریو بیرە رۆژئاواییەکان داویەتی لەسەری ئەفسەران، توینبی دەڵێت: مەسەلەی رووڵەزیادبووی رۆژئاواگەری لە تورکیا تەنها بە دوو پێناو چارەسەر دەبێت: یان تورکەکان رۆژێ بێت بە دارمانی تەواوەتیان باجی هەڵەی خۆیان بدەن، یان ئەوەی بە بەرتەسککردنەوەی هەموو هێزە عەقڵیو دڵیەکانیان لە رۆژئاواگەریدا لەدەست پاکتاوی گشتگیر رزگاریان بێت.

جان پۆل رۆ لە کتێبەکەیدا (ئیسلام لە رۆژئاوادا) بەشێکی تایبەتی بەم ناونیشانە داوە(بەرۆژئاواکردنی ئیسلام) و تیایدا پێشنیازی گۆڕانی ژیانی ئافرەت و بواری پەروەردەی و چووەدەری لە رێبازی ئیسلام دەکات، موژدەبەری لە ئەفریقیا و ئەزمونی سیستمی سیاسی لیبرالی باس دەکات.

بێگومان باسی ئەم دیاردەیە لەلایەن رۆژهەلاتناسانەوە ئەو بوێریو فراوانخوازیە دەنوێنێ کە دەبێتە بەڵگەیەکی تەواوو بەردەست بۆ ئەو بڕوایەی چاکسازانی موسڵمان کە پیاوانی بزاڤی بێداریخوازین و پێیان وایە لێرەدا پیلانێکی ورد و رێکخراو هەیە کە چەندین ساڵە کاری موژدەبەریو وەفد ناردن دەکەنو پەیمانگەکانیشیان پاڵپشتی ئەو شالاوە دەکەنو پیلانی بۆ دادەنێنو کەرەستەکانی جەنگی فیکری لە گومانسازیو هەڵەسازی دەخەنە بەردەستیان، لەو رێیەشەوە ئەو گومانانە دەورووژێنرێنو ئەوانەش لە عەقڵو دڵی خەڵکیدا بەوجۆرە دەنێژرێنو

گەشەیان پێ دەدرێت کە ئامانجی داگیرکاری بێنێتەدی تا موسڵمانان ببەنە ناو بازنەی رۆشنبیری جیهانی رۆژئاواییەوە.

پێشکەشکردنی ئەو جۆرە نموونانەش پێویست نەبون، بەڵام هەندێ کینەلەدڵی دژ بە ئیسلام لە هەموو بۆنەیەکدا بێزاری خۆیان رادەگەیەنن، کاتێکچاکەکاران برێك نهێنی ئاشکرا دەکەن و لەبەردەم گەنجی رۆشنبیردا ئەو هەڵە شاراوانە دەخەنەڕوو و رەخنەیان لێ دەگرن تا مەترسی شاڵاوی رۆشنبیری و رۆژئاواگەری بزانن.

بێگومان نارەزایی ئەو کینەلەدڵانە بەکرێگیراوی و پاشکۆییان نیشان دەدات کە چۆن سوورن بگەڕێن بۆ سەرچاوەی بژێوی و ژیان(تعس عبد الدینار، تعس عبد الدرهم، تعس عبد القطیفة، تعس و انتکس).

سادەترین پێناسە بۆ رۆژئاواگەری ئەوەیە کە موسڵمانان والێدەکات ئەندێشەی رۆژئاوا وەربگرن و دەستبەرداری پاڵپشت رەسەنەکانی خۆیان بن کە ئیسلام پێی بەخشیون و مۆرکێکی تایبەتی پێ داون، هەروەها گومانننانەوەیە لە رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و یاسادانان و پەروەردەدا، ئێمە دەزانین رۆژئاوا لە سەردەمی نوێدا لە هێرشی خۆیدا بۆ سەر جیهانی ئیسلامی شێوازێکی نوێی داهێناوە کە ئەوەی لە شەپۆلی پێشوودا(جەنگە خاچپەرستیەکان) بۆیان نەهاتەدی لەمەیاندا بۆیان دێتەدی، چونکە لە شاڵاوی پێشوودا بە شکاوی گەڕانەوە بۆ لانەی وێرانەیان.

بۆیە پیلانی ئەمجارەی رۆژئاوا ئەوەبوو خۆیان دووربگرن لە بەریەککەوتن و هەوڵ بدەن لە رێی موژدەبەری و رۆژهەڵاتناسیەوە کاربکەن بۆ لەناوبردنی بنەرەتەکانی هێزی بیری موسڵمانان و کۆمەڵگەی

ئیسلامی، فەرزی جیهادیش یەکێك بوو لە بنەرەتە مەترسیدارەکان بۆ سەر ئەوان، بۆیە بەو ۆرە بەرنامەی پەروەردەو خوێندن دانرا کە بەرگرتن بە یهادیان بۆ زامن بکات، بەدوای ئەوەشدا کەوتنە بەشبەشکردنی واتای ئیسلام و هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی بۆ واتایەکی پەرستشی لاهووتی، ئەمەش بەو نیازەی لایەنی تەشریعی ئیسلامی لەناوبەرن و لەبری ئەوانەدا یاسا دانراوەکانی مرۆڤ شوێن بگرنەوە.

بێگومان دیمەنەکانی ڕۆژئاواگەری خۆیان دەنوێنن لە بزافی موژدەبەریدا کە تا ئێستاش بە روونی لەبەرامبەر ئوممەتی ئیسلامیماندا کاری خۆی دەکات، لە پیلانەکانی موژدەبەریەوە راستی ڕۆژئاواگەری دەرکەوت وەك دکتۆر زوەیمر دەڵێت: ئامانج لە موژدەبەری ئەوە نیە موسڵمان ببرێتە ناو ئایینێکی نوێوە، بەڵکو ئامانج ئەوەیە لە ئیسلام ببرێتە دەرەوە تا ئەوەی ببێتە نەیارو دوژمنی ئیسلام.

بۆیە ئامانجەکە ئەوەیە ڕۆشنبیری رووەو ملهوڕی و بێڕەوشتی ئاڕاستە بکرێت، ئەوەش کرانەوەی ئاسۆی راپەرینی دژ بە ئایین و هەموو بەهاکانە، ئەمەیە ئامانجی گەورە کە دەیانەوێت مرۆڤایەتی پێ فێر بکەن.

بیروراو بۆچوونی ژەهراوی ڕۆژهەڵاتناسان ئامانجی نووسینەکانیان و ئەو ساختانەش دەردەخات کە تۆماریان دەکەن.

شالاوی ڕۆژئاواگەری جەختکردنەوەیە لە لێدانی بەهاو بنەرەتو مێژووو زمانو نانەوەی شێواندنو لێتێکدان و پچڕاندنی پەیوەندی نێوان بنەرەتو لقەکانو تێکدانو شێواندنیان.

هەوڵەکە بۆ ئەوەیە روانینی لاوەکی شوێنی روانینی گشتگیر بگرێتەوە، بڕێ واتا بۆ بەهاکان بخرێنەروو کە جیاواز بن لە واتا رەسەنەکان، مۆرکی

تایبەتی بیرو رۆشنبیری ئیسلامی داماڵن وەك جیاکاری نێوان مەعریفە و رۆشنبیری و تێکەڵکردنی زانست و فەلسەفە بەیەکتر و بانگەوازکردن بۆ ئەو پەیامە رۆژئاواییەی کە بەهاکانی پەیوەست بە ئەدەب و سیاسەت لە یەك جیادەکاتەوەو لە ئەخلاق جیاجیان دەکاتەوە.

بەگشتی رۆژئاواگەری ئامانجی ئەوەیە هەستکردن بە کەموکورتی لە دەروونی موسڵمانانو دەروونی رۆژهەلاتیەکاندا بە گشتی بێنێتەدی، ئەمەش بە گومان نانەوەو گۆڕینی مێژووی ئیسلامیو پێدانی زانیاری هەڵە بە خەڵکیو بەکەم دانانی ئەو رۆڵەی کە ئیسلام لە مێژووی رۆشنبیری مرۆییدا نواندوویەی، هەروەها هەوڵ دان بۆ نکوولی کردن لەو بنەرەتە مێژوویی و رۆشنبیری و رۆحیانەی کە لە رابردووی ئەم ئوممەتەدا خۆیان نواندووە، هەروەها بەکەمگرتنو سووکایەتی کردن بە بەها ئیسلامیەکانو چاوداخستن لە ئاست توانای زمانی عەرەبیو پچڕاندنی پەیوەندیەکانی نێوان عەرەبو موسڵمانانی تر.

مەترسیەکی تری گەورەی رۆژئاواگەری بریتیە لە بەرگرتن بە دروستبوونی یەکبوونی هزری کە هەنگاوی یەکەمی یەکبووی ئوممەتی ئیسلامیە، بەرامبەر بەوە سەرقاڵکردنیان بە دەیان رێباز و بانگەوازی تر، راستکردنەوەی جیاوازیە رۆشنبیری و ئابوریەکانی ناو ئوممەتی ئیسلامی تا رێ نەدات ببنە یەك.

بزاڤی رۆژئاواگەری بانگەوازێکی تەواوە کە سیستەمو ئامانجو پاڵپشتی خۆی هەیە، چەند دامەزراوەی جیاجیا خزمەتی دەکەن کە گرنگترینیان دامەزراوەی موژدەبەریو رۆژهەلاتناسین، بانگخوازانی ئەم رێبازە دەڵێن موسڵمانان برێك بەها و خۆیەتی تایبەتیان هەیە کە رێگرن لە توانەوەو

تێکەڵبوونیان لەناو گەلانی تردا، توانایەکی بەهێزیشیان پێدەدات بۆ بەرنگاربوونەوەی قەڵەمڕەوی بیانی و داگیرکەر، تەنها ڕێگەی لەناوبردنی ئەو بەرنگاربوونەوەش تێکەڵکردنی موسڵمانانە لە بازنەی بیری ڕۆژئاواییدا و دەرکردنیانە لە بەهاکانی خۆیان تا تێکەڵ بن بە بەهاکانی ڕۆژئاوا، ئەوەش بۆ دروستکردنی کەشێکی بەیەکگەیشتن لەگەڵ موسڵمانان و چوونەژێر ئاڵای ڕۆژئاواوە.

## موژدەبەری

موژدەبەری پشت دەبەستێت بە هەریەك لە خوێندنگەو نەخۆشخانەکان، ئەمەش بە گرنگی دان بە باری منداڵانو سەرەتای پێکهاتەی گەشەکردن، وە گرنگیدان بە باری نەخۆش و لاوازیەکەی.

پیلانەکانی موژدەبەران و توێژینەوەکانی کۆنگرەکانیان لەسەر ئامانجی موژدەبەری یەکدەنگن کە بریتیە لە دروستکردنی عەقڵیەتێکی گشتی کە هەموو بنەرەتەکانی بیری ئیسلامی بە سووك بگرێت و ئەو لایەنانەی کە وێنای ئیسلام دەکەن لە مەڵبەندەکانی ئاڕاستەکردن دووربخرێنەوە.

تا ئێستاش پیلانی موژدەبەری یەکەو گشتگیرەو چەند قۆناغو ئەڵقەیەکە، پیاوانێکی خاوەن ئەزموونو بەتواناو بیرقووڵ بۆ پیلانەکانی ڕۆژئاواگەریو خزمەتی داگیرکەر شەرپەرشتی دەکەن، بەگشتی وەزارەتەکانی دەرەوەو داگیرگەکانی ناو وڵاتە داگیرکراوەکان لەخۆدەگرێت، پەیوەندیشی هەیە لەگەڵ کۆمەڵی ڕۆژهەڵاتناسانە تا بابەتە نوێیەکان پوخت بکرێنەوە بۆ گومان نانەوە.

لەو بابەتو نووسینانەوە کە کۆنگرە ڕۆژهەڵاتناسیەکان نووسیویانن ئاستی هاوکاری نێوان هەموو ئەو دەستانە نیشان دەدات، ئەوەش دەخاتە

رو وەزارەتەکانی داگیرکەکان موژدەبەران بەکاردێنن تا لەناو وڵاتانی ئیسلامیدا کاربکەن و جەخت بکەنەوە لە گرنگی کاریان و کارایی رۆڵیان تا ببنە ناونیشان بۆی و پێناوی گۆڕینی بیرەکان بەوجۆرەی دەیانەوێت.

چەندین سیاسەتمەدار ئاماژە دەدەن بە گرنگی رۆڵی موژدەبەری، لۆرد بلفۆری وەزیری دەرەوەی بەریتانیا دەڵێت: لە دیدی داگیرکەردا موژدەبەران چاوی داگیرکەرن کە ئاگادار دەبن بەو ناوچانەی جێی گرنگی دەوڵەتانی رۆژئاوان لەرووی زانیاری بیروباوەڕو ئەدەو رۆشنبیری موسڵمانانو ئەو زانیاریانە دەدەن بە دەوڵەتانی رۆژئاوا.

کۆنگرەی داگیرکاری کە لە ساڵی ١٩١٠ لە بەرلین بەسترا ئاماژە بەوە دەدات پێشڕەوی موسڵمانان هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ گەشەسەندنی داگیرکەکانمان، ئەوەش حکومەتەکان ناچار دەکەن باری موژدەبەری ئەنجام بدەن و رێی بۆ خۆش بکەن تا کارەکانی بکات.

یەکێك لە بەرنامە و بنەماکانی موژدەبەری ئەو یاسایە کە دەڵێت هەموو پێناوەکان بۆ موژدەبەری گیراونەتەبەر تەنانەت کارە چاکەکانیش، هەریەك لە بواری پزیشکی و خوێندن گرنگترین پێناوەکانی موژدەبەرانن.

هەروەها پیلانەکان ئاماژە بەوە دەدەن کاری موژدەبەری لەسەر بنەماکانی پەروەردەی عەقڵیو کارکردنە سەر عەقڵو دڵی موسڵمانان بێتو ئەو بیروبۆچوونانە بڵاوبکرێنەوە کە لەگەڵ زمانە ئەورووپیەکاندا دزە بکەن، ئەوەش لەرێی بڵاوکردنەوەی زمانەکانی ئینگلیزیو ئەڵمانیو هۆڵەندیو فەرنسیەوە، ئەمەش رێخۆشکەرە بۆ ئەوەی ئەو بیر و روانینانە ببرێنە ناو موسڵمانانو ئەوەش دەبێتە هۆی بارو تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتیە ئیسلامیەکان بکەون تا تایبەتمەندیە رۆژئاواییەکان شوێنیان بگرنەوە.

# ڕۆژهەڵاتناسی

لەبەرئەوەی ڕۆژهەڵاتناسی کارگەی بنەرەتی پیلانی ڕۆژئاواگەرییەو موژدەبەریش پیلانی بەردەستیەتی، بۆیە راستترین پێناسە بۆ ڕۆژهەڵاتناسی بریتیە لەوەی بەکارهێنانی زانستە بۆ خزمەتی سیاسەت.

بابەتی ڕۆژهەڵاتناسی گەورەترین بەخششی موژدەبەریە لەرێی خوێندنگەو ڕۆژنامەوانیەوە، لە بواری خوێندنیشدا بۆ پاڵپشتی پیلانەکانیەتیو وروژاندنی هۆکارەکانی ناکۆکی و نانەوەی گومانەکانە.

ڕۆژهەڵاتناسی بەدیدێکی پێشوەختە و حوکمی بڕیارلەسەردراو و ئامانجی روون لێکۆڵینەوەی مەسەلەکان دەکات، بنەڕەتەکەشی خزمەتی قەڵەمڕەوی داگیرکاریەو بنەڕەتەکەشی دەمارگیری و تۆمەتدانە بە ئیسلامو زمانی عەرەبی، کاری کەسانی ڕۆژهەڵاتناسی بەوردی ڕوانینە بۆ بڕێ شتی ورد و گەورەکردن و کۆکردنەوەو قەبەکردنی ئەو شتە بچووکانە، هەرچەندە دەربڕینەکانیان بە شێوەیەکی بریقەدار دیمەنێکی زانستییان بەبەردا کراوە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا کینەو دەمارگیری و بێ ئەزموونی و بەروونی دانەپاڵ ئامانجی خۆیانی لەخۆگرتووە.

ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسان لە بواری موژدەبەریدا کاریان کردوە، نوسینەکانیان سووتەمەنی بەهێز بون بەدەست موژدەبەرانەوە، لەوانە: مرجلیۆس و ماسینیۆن و هنری لامنس و لویس شیخۆ و فنسنك و جۆلد سیهەر، ئەوانە لەو ڕۆژهەڵاتناسانەن کە زۆر دژ بە ئیسلامو زمانی عەرەبی بون، کاری زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسان کەمفامیو ئارەزووکاری ئەوان نیشان

دەدات لە کاەکانیاندا، یەکێك لە مەسەلە هەستیارەکانی پەیوەست بە ڕۆژهەڵاتناسی ئەوەیە کە کەسانی وتە ئیسرائیلیە موژدەبەریەکان لە ساڵانی دواییدا بەرگی خۆیان لابرد پاش ئەوەی باری راستییان ئاشکرا بوو و خۆیان لەپشت پەردەی ڕۆژهەڵاتناسیەوە حەشاردا، زۆرێك باس لە نیازپاکی و ساکاری ڕۆڵی ڕۆژهەڵاتناسی دەکەن لە زیندووکردنەوەی فەرهەنگی ئیسلامیدا، بەڵام هەرکەس سەرچاوەی گرنگیدانی ڕۆژهەڵاتناسان بە ئیسلام بزانێت دەزانێت کە بێلایەن نەبووەو لەپێناو زانست و حەقیقەتدا نەبووە، بەڵکو ئەوان زانیویانە چۆن لەپشت ئەو توێژینەوانەوە کاری خۆیان بکەن و هەڵوێستەکانی خۆیان بۆ ئەو گەلانە بخەنەڕوو و پێناوەکانی ملکەچکردن و دەسەڵاتداری پەیڕەو بکەن، ئەوان بە هەموو ئەمانە ئامانجیان ئەوەیە لایەنەکانی بەهێزی موسڵمانان بزانن بۆ لەناوبردنی‌و لایەنەکانی لاوازیشیان بزانن بۆ قووڵکردنەوەی ئەو لاوازیەیان، ئەوەش لەپێناو ئامانجێکی ڕووندا کە مانەوەو بەردەوامی قەڵەمڕەویانە، لە هەموو نووسینیاندا هەوڵیانداوە ئیسلام و موسڵمانان‌و زمانی عەرەبی بخەنە قەفەسی تۆمەتباریەوەو نووسەرانی موڵمان لە هەڵوێستی بەرگریدا خۆیان ببیننەوە.

ئەگەر ڕۆژهەڵاتناسی تەنها لەپێناو زانستدا بووە ئیتر بۆچی جەختکردنەوەی لەسەر لایەنە بەرتەسکەکان و گومانە نادڵنیاکان و دەقە نایەکلاییەکان بووەو وازیان هێناوە لەو شتانەی کە دڵنیا و تەواوو ڕوونن؟ بۆچی لە کاتی توێژینەوە لە شەریعەتدا جەختی کردوەتەوە لە سەر خیلاف؟ کاتێ باسی فەلسەفە دەکات پشت دەبەستێت بە باتینیەت؟ کاتێ باسی تەصەوف دەکات جەخت دەکاتەوە لە وەحدەتولوجود؟ کاتێ باسی زمان دەکات جەخت دەکاتەوە لە عامیەت؟

بۆچی لە بواری ئەدەبدا گرنگی دەدات بە بشار و ئەبی نەواس؟ لە تەصەوفدا گرنگی دەدات بە حەلاج و سوهرەوەردی؟ لە فەلسەفەدا گرنگی دەدات بە ئەبوبەکری رازی و راوەندی؟ بۆچی هێرش دەکاتە سەر موتەنەبی و غەزالی و ئیبن خەلدون و ئیبن تەیمیە کە لە دیارترین کەسانی بواری ئەدەب و هزری ئیسلامین؟!

بۆچی هەزار بواری رەسەنایەتی ناو هزری ئیسلامی وازلێدێنێت و جەخت دەکاتەوە لەچەند پەراوێزێك کە پەیوەستن بە شوێنەواری فارسی و هیندی و یۆنانی؟ بۆچی سەرلەنوێ ئەو گومانانە دەوروژێنێتەوە کە شعووبیەت لە کۆندا وروژاندوونی و ئەم سەرلەنوێ دەیانخاتەوەڕوو؟ بۆچی جەخت دەکاتەوە لەسەر ناکۆکیەکانی نێوان سوننەو شیعەو هەوڵ دەدات ناکۆکیەکانی نێوان ئایینەکان و ئوممەتان و ڕێبازەکان بوروژێنێتو دەرگای گومانی نێوان عەرەب و موسڵمانانی تر بکاتەوە؟

بۆچی ئەو هەموو گرنگیدانە بە مێژووی زەنجو قەرمەتیو مەجووسیەکانو بانگەشەکردنی ئەوەی کە ئەوانە شۆڕشی ئیسلامی بون؟ بۆچی ئەو هەموو توێژینەوە دووردرێژانە سەبارە بە پێغەمبەرایەتی موسەیلەمەی درۆزن و نکوولی کردن لە بووی عەبدولای کوڕی سەبەء؟.

بە ڕوانینێکی گشتگیرانە بۆ کارەکانی ڕۆژهەلاتناسان بەروونی ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ڕۆژهەلاتناسی جەختی کردوەتەوە لە کارکردن لەسەر بیرو فەلسەفە نێردراوەکانو بارە ناجێگیرو بارگرژیەکان، هەوڵیداوە هەموو ئەوانە بداتە پاڵ فەرهەنگی پاكو پوختی ئیسلام.

# شعووبیەت

لەروانەگەی پیلانەکانی ڕۆژئاوایەوە کۆمەڵێ شوێنکەوتە دەرکەوتن کە قەڵەمڕەوی ڕۆژئاوایی لە دەستەو پەیمانگەکانیدا رایهێنابوون، ئەمانە گاڵتەیان دەکرد بە هەموو بەهایەکی ئیسلامیو دژی بنەرەتەکانی ئەو بەهایانە بوون و گاڵتەپێکردن وچاوپۆشیلە تواناکانی بەها ئیسلامیەکانیان گرتبوویەبەر.

لەم واتا لادەرانەوە ئەوە دەرکەوت کە بە شعووبیەتی نوێ ناسراوەو بەرهەڵستیەکی راشکاوانەی بەها بنەرەتیەکانی بیری ئیسلامی و واتاکانی زمانی عەرەبی و قورئان و پێغەمبەر و ئیسلام و مێژوو و فەرهەنگ دەکات، زیاتریش کاری کەمدانانی ئەو توانایانەیە و چاوپۆشیە لە شانو شکۆیانو نانەوەی گومان لەسەریان، بەگشتی لەسەر ئەم بنەڕەتانە وەستاوە:

**یەکەم:** هەرێمچێتیو بەرزراگرتنی بانگەوازە کۆنەکانی وەك فیرعەونیو فینیقیو جاهیلیەتی عەرەبیو بتپەرستی یۆنانی و زیندووکردنەوەی ئەوانە لە ناو ئەدەبو مێژوو و شانۆ و رۆماندا.

**دووەم:** نکوولّی کردن لە بوونی پەیوەندیەکۆکەرەوە ئیسلامیەکان.

**سێیەم:** چاوداخستن لە توانای زمانی عەرەبیو بەرزاگرتنی زمانە ناوچەییەکان.

**چوارەم:** هەوڵدان بۆ دانانی چەمکی نەتەوەپەرستی هاوردەکراو.

**پێنجەم:** بەکەمدانانی مێژووی ئیسلامی و تانەلێدانی.

**شەشەم**: نکوولّی کردن لە کاریگەری شارستانیەتی ئیسلامی لەناو شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا.

**حەوتەم**: بەتاڵکردنەوەی چەمکی عەرەبایەتی لە بەها ئیسلامیەکان و مێژوو و فەرهەنگ، مۆرکی رەگەزپەرستیو پەردەی عەلمانیەت زاڵە بەسەر ئەم ئاراستەیەدا، چوارچێوەیەکی بریقەداری ئەو رێبازە بریق و باقە هەیە کە لەپشتیەوە مەترسیدارترین دەمارگیری و کینەو گومانسازی و تانەدان و بەکەمگرتن خۆیان حەشارداوە، شعوبیەتی نوێ ئامانجیەتی موسڵمانان لە چەمکێکی ساختەی مەترسیداردا بتوێنێتەوە کە بریتیە لە چەمکی جیهانیبوونی رۆشنبیری یان رێبازی بیری ئازاد، هەردوو ئەو چەمکانەش دارشتەی بانگەوازەرووخێنەرە تلموودیە صەهیۆنیەکانن.

# باسی چوارەم

# زیندووکردنەوەی هێلێنیەت

یەکێك لە هەوڵە مەترسیدارەکانی ژێرسایەی قەڵەمڕەوی داگیرکاری بریتی بوو لە زیندووکردنەوەی هیلینیەتوهەوڵدان بۆ نغرۆکردنی بیرو ڕۆشنبیری ئیسلامی لە شەپۆلی وەرگێڕانەکانی یۆنانی و ئیغریقیدا، ئەو بانگەوازەش بە وەرگێڕانی نووسینەکانی ئەرستۆ دەستی پێکرد و دواتر بە وەرگێڕانی ئەفسانەکان بازنەکە فراوان کرا، کاتێ توێژینەوە زانکۆییەکان وانەکانی زمانی یۆنانی و لاتینی کۆنیان خستنە خوێندنەوە بازنەی ئەو ئاراستەیە زیاتر بوو، پاشان ڕەوتێکی گەورە دەرکەوت کە کاری زیندووکردنەوەی ئەو فەرهەنگەو سەپاندنی بوو بەسەر بیری ئیسلامیدا، دواتریش لە بنەرەتەکانی ئەدەب و تایبەتمەندیەکانی فیکردا کاریگەری خۆی هەبوو، ئەو کاریگەریەش زیاتر بوو لە کاریگەری وەرگێڕانەکانی تایبەت بە فەلسەفەی یۆنانی لە سەردەمی عەبباسیدا.

لەژێ ناونیشانێکی گەورە و ساختەدا بانگەواز بۆ ئەو پیلانە بەڕێوەدەچوو لە هەمان کاتدا کە دەوترا ڕۆشنبیری یۆنانی سەرچاوەی ڕۆشنبیری مرۆییە.

توێژینەوە بەهێزەکان ساختەو ناراستی ئەو بانگەشەیان نیشاندندا کە دەڵێت چەندین سەرچاوە لە بواری ڕەوانبێژی و ڕەخنە یان مەنتیقدا کە عەرەب نووسیونی لە یۆنانەوە وەریگرتون، بەڵکو عەرەبە موسڵمانەکان پێش ئەوەی پەیوەندی بکەن بە ئیغریقەوە ئەو شتانەیان دارشتوون،قورئانیش

دەروازەو سەرچاوەی بنەرەتییان بووە بۆ بنیادی ئەدەب و فیکریان، زمانی عەرەبیش بە رابردووی گەشیو سەربەخۆیی روونی لەپێش ئیسلامیشدا چەندین هەنگاوی ناوە پێش ئەوەی قورئانیش دابەزێت، بەجۆرێك ئەمە ساختەی بانگەشەی کاریگەری موسڵمانان بە یۆنان ئاشکرا دەکات، ئەو بانگەشەیە هەندێ شعووبی شوێنکەوتەی رۆژهەلاتناسی و موژدەبەری بەو ئامانجە گرتوویانەتەبەر تا بڵێن پاشکۆیەتی موسڵمان لە کۆندا بۆ یۆنان بەربەست نیە بۆ پاشکۆبووی ئەمرۆیشیان بۆ ئەو ئەورووپیانەی کە جێگرەوەی یۆنانیەکانن.

درۆیەکی تری ئاشکرابووی ئەوانە ئەوەیە کە دەڵێن میصر خاوەن عەقلیەتی یۆنانییە یان خاوەن بیری یۆنانیە کە هەر لە پێش ئیسلامەوە کاری کردوەە سەر گەلانی کەناراوەکانی دەریای سپی، ئەو کاریگەریە هەرچەند بووبێت ئەوا ئیسلام هەموو کاریگەری ئایین و رێبازەکانی تری لابرد و رێبازێکی نوێی دانا کە وەرگیراوی قورئان بوو و پەیوەست بوو بە ئایینی حەقەوە، هاوکاتیش تەواو پەیوەست بوو بە دەروونو فیترەتی مرۆییەوە.

چەندین توێژەر جەختیان لەوە کردوەتەوە کە دەرکەوتنی ئیسلام مەودایەکی هزری و بەربەستێکی نێوان دوو رەگەز بوو، داروپەردووی بیری مرۆییش کە لە پێش ئیسلامدا شەپۆلی دەدا تووشی داکەوتنێکی گەورە بوو کاتێ کەوتە ژێر تیشکی بیری خواپەرستی سروشی و مۆرکی مرۆیی و رزگارکەری مرۆیی لە ۆیلایەتی و بتپەرستی و ملهوڕی و بێرەوشتی، هیچ بایەخێ بۆ قسەی ئەوەش نیە کە دەڵێت فەلسەفەی ئیسلامی تەنها نووسراوەی فەلسەفەی یۆنانی بووە بە زمانی عەرەبی و بەس، بەڵکو موسڵمانان لە قورئانەوە مونتەلەقی زانستی و رێبازی مەریفەی خۆیان

وەرگرتووە و ڕێبازێکی پوختیان پێ داناوە کە تەواو جیایە لە فەلسەفە کۆنەکان و لە دوو ڕوانگەوە نەگونجاوە لەگەڵیان: لە خاڵی سەرەتاوە کە بریتیە لە یەکخواپەرستی بەرامبەر بە فرەخودایی و بتپەرستی، لە ڕوانگەی خاڵی پەیڕەویشەوە کە بووی کۆمەڵگەی یەکسانە دژ بەسیستمی کۆیلایەتی باوی ناو کۆمەڵگەکانی سێ شارستانەیتە گەورەکەی ئەو کاتی جیهان(فیرعەونی و فارسی و ڕۆمانی).

زانایانی موسڵمان بەرامبەر بە بیروبۆچوونەکانی ئەرستۆ و بەرامبەر بە مەنتیقیش بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستیان هەبووە.

ئەگەر وفەلسەفەی یۆنانی کە لەسەردەمی عەباسیدا وەرگێردرایە سەر زمانی عەرەبی بە ویستی موسڵمانان بووبێت، ئەوا ئەو فەلسەفە یۆنانیەی کە لە سەردەمی نوێدا وەردەگێردرێت لەکاتی لەدەستنەبوونی ویستی موسڵمانانە، بەڵکو بەزۆر بەسەریاندا سەپاوەوخۆیان هیچ سەرپشکیەکیان نەبووە تیایدا، لێرەوە هەموو وەرگێڕانەکانی بوارەکانی ئەفسانە و شانۆیی و بوارەکانی تر و هەوڵدان بۆ هێنانی ئەو شتانە بۆ ناو بیری ئیسلامی، هەموو ئەمانە دژ بە خودێتی ئیسلامی و مەزاجی ئیسلامی بون، ئەو ویستەی کە چواردە سەدەیە لە قورئاندا جیا لە واتا بتپەرستیە یۆنانیەکانی ماددیگەری و بێڕەوشتی وێنای خۆیان هەیە.

ئەگەر خوێندنگەی هیلینی نوێ توانیبێتی سەرکەوتنێکی کتوپڕی هەبێت، ئەوا ئەو خوێندنگە ڕەسەنایەتیەی کە لە بزاڤی بێداریخوازی ئیسلامیەوە هەڵکەوتووە توانیویەتی ساختەکانی ئەو خوێندنگەیە ئاشکرا بکات و مەسەلەکان بگێڕێتەوە بۆ حەقیقەتی خۆیان، نەك تەنها بۆ وەرگێڕانە نوێکان، بەڵکو بۆ ڕاستکردنەوەی وەرگێڕاوە فەلسەفیە

یۆنانیەکانیش کە هێنراونەتە ناو بیری ئیسلامیەوە، بۆیە چەندین راستی لەو بوارەدا دەرکەوتن، لە گرنگترینیان بریتین لە:

**یەکەم:** ئەو فەلسەفەی لە سەردەمی عەبباسیدا وەرگێردرا بۆ موسڵمانان رۆشنبیریەکی دروستی ئیغریقی نەبوو، بەڵکو وێنەیەکی بیروباوەری نستووری و یەعقووبی بوو کە وەریانگێڕا و مەبەستیشیان گەیاندنی بیروباوەڕی نەصرانیەت بوو لە ناو جیهانی ئیسلامیدا، بۆیە فەلسەفەی یۆنانییان کرد بە رێگەیەك بۆ ئەو کارە، ئەمە وێڕای ئەوەی ژمارەیەك لەو کتێبانە درابوونە پاڵ کەسانێ کە اەراستیدا ئەوان نەیاننوسیبوون، یەکێك لە وشتانەی درابوویەوە پاڵ ئەفلاتۆن نووسینێکی ئەرستۆ بو، ئەو فەیلەسووفانەی ئالاهەڵگری ئەو کارە بوون وەك فارابی و جگە لەویش پشتیان دەبەست بە ساختەکاری، بۆیە لەو توێژینەوانەیاندا خراپترین کاریگەرییان هەبوو.

**دووەم:** پووچی ئەو بانگەشەیە دەردەکەوێت کە هەندێ شعووبی دەیانوت گوایە موسڵمانان کاریگەر بون بە ئەدەبی یۆنانی، توێژەرانیش ساختەی ئەو رایەیان ئاشکرا کردووە، لەوانەش ئەو وتەی فەخری ئەبوسعوودە کە دەڵێت: نهێنی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەلیقەی عەرەب کە لەسەر بەیان و رەوانبێژی وەستابوو، چونکە عرەب تەنها زمانیان هەبوو وەك پێناوی دەربڕین، دواتر رەوانبێژی لەنێویاندا ریشەی داکوتا و پلەی رەوانبێژان لایان بەرز بوو، زمانەکەیان جێپێی توندی داکوتاوی هەبوو، ئەدەبیان پێگەیشت، کەچی هێشتا خێڵەکی بوون و پشکیان لە شارستانیەتدا کەم بوو، بۆیە هیچیێ لەو هونەرانەی دەوریان گوێ پێ نەدەدا وەك هونەرەکانی یۆنان و رۆمان و فارس و میصریەکان.

**سێیەم**: پشکنینی دەقە کۆنەکان توانی ساختەی ئەو بانگەشەیە نیشان بدات کە دەڵێت بنەرەتەکانی زمانی عەرەبی لەسەر بنەماکانی ئەرستۆ دانراون و عەرەبیش ئەوەیان وەرگرتووە.

بەڵکو ئیبنولئەسیر لە کتێبی (المثل السائر) دا هەڵەی ئەو تۆمەتە ئاشکرا دەکات، ئەو کتێبە لە ناودارترین کتێبەکانی بواری رەوانبێژیە، ئەو دەڵێت(ئەگەر بڵێیت ئەوانە زانیاریەکانی زانایانی یۆنانیان بیستووەو لەوێوە فێر بون، من لە وەڵامدا پێت دەڵێم ئەوە شتێکی ناراستە....من ئەوە بە پووچ و ناردوست دەزانم، چونکە من هیچێك لەوانەم نەدەزانی کە حەکیمانی یۆنان باسیان کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بڕوانە بۆ وتەکانم...هەندێ فەلسەفەگەرا لەو بوارەدا قسەیان لەگەڵ کردوم) دواتر وتەیەك دێنێت کە ئەبوو عەلی ئیبن سینا لە باسی وتارێژی و شیعردا هێناویەتی، چەندین نموونەی شیعری یۆنانی دێنێتەوە کە ناسراو بووە بە لاغوزیا، ئینجا کتێبی الشفا ی ئەبوو عەلی دێنێت، دەڵێت کاتێ سەیرم کرد لام روون نەبوو، چونکە زۆر درێەی پێدەدا وەك ئەوەی هەندێ یۆنانی بدوێنێن، هەرچیەکی باس کردووە هیچ بۆ کەسی زمان عەرەبی سوودی لێوەرناگیری.

**چوارەم**: ئەو هەوڵە وێرانکەرانەی کە مەبەستیانە بیری ئیسلامی نوێ ببەستنەوە بە هیلینیەتەوە وەك ئامانجێکی رۆژئاواگەری بۆ زیندووکردنەوەی بتپەرستی لە بزانەی ئیسلامیدا دەستیان ئاشکرا بوو، ئەوان ئەوە دەکەن تا دەسترۆیی ئەورووپی نوێ بەسەر موسڵمانانداقبووڵ بکرێت، هەموو ئەمەش بە ئامانجی دارماندنی بەهاکانی رەوشت و زیندووکردنەوەی بێڕەوشتیە.

دکتۆر زەکی موبارەك دەڵێت: یۆنانیەکان دوای دەرکەوتنی ئیسلام چەندین نەوە لە نەفامی خۆیاندا ژیان و نەوە دوای نەوە خەیاڵاتی پێشینەکانی خۆیان بۆ دەمایەوە، تا ئەوەی توندرەوانی شاعیرانی فەرنسیس و ئینگیز هاتن و کەوتنە گێڕانەوەی سەرلەنوێی ئەو بتپەرستیە چونکە لەسەر بنەمایەکی بریقەدار وەستاوە کە بریتیە لە پیرۆزراگرتنی چاوچنۆکیەکانی نەفس و سەرکەشی هەستەکان.

ئەگەر کەس هەبێت سەری سوڕبمێنێ لە بێدەنگی موسڵمانان لە وەرگێڕانی چیرۆکەکانی یۆنان، ئەوا دەبێت بزانێت ئیسلام ڕێ نادات بە موسڵمانان بتپەرستی عەرەبی زیندوو بکەنەوە، چونکە لە سیەی ئیسلامدا کۆتاییان هێنا بە زینووکردنەوەی بتپەرستی یۆنانی.

**پێنجەم**: توێژەران دژی ئەو وتە زیادەرەویەن کە دەڵێت ئەرستۆ مامۆستای یەکەمی عەرەبە و یۆنانەکان مامۆستای هەموو جیهان و رۆشنبیرانی گەلانن، بەڵکو توێژەران هەوڵەکانی زەقکردنەوەی پێگەی وتاربێژییان لە یۆنان و پشتگوێ خستنی لای عەرەبو هەوڵی سەپاندنی ئەو بیرەیان تێکشکاندووە گوایە بیریارانی یۆنان رێبەرانی بیری مرۆیین.

بەڵکو دەڵێن ئەو هەوڵە بۆ ئەوەیە کە دەروونی خەڵکی کاریگەر بێت بەوان و زمانو ئەدەبی موسڵمانانی لا گەورە نەبێت.

**شەشەم**: بیرو رۆشنبیری ئیسلامی بەرامبەر هەموو ئەو واتا و بەهایانە دەوەستێتەوە کە هیلینیەت هێناویەتی بۆ موسڵمانان، بروا قووڵی یەکخواپەرستی موسڵمانان ڕێ نادات ملکەچ بکەن بۆ هەر شتێکی بتپەرستی و ملهوری و بێڕەوشتی و دژەفیترەتی هیلینیەت.

ئەرنست رینان ئاماژە دەدات بەوەو دڵێت: یەکخواپەرستی گرنگترین تایبەتمەندی موسڵمانانە، ئەمەیە پوختەو راڤەی هەموو سیفەتەکانیان، ئایینی ئیبراهیم دووربوو لە کۆت و بەند، هەروەها ئاماژە دەدات بە بزاڤی وەهابیەت لە نیمچە دوورگەی عەرەبی و دەڵێت: ئەو بزاڤە بریتیە لە نوێکردنەوەی بیری یەکخواپەرستی تا بیروباوەری ئیسلامی لە هەر رەگەزێکی رۆژئاوایی پوخت بکاتەوە کە برابێتە ناو ئیسلام و لە فیترەتی یەکەمی خۆی دووری خستبێتەوە.

ئەو چەنکێ یکخواپەرستیە بووە کە دووری گرتون لەو میسۆلۆجیایەی یۆنانەکان هەیانبوو.

**حەوتەم**: بزاڤی بێداریخوازی جیاوازی نێوان پەیامی بیری ئیسلامی و بیری هیلینی لەسەر فیقهو رۆمان و شانۆگەری خستوەتەڕوو، ئەوەشی باس کردووە کە چۆن موسڵمانان پێویستیان نیە بەو هونەرە بۆ بنیادی بیری خۆیان و روونی بانگەوازیان و ساکاری پەیامی یەکخواپەرستییان و دووری لەو کۆت و بەند و ئاڵۆزیەی کە پێویست بەوە بکات بە ئەفسانەو شانۆگەری روون بکرێتەوە، هەروەها موسڵمانان دوورن لە بیری پەرستنی پاڵەوان و نەیاری ئەو بیرەن کە دەڵێت تاوانی یەکەم سەرچاوەی چەرمەسەریەکان بووە، نکوولی دەکەن لە بانگەشەی ململانێی نێوان خودا و خەڵکی.

قورئانی پیرۆز بە چیرۆکە راستیەکان موسڵمانانی فێرکردووە چۆن بەشداری راشکاوانەو شێوازی روون بگرنەبەر دوور لە هێما و ئاماژە و پێچ و پەنا.

ئەمە وێڕای ئەوەی قورئان پاکیزەییو ڕێزی ئافرەتی بە موسڵمانان وتووە، مۆرکی ڕەحمەت و لێبوردەیی و بەخشندەیی فێرکردون، هەموو ئەمانە لەگەڵ ئەو چیرۆکە یۆنانیانەدا ناگونجێن کە پڕن لە درندەیی و ستەم و گەندەڵی و خراپەکاری بەوجۆرەی کە لە چیرۆکی ئەلکەترا و ئۆدیبدا هاتووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تورەیی و ڕەقی خواوەندە ئیغریقیەکان و حەزی خراپە و تۆڵەسێنییان.[1]

**هەشتەم**: بیری ئیسلامی دژبە دیدی ملهوڕی و دوانەخودایی و بتپەرستی و بێڕەوشتی هیلینیەت وەستاوە، ئەو دیاردانەی هیلینیەتیش میراتی بیری ڕۆژئاوایی و ژیاری ئەورووپین کە بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری دەیانەوێت سەرلەنوێ بیانسەپێنن بەسەر بیرو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، ئەویش بە زیندوکردنەوەی شانۆگەریە یۆنانیەکان و ئەدەبی ئیغریقی.

**نۆیەم**: بیری ئیسلامی چەمکی پاڵەوانی یۆنانی بەپەرچ دەداتەوە، ئەو چەمکەی کە بەندە لەسەر شێوەپێدانی ماددی، بەڵکو ئیسلام چەمکی ڕەسەنی خۆی هەیە کە بەندە لەسەر ڕێزگرتنی کار و زیندووکردنەوەی ئەو ڕۆڵەی کە پاڵەوانێك لەپێناو ئوممەتەکەیدا ئەنجامی داوە، هەروەك بیری ئیسلامی تراژیدیای یۆنانیش بەرپەرچ دەداتەوە، چونکە ئەو تراژیدیایە بەندە بە ململانێی خواوەندەکان لەگەڵ مرۆڤ یان پەرستشی پاڵەوانەکان یان شتانێکی تر کە لەگەڵ بنەرەتەکانی سروشتی ئازادبووی مرۆیی لەدەست کۆیلایەتی بۆ جگە لە خوا ناگونجێن، ئیسلام بەرپەرچی هەموویان دەداتەوە.

[1] - رحلة الأدب العربي إلى أوروبا للشوبائي.

# باسی پێنجەم

# بانگەواز بۆ عامیەت

یەکێك لە بانگەوازە مەترسیدارەکانی بازنەی پیلانەکانی داگیرکەر و ڕۆژئاواگەری بریتیە لە هەوڵدان بۆ سەپاندنی شێوەزارە ناوچەییەکان لە وڵاتانی ئیسلامیدا لە بری زمانی فەصیحی عەرەبی، لەبەرئەوەی ئەو شێوەزارانە فەرهەنگ و ئەدەبێکیان هەڵنەگرتووە، بۆیە هەوڵ دراوە بە بڕێك پەندو وتەی دیاری ئەملاولا شتێکیان بۆ دروست بکرێتو بە فەرهەنگ دابنرێت تا گەلانی پێ لەخشتە بەرن، ئەو بانگەوازە پووچەش جەختکردنەوەیە لەوەی زمانی ناو خەڵك شێوەزارێکی عەرەبی نیە، بەڵکو زمانی سەربەخۆیە.

کاری ڕۆژهەڵاتناسانێ کە بانگەواز دەکەن بۆ زمانە ناوچەییەکان و ئاڵای ئەو بانگەوازەیان هەڵگرتووە کە ناویان ناوە زمانی قسەکردن(سبیتا–ویلمور–ویلکوکس) کۆکردنەوەی بڕێ وتەو پەندە کە لە ناوچەکان و نێو خەڵکدا هەن و بە فەرهەنگی ناوچەیی ناودەبرێن.

بەڵکو ویلکوکس لەوە زیاتر دەڕوات و بانگەشەی ئەوە دەکات زمانی ناوچەیی جیا و سەربەخۆیە لە زمانی عەرەبی و هیچ پەیوەندیەکی پێوە نیە.

ئەو ڕۆژنامانەی لە خزمەت قەڵەمڕەوی داگیرکەر و ڕۆژئاواگەریدا کاردەکەن هاندەری بەرهەمی زمانە ناوچەییەکان بو وەك چیرۆك و خەیاڵات تا بیکەنە پاڵپشتی ئەو بانگەشانە.

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە هێرشی دژ بە زمانی عەرەبی دەستی پێکرد و بێ بوونی بەڵگەیەك بڵاوبوویەوەو گەشەی سەند،

بانگەوازەکەش ئەوەبوو کە زمانی ناوچەیی سەرچاوەی هێزی داهێنانە و دواکەوتنی میصریەکان لەو بوارەدا دەگەڕێتەوە بۆ زمانی فەصیحی عەرەبی، ئەگەر ئەوان زمانێکی ناوچەییان هەبێت وەك ئەوەی بەریتانیا کردی ئەوا دەتوانن پێشکەون و سەرکەون و داهێنان بکەن.

ئەوەش بانگەوازێکی پووچو چنراو و سەرشێوێن بوو، بەڵام هەوڵی زۆر درا تا هێرش بکرێتە سەر زمانی عەرەبی، دواتر ویلموور هاتو میصریەکانی بانگ دەکرد تا بە پیتە لاتینیەکان بنووسن.

لە ڕۆژئاوادا ماسینیون بانگەوازی دەکرد بۆ نووسین بە پیتە لاتینیەکانو کولانو ەسانێکی تریش بوون شوێنکەوتەی، دواتر ئەو بانگەوازە جارێکی تر لەنێو دەرچوانی پەیمانگەکاندا سەریهەڵدایەوە، لەناو ئەوانەدا کە لە بەیرووت ئاڵای ئەو بانگەوازەیان هەڵگرتبوو، لە میصریش چەند هەوڵ درا کە دیارترینیان ئەوەبوو لوتفی سەید و قاسم ئەمین و سەلامە موسا و عەبدولعەزیز فەهمی بانگەوازیان بۆ دەکرد، ئەو هەوڵەی ڕۆژئاواگەری پیلانی بۆ دانابوو ئەوەبوو زمانی عەرەبی بخرێتە چاوپێکەوتنێکی مێژوویی لەگەڵ زمانی لاتینی مردووی ناو مۆزەخانەدا کە لەوەوە چەندین زانی جیاجیا دەرکەوتبوون.

هەمیشە باس لەوە دەکرا دەبێت زان بەردەوام گەشە بکات تا داواکانی خەڵك لە هەر سەردەمێکدا بێنێتەی، ئەمەش ئەوە دەخوازێت لەگەڵئاستە جیاجیاکانی خەڵکدا هەڵبکەیت و ڕێ ببڕیت، بۆیە لە سەردەمی نوێدا لە ئەورووپا هەوڵدرا تا هەموو دوو سەدە جارێك زانی نووسین لەکاربخرێت و پشت ببەسترێت بە زمانێکی نوێ یان نوێکراوە، هەمان نیاز بۆ زمانی عەرەبیش هەبوو، بێگومان ئامانجیش لەوە بریتی بوو لەوەی ئەو فەرهەنگە

گەورەیە بگۆڕدرێت کە لەپێش هەمویانوە قورئان و فەرموودەکان و شەریعەتی ئیسلامی لەخۆدەگرت، بەوە دەیانویشت ئەوانە بگۆڕن بۆ شتانێکی مێژووی کە تەنها کەسانی تایبەتمەند کاریان لەسەر بکەن و تەنها لەرێی فەرهەنگەکانەوە بتوانیت بیانخوێنیتەوە، چونکە دووردەخرێتەوە لە زمانە نوێکە، زۆرێکیش هەبوو بەرامبەر بەو بیری بەرامبەر وەستاندنەی نێوان زمانی عەرەبی وزمانی لاتینی وەستان، چونکە زمانی لاتینی وەك زمانی گەل مردووە، بەڵکو ئەوەش ئەنجامی مەرگی گەلە، بەلام زمانی ئوممەتی ئیسلامی هێشتا نەمردووە، هەروەها زمانی لاتینی زمانی رەسەنی هەموو ئەورووپا نەبو، بەڵکو سالی و سکۆتی و جەرمانی هیندی هەبوو، وێڕای ئەوەی زمانی لاتینی زمانێکی ئەرستۆکراتی بوو کە تەنها هەڵبژاردەیەکی کەمینە بەکاریان دەهێنا و لە چینەکانی گشتی کۆمەڵگەدا رەگی دانەکوتابوو.[1]

بانگەواز بۆ زمانی ناوچەیی پێشوازیەکی راشکاوانەی لێ نەکرا تەنانەت لا ئەوانەش کە دوژمنی عەرەب وئیسلام بوون نەیاندەتوانی بەرگری بکەن لەو بانگەوازە، پرسیار دەکرا عەرەب چ زمانێکی ناوچەیی وەربگرێت، شێوەزاری شامی یان میصری یان عێراقی؟ ئەگەریش نیاز وابێت هەر ناوچەیەك شێوەزاری خۆی وەربگرێت ئەی بۆ نموونە لە میصردا چ جۆرێکی، شێوەزاری باکوری دەلتا یان ناوچەی صەعید یان قاهیرە؟

ئەوەشیان دەزانی کە لە هەموو جیهاندا هەر زمانێك شێوەزاری جەماوەری و شێوەزارێکی نووسینی هەیە، جیاوازی لە نێوان زمانی نووسین و زمانی قسەکردن لە زمانی عەرەبیشدا زۆر بەرتەسکە، هێندەی

[1] – مجلة المشرق، م٢٣، ساطع الحصري(آراء في اللغة والأدب).

ئەوە نیە کە لەنێوان زمانی ئینگلیزی و شێوەزارەکاندا هەیە، توێژەران قەبارەی ئەو زیانەیان ئەژمارد کرد ە عەرەب لەپشتگوێ خستنی زمانی فەصیحدا تووشی دەبێت بەتایبەت ئەوەی پەیوەستە بە فەرهەنگی چواردە سەدەی بیرو ئەدەب و زانست و شەریعەتی ئیسلامی، ئەوەشیان دەزانی بەربەستی بەردەم ئەو شالاوە تەنها قورئانە کە هەر لە دابەزینیەوە پەیوەستی زمانی عەرەبی بووە، موعجیزەیەکیشی دروست کردووە کە زمانەکانی تری سەرزەوی بۆیان نەبووە، ئەویش ئەوەیە کە عەرەبی بێ پێویست بوون بە فەرهەنگ توانای هەیە بەرهەمی سەدەکانی رابردوو بخوێنێتەوەو ئەگەر هەریەك لەو کەسە کۆنانە ئەمڕۆش زیندوو بوایە دەیتوانی لەگەڵ ئەم خەڵکەدا قسە بکات.[1]

راستیەك هەیە دەبێت بزانرێت، ئەویش ئەوەیە زمانی عەرەبی تەنها هی خودی عەرەبەکان نیە، بۆیە عەرەبەکان مافی ئەوەیان نیە بە ویستی خۆیان هەڵسوکەوتی پێوە بکەن، بەڵکو عەرەبی زمانی بیر و رۆشنبیری و ژیار و ئایینە، نزیکەی حەوت سەد ملیۆن کەس کاریان پێیەی، بۆیە عەرەبی زمانی هاوبەشی نێوان عەرەب و موسڵمانانەو نێوان موسڵمانان و مەسیحیەکان و رەگەزە جیاجیا و ئایینە جیاجیاکانە.

[1] - لەبەرئەوەی ئەم مەسەلەیە زیاتر پەیوەستە بە وردەکاری زمانی عەرەبی و ئەو جەنگەی لەدژی دەکرێت لەناو خودی عەرەبدا، بۆیە بە پێویستمان نەزانی ئەو وردەکاریە ناوچەییە دابنێینەوە، بەڵکو پوختەی بیرۆکەکەیان دانایەوە کە ئەویش بریتیە لەوەی مانەوەی زمانی عەرەبی فەصیح پێویستیەکی حەتمیە بۆ مانەوەی زیندوانەی بەرهەمی ئیسلامی هەر لە قورئان و سوننەت و نووسینی چواردە دەسەدی زانایان. وەرگێڕ.

# ئیسلام لە بەرنگاربوونەوەی فیکردا

یەکێك لەو هەڵە گەورانەی کە بەرەورووی ئیسلام دەکرێتەوە هەوڵی نەیارانی ئیسلامە بۆ پەیڕەوی واتاکانی ئایینەکانی تر بەسەر ئیسلامدا، لەکاتێکدا کە ئیسلام تەواو جیایە لەو بیروباوەڕانە کە توشی دەستکاریکردن و کەموکورتی بو، زۆربەی بیروباوەری ڕێبازەکان لێکچوون و لێکنزیك بونەوەیان هەیە و واتاکانیان لە زۆر شتدا بەیەك دەگەن، بۆیە توێژەرانێکی رۆژئاوایی کە جیاوازی لە واتاکانی ئیسلامدا دەبینین جیا لە ڕێبازەکانی تر ئەوەیان لەسەر سەخت دەبێت کە لێی تێبگەن، چونکە ئیسلام تەنها ئایینێك نیەو بەس، بەڵکو ڕێبازی ژیان‌و بەرنامەیەکی روونە کە گرنگی داوە بە هەمو لایەنێکی ژیانی تاك، نەریت‌و جووڵەی کۆمەڵایەتی‌و رەوشتی‌و یاسایی‌و ئایینی ڕێکخستووە، ڕێبازێکی ئەخلاقیە کە دنیا و ڕۆژی دوایی پێکەوە دەبەستێتەوە، عەقڵ‌و دڵ‌و زانست‌و کردار پێکەوە دەبەستێتەوە.

یەکخواپەرستی بنەڕەتی یەکەمی ئیسلامە، بزوێنەری یەکەمی بیری ئیسلامیە، بە رووی تێگەیشتنی ڕێبازێکی تەواوکەری کۆکەرەوەیە کە لایەنەکانی ناکۆکی ناهێڵێت، ئەو ململانێیە لەناودەبات کە لەنێوان زانست و ئایین‌و رۆحگەرایی و ماددیگەرایی و تاکگەری و کۆمەڵایەتی بووندا هەیە، شان‌و شکۆی مرۆڤ بەرز رادەگرێت و بە خەلیفەی سەرزەوی دادەنێت لەژێر ویستی خوادا.

لەئیسلامدا هەڵەی ریشەیی نیە، بەڵکو بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پاداشتی رۆژی دوایی هەیە، ئیسلام بەرپرسیارێتی هەر تاکێك تەنها لەسەر کاری خۆی دادەنێت، بێ وردبوونەوە لە رەنگ و شێوەو ئایینی مرۆڤ جەخت دەکاتەوە لە بەهاداربوونی مرۆڤ.

ئیسلام نەیاری بنەمای لاسایی کردنەوەو پاشکۆیەتیە، چونکە لاسایی کردنەوە رەسەنایەتی ناهێڵێت و پاشکۆیەتیش رێنادات بە مەریفەی حەقیقی، تەقلید دەچەسپێت بەسەر تازەو کۆنیشدا، هەروەك ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ جیاکردنەوەی نێوان مەعریفە کرۆکیەکان و مەعریفە ناکرۆکیەکان، داوا دەکات گرنگیو جەخت کردنەوە بۆ یەکەمیان بێت.

ئیسلام هەوڵیداوە شوێنکەوتوانی خۆی لە هەرجۆرە کاریگەریەکی بیانی رزگار بکات، موسڵمانان بانگ دەکات بۆ بێداری بەرامبەر ئەو جەنگە دەروونیەی کە ئامانجی ئەوەیە مەشخەڵە رەسەنەکانی بیروباوەڕ و بیر و مەزاجی دەروونییان بگۆڕێت.

دوژمنانی ئیسلام دەزانن تاکە رێگەی لێدانی ئیسلام بریتیە لە ورووژاندنی گومانو خستنەرووی بانگەوازە رووخێنەرەکان لەو رێیەداو دانانی برێ لێکدانەوەی نامۆ بە ئیسلام، بێگومان رێی پاراستنی بوونو قەوارەمانو پاراستنی بیروباوەڕو ئەو بنەڕەتانەی کە لەسەر یەکخواپەرستیو رەوشت دامەزراون لە گومانەکانی فەلسەفەی ماددیگەری تەنها یەك رێگەیە کە ئەویش پشتبەستنە بە قوران، چونکە قورئان توانای هەیە هەموو نەگونجانەکان چارەسەر بکات.

بیری رۆژئاوای ئەمڕۆ پێناوی بنیادنەر یان ئیجابی نابەخشێت بە موسڵمانان، بەڵکو سوورە لەسەر ئەوەی لە بازنەی لاوازی و دواکەوتەییاندا بیانێڵێتەوە، بەخششی ئەو بۆ موسڵمانان ململانێی رێبازە هزریەکانە تا لە بەهاکانیان دایانماڵێتو رێ نەدات بگەن بەو زنستە تەکنەلۆجیەی کە بەشدار بوون لە بنیادیداو تەواو پێویستیان پێیەی، ئەوان شتێ دەبەخشن کە پێویستیان پێی نەبێتو تاکە پێویستی ژیانیشیان لە شارستانیەتی

ڕۆژئاوادا دەگرنەوە لە موسڵمانان، یەکبوونی ڕۆشنبیری جیهانی تەنها واتای بریتیە لەچەند خانەیەکی وا کە لە پشتەوە دەمارگیری و کینەو بەکەمدانان دژ بە ڕۆشنبیرە مرۆییەکانی لەخۆگرتووە، واتا دروستەکەی بریتیە لە دەسەڵاتداری ڕۆشنبیری ڕۆژئاوایی‌و زاڵکردنی بەسەر شارستانیەتی گەلانی تردا بەتایبەت بەسەر بیرو ڕۆشنبیری ئیسلامیدا، خەباتی موسڵمانانیش ئەوە دوای ئەوە لەپێناو ئازادی بیری ئیسلامی لە دەست هەژموونی فەلسەفە نێردراوەکان‌و بیردۆزە ماددی و بتپەرستیەکان بەردەوام بووە، بیری ئیسلامی بەدرێژایی مێژووی خۆی خۆی ئەداوە بەدەست ئەو بیردۆزانەوەو ماوەیەکی دوورودرێژە بەرگری دەکات.

یەکێك لە بەخششە خراپەکانی بیری ڕۆژئاوا بریتیە لە دابەشکاری و جیاکاری نێوان بەهاکان بەگشتی و ئەخلاق لەلایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە جیاکاری نێوان سیاسەت و پەروەردە و کۆمەڵایەتی، مەترسیەکی گەورەی ڕێبازی نێردراوی ڕۆژئاوا ئەو دابەشکاریە ناتەواوەیە کە لەنێونا مرۆڤ و پێویستیەکانیدا دەیکات، دەبینیت زانایانێك لە دنیای خەیاڵدا لە مرۆڤ دەکۆڵنەوە، هەندێ دەبینیت دوور لە ئەخلاق لە مرۆڤ دەکۆڵنەوە، زانایانێك پێیان وایە ئەو جیاکردنەوەیە لە زانستە سروشتیەکاندا پێویست و بەسوودە، بەڵام لە زانستەکانی دەروونناسی و کۆمەڵایەتیدا ئەوە زۆر مەترسیدار و مەحاڵە چونکە مرۆڤەکان لە بازنەی کۆمەڵگەیەکدا دەژین و ئەو کۆمەڵگەش لەناو هەر مرۆڤێکدا وەك بەشێکی بنەرەتی ئەو مرۆڤە وایە، بۆیە ناکرێت پێ بەهای ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی جیا لە مرۆڤ سەرهەڵبدەن.

بێگومان پێویستە بیریرانی موسڵمان بە زمانی خۆیان و لە بازنەی بیرکردنەوەی خۆیاندا بیربکەنەوە تا لەو تاکە ڕێیەدا ڕێ ببڕن کە تیشکی یەکخواپەرستی و دادپەروەری لەبەردەمیاندا بۆی ڕۆشن کردوونەتەوە،

دەبێت موسڵمانان بزانن چۆن ئیسلام کۆتو بەندی قورسی ئیغریقی لەناوبرد و لە ڕێبازە کۆیلایەتیە بتپەرستیەکەی ڕزگاری کردن، ئەمڕۆش لەسەر موسڵمانانە کۆتی ماددیگەری سەردەمی نویێ بپچڕێننو ڕەسەن و بەدیل لەیەك جیابکەنەوە، هەمیشە بیریان بێت بانگەوازە ڕووخێنەرەکان کا دەکەن بۆ پێشکەشکردنی بەدیلێکی ساختەی بریقەدار بەرامبەر ئەو ڕەسەنایەتیەی کە هەیانە.

داخستنی عەقڵو دانانی بە تاکەڕێی گەڕانو توێژینەوە ڕێبازێکی ڕەسەنی ئیسلامی نیە، موسڵمانان دەبێت بیریان بێت دیاردەیەکی لێکهەڵوەشانی روون لە هەموو بیری نوێدا هەیە: لە ئەدەبو فەلسەفەو کۆمەڵایەتیدا، ئیسلام موسڵمانانی لە داروپەردووی بیری کۆن و بتپەرستیو هەڵەو ناتەواویەکانی ڕزگار کردووە، دەی ئەگەریش هەر تروسکاییەکی رووناکی لە بیری کۆندا هەبووبێت وەرگیراوی پەیامە ئاسمانیەکانە، ئیسلام سەرلەنوێ لە وێنەیەکی پرشنگداری خواپەرستیدا هەمووی دارشتوەتەوە، ئیتر جگە لەوە هەرچی بێت هیچ پێویستیەکمان پێی نیە، هەردەبێت جیاوازیەکی ڕون هەبێت لەنێوان چەمکی تایبەتمەندیو چەمکی جیاکردنەوەو دابەشکردنی بەهاکاندا.

تایبەتمەندی بەخششی زانستێکی دیاریکراو یان هونەرێکی دیاریکراوە کە لەوپەڕی توانای زیاتری وەرگرتنی ئەو بوارەدایە، بەڵام لە دیدی ئیسلامدا تایبەتمەندی ئەوکات دەبێت کە لە پلەی یەکەمدا لە بازنەی فراوانخوازی هەموو فیکردا بێتو ڕێنموونی وەرگرتن بێت یە یاساو نیشانەکانی، بەڵام جیاکردنەوەی ئەخلاق لە سیاسەت یان لە پەروەردە یان کەنارخستنی ئاین لە کۆمەڵگە یان دوورخستنەوەی ئەدەب لە فیکر یان عەرەبایەتی لە ئیسلام یان زمان لە قورئان، ئەمە پێی ناوترێت

تایبەتمەندی، بەڵکو لەناوبردنی ئەو واتای تەواوکاریەیە کە دیارترین بنەڕەتی بیری ئیسلامیەو وەك دیواری پتەوی بەردەم بانگەوازە رووخێنەرەکان‌و بیرە نێردراوەکانە بۆ ناو موسڵمانان.

جا ڕێبازی ئیسلامی لە مەعریفەدا لەسەر چەسپاوی و گەشەسەندن وپێشکەوتن لەسەر ئەو چەسپاویە راوەستاوە، بزانی گەشەسەندنیش لەو بازنەدا وەك هەر شتێکی ناو گەردوون وایە ە بنکەیەکی هەیە لەسەر ئەو بنکەیە دەجووڵێت و لێی جیانابێتەوە، لە ئیسلامدا برێ ئامانجی چەسپاوو پێناوی گۆڕاو هەن، خوا دەفەرموێت(فطرة الله التی فطر الناس علیها لا تبدیل لخلق الله).

بانگەواز بۆ تایبەتمەندی بەو جۆرەی ئەوان داوای دەکەن تەنها بانگەوازێکە بۆ پەرتکردن‌و دابەشکردنی یەك بەرەو بنەرەت، مەسەلەی دابەشکردنی چەمك‌و واتاکان لە بیری رۆژئاواییدا مۆرك و پێناوو بڕوبیانووی خۆی هەیە، چونکە بنەرەتە کۆنەکانی بیری رۆژئاوایی لەسەر ئەو بنەرەتە وەستاون کە بەهاکان لەیەك یابکەنەوە، بەتایبەت ئایین و کۆمەڵگە لەیەك جیابکەنەوە.

پاش ئەمە ئیتر ئەوەی بە (بیروباوەری جێماوە) ناودەبرێت‌و هەندێ نووسەر دەیڵێنەوەو سوورن لەسەری ئیتر چ واتایەکی هەیە؟ بەڵکو ئەوە وشەیەکە مەبەست پێی چاوپۆشیە لە بەهای ئایین‌و بەها ئیسلامیەکان، بێگومان بیروباوەڕە جێماوەکان دوو جۆرن: رەسەن‌و ساختە، بەگشتی‌و بێ تایبەتکردن مەبەست پێی ئەوەیە خەڵکانێك هەڵخەڵەتێنێت و وا وێنایان بۆ بکات کە هەموو بیروباوەڕە جێماوەکان ساختەو ناراستن، بەڵام لەراستیدا

بیروباوەڕە ڕەسەنەکان جیان لە بیروباوەڕە ساختەکان، بڕێ بیروباوەڕی ساختەی نوێ هەن کە ئەوانیش بەرهەمی بڕێ بیروباوەڕی جێماوەن.

ئێمە دەزانین کاتێ ئیسلام هات و حەقی هێنا بوو بە بەڵگە بەسەر بیروباوەڕە جێماوە ساختەکانداو ئەو ساختانەی ئاشکرا کردو لەسەر بنەمای پەیوەستی عەقڵ و دڵ هەموو ئەو ساختانەی تێکشکاند، ئێمە بە چەند پێناوێك بیروباوەڕە ڕەسەنەکان لە بیروباوەڕە ساختەکان جیا دەکەینەوە، بێگومان هەرچیەك کە دوژمنان پێشکەشمان دەکەن ساختەیە با چەندە جوانیش بخرێتەبەرچاو، هەرچیەکلەگەڵ فیترەت و ڕۆح و مۆرك‌و بەها ڕەسەنەکانماندا نەگونجێت ئەوە ساختەو وەرنەگیراوە.

ئیسلام و تایبەتمەندیەکانی یەکخواپەرستی‌و پێغەمبەرایەتی و قورئان‌و زیندووبوونەوەو پاداشتی ڕۆژی دوایی هیچ کات بەوجۆرەی بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری دەیانەوێت بیروباوەڕی جێماوە نین.

هاوارێك هەیە دەڵێت مرۆڤایەتی گەیشتوەتە لوتکە، جا ئایا مرۆڤایەتی بەراستی گەیشتووە بە باری ڕوشد و پێگەیشتن‌و ئیتر پێویستی بە ئایین نیە؟ ئایا ئەمە ڕاستە کە بانگەوازە ڕووخێنەرەکانی سەردەمی نوێ لەپێناو ڕزگاربوون لەدەست بەهاو پەیامەکانی پەیامە ئاسمانەیکان بانگەوازی بۆ دەکەن؟ لەکاتێکدا نەزانی و تاریکی هەرەشەن بۆ مرۆڤ و ئەو بەهایانەش هێزن بۆ بەرنگاربوونەوەی ستەم و سەرکەشی و خراپە، ئێمە سەبارەت بەو بەها نوێیانە پرسیار دەکەین کە وایانکردووە مرۆڤ پێویستی نەبێت بە ئایین و دەگەڕێین کەچی هیچی وامان دەست ناکەوێت، هەرچیەك مرۆڤایەتی لەم دوو سەدەیەی دواییدا پێشکەشی کردووە تەنها ئەو بەخششە ماددیانەن کە بڕێ خشۆشکوزەرانی ماڵ‌و نان و بەرگیان داوە بە

مرۆڤایەتی، بەڵام ئایا شارستانیەت پێشکەوتووە؟ یان ئایا زانست لە بواری دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقدا هیچ شتێکی نوێی پێشکەش کردووە؟ پاشان ئێمە دەزانین ئەو هەموو پێشکەوتنە ماددیە لەسەر حسابی دەروونی مرۆیی بووە تا بەرنەدات بە سەرکەوتنو ئەو پێشکەوتنەی ڕەسەنایەتیەی کە لەسەر هەریەك لە ڕۆح و ماددەش وەستاوە و عەقڵ و دڵ پێکەوە گۆدەکاتەوە.

مرۆڤ لە سایەی پێشکەوتنی ماددیدا زیاتر پێویستی بە ڕێنموونی ئایین هەیە، بانگەوازە ڕووخێنەرەکانی وەك بوونگەرایی و هیبیەت ئاستی ئەو مەترسیەمان بۆ دەخەنەروو کە هەڕەشەن و بەرەو نامۆیی و پەرتبوونی دەبەن.

مرۆڤ بە سروشتی پێکهاتەی خۆی کە لە نەفس و ماددە پێکهاتووە پێویستی هەیە بە ڕێنموویەك لە دەرەوەی خۆیەوە، پەیامێکی بون کە ڕێی ڕاستی نیشانی دەروونی مرۆیی دبات و پەیمانێکی خوایی کە مرۆڤایەتی بەرەو ڕووناکی و ڕۆشنی ڕێنموونی بکات.

پاشان هاواری ئەوانە بۆچیە کە هاوار دەکەن بۆ چاوخشاندنەوە بە هەموو شتە یەکلابوەکاندا؟ ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەو قسەیە ڕاستیەکە بە نیازێکی خراپ، ئێستا بتپەرستی بووە بە شتی یەکلاکراوەی نوێ، بەڵام مەبەستیان بە شتە یەکلاییەکان تەنها ئایینە کە پێیان وایە باوێکی ماوەیی بووەو سەردەمەکەی تەواو بووە، خەڵکی حەقی خۆیانە پرسیار بکەن مەبەستیان چ ئایینێکە؟ ئایا کاتێ بەگشتی ئەو بڕیارە لەسەر ئایین دەدەن شارەزای ئیسلام بوون و ئیسلامیان خوێندوەتەوە؟

بەراستی بڕێك شالآوی گەورە بەرەو رووی چەندین ئایین كراونەتەوە، هەندێ لەو هەڵمەتانە راستن چونكە ئەو ئایینانە بە تەئویل كردن بڕێ راستی خواپەرستییان تێپەڕاندون، بەلآم هەرچیەك لە رۆژئاوا ئاراستەی ئایینەكان دەكرێت ناكرێت بۆ ئیسلامیش قبووڵ بێت، چونكە ئیسلام جیایە لەوانی تر هەر لە رووی بەخششەكانی و مێژووەكەی و هەڵوێستی بەرامبەر بە مرۆڤ و زانست و ژیان، چونكە لە مەسەلەكانی زانست و مرۆڤ و ژیاندا زۆر ئیجابی و پێشكەوتووترە،تەنها شتێكیش كە هەموان بە شتی بێگومان و یەكلاكراوە لسەری بن بریتیە لە بڕوابوون بە خوای تاك و تەنهای بێ هاوەڵ كە نە لەكەس بووەو نە كەسی لێ دەبێت و هیچ هاوشانێكیشی نیە، ئیسلامیش تەواوكەری ئەو پەیامە ئاسمانیە بوو كە یەكدوای یەك دەهاتن، بورابوون بە ئیسلام و بە قورئان كە كتێبی دابەزیوی خوایە و كۆتای پەیامەكانی خوایەو بڕوابوون بە فریشتەكان و رۆژی دوایی و پێغەمبەران و زیندووبوونەوەو پاداشت وەرگرتنەوە، هەموو ئەوانە ئەو شتە یەكلاییانەن كە ئایین بە تەواوەتی و رەهایی دایناون، ئایا ئەمانە هی ئەوەن جێی گومان یان سەرلەنوێ چاوپیاخشاندنەوە بن؟؟!

ئەوانەی هاواری ئەو چاوپیاخشاندنەوەیە دەكەن مەبەستیانە راستی خۆیان رابگەیەنن، جگە لەو راستیانە ئەوا ئێمە داوا دەكەین چاوخشاندنەوە هەبێت لەو شتە یەكلاكراوە پووچانەدا كە دوژمنانی ئیسلام هەوڵ دەدەن بیانسەپێنن و بانگەوازی بۆ دەكەن و ساختەی بۆ دەكەن وەك علمانیەت و بیردۆزەی ماددیگەری و بوونگەرایی و تاكگەرایی و چەندینی تر، ئەوانە ئەو یەكلاكراوە ساختانەن كە پێویستییان هەیە بە چاوپێداخشاندنەوە.

# ئاسۆی لێکۆڵینەوەکە

بۆ ئەوەی ئاستی جیاوازی قووڵی نێوان بەخششەکانی ئیسلام و بەخششەکانی بیردۆزە فەلسەفیەکانی بوارەکانی بیروباوەڕ و دەروونناسی و کۆمەلآیەتی و ئەخلاق بزانین، پێویستە ئەم ڕاستیانەی خوارەوە باس بکەین:

**یەکەم:**

ئیسلام بوو عەقلّ و دەروون و مرۆڤایەتی لە بتپەرستی و جگە لەخوا پەرستی رزگارکرد، بیر و توانا و کاری ئازاد کرد و بەرزراگیری ویژدانگەرا و عەقلآنیەکانی بەرپەرچ دایەوەو بڕیاری ئەوەی دا دیارترین پەیامی ئیسلام لێکچوون‌و گونجانی نێوان بیروباوەڕ و کردار و وتەو رەفتارە.

**دووەم:**

ئیسلام دانی ناوە بە ویست و سۆزی مرۆڤدا، بۆیە بڕیاری ئەوەی داوە مرۆڤ چەندین ویست و حەز و سۆزی جۆراوجۆری هەیە و هەموویشیان غەریزەی سروشتین تیایدا کە فیترەتی رێی داوە تا لە خودی خۆی و جۆرێتی خۆیدا تەواوکاری بکات بۆ ئەو غەریزانە.

بانگەواز بۆ حەرامکردنی ئارەزووەکان و وەستاندنی رەوتی ئەو ئارەزووانە بە وەرزش لە پێش ئیسلامدا هۆکارێك بوو بۆ لەکارخستنی هێزی دەروونی مرۆیی، بەلآم ئیسلام نکووڵی کرد لە دوو رێگەی هەوڵدان بۆ رزگاری مرۆڤ کە بریتی بوون لە خۆگرتنەوەو بێڕەوشتی، ئیسلام چەند رێیەکی دانان بۆ پاککردنەوەی دەروون وەك پەرستشەکان و ڕۆژووگرتن، پاکراگرتنی دەروونیش بنەرەتێکی شارستانیەتی ئیسلامیە، مرۆڤ

لەسەریەتی لەدەست ویست و ئارەزووەکانی رزگار بێت و ملکەچی خوایان بکات.

**سێیەم:**

ئیسلام ئەو کەنارگرتنەی نیە کە دێر و پەرستگا مەسیحیەکان هەیانە، لە ئیسلامدا بانگەواز کردن بۆ رەهبانیەت بوونی نیە، بەڵکو بانگەوازی ئیسلام ئەوەیە(قل من حرم زینة الله التی أخرج لعبادە والطیبات من الرزق)، موسڵمان خۆیان نەداوە بەدەستەوەو بروابونیشیان بە قەزاو قەدەر واتای خۆبەدەستەوەدانیان نەبووە، بەڵکو پاڵنەری هەوڵ و کارو قوربانیدان بووە بە گیان لەپێناو ئەو حەقیقەتەی کە بڕوایان پێ هێناوەو وەریانگرتووە، بەڵام هەوڵی دژ بە غەیب بەو واتایەی نهێنیەکانی ماددە بدۆزنەوە و کارلێکەکانی ناو ماددە بزانن، ئەوا ئەوان تا ئەوپەڕی ڕێ چون، بەڵام ئەوان بڕوایان هەبووە بە خوا و خۆیان دوورگرتووە لە دەربڕینی وا وەك وتەی دژایەتی و لەڕووەوەستانی غەیب یان ململانێ یان ملکەچکردن و شکاندنی سروشت، هەموو ئەو دەستەواژانە لە ئیسلام قوڵ نین، ئیسلام بڕوای هەیە بە ملکەچکردنی سورشت نەك بە تەحەدداکردنی سروشت، بڕوای هەیە بە پێکگەیشتنی نەوەکان نەك ململانێی نەوەکان.

**چوارەم:**

ئیسلام رازی نیە بە بیردۆزەی گۆڕانی ئەخلاق بەپێی جیاوازی سەردەم و دۆخ و شوێنەکان، بڕوای نیە بە بیردۆزەی گەشەسەندنی رەهای جووڵاوی بۆشاییەکان و قبووڵی نیە عەقڵ پیرۆز راگرێ و وەك خودا سەیر بکرێت و نەیاری پەرستشی شتی پووچە.

چەمك و واتای ئەخلاق ناكۆكی بنەڕەتیمانە لەگەڵ فەلسەفە ماددیەكاندا، چەمك و واتای یەكخواپەرستی تایبەتمەندی و جیاوازی رەسەن و بنەرەتی ئێمەیە لەگەڵ فەلسەفە بتپەرستیەكاندا.

**پێنجەم:**

لە ئیسلامدا بەهیچ جۆرێك مرۆڤ خراپەویست نیە و بەرپرسیارێتی تاوانی پێشینەشی لەسەر نیە، هەڵەو تاوان لە بوونیدا ریشەیی نیە، ئەو دیدە گەشبینیەی كە هەیە ئیسلام قبووڵی ناكات.

ئیسلام پێی وایە رۆڤ سروشتی چاكەو خراپەشی تێدایە، بڕوابوونی بە خوا بەرپەرچی خراپە دەداتەوە، مرۆڤ كۆیلەی بۆبەجێماوەیی یان بارودۆخەكەی نیە، بەڵكو بە تێگەیشتن لە ئەرك و گرنگی خۆی دەتوانێت خۆی لە هەر هەڵەیەك رزگار بكات، هەموو میرات جێماوێ دەكرێت بگۆڕدرێت، ئەو بەجێماوانە یان كەشە دەروونیە مرۆییانە بەربەستی بەردەم رزگاربوون و گۆڕان نین.

**شەشەم:**

لە روانینی ئیسلامدا ئەخلاق بریتیە لە چەند یاسایەكی ئەخلاقی چەسپاو كە بەوە چاكە لە خراپەو حەڵاڵ لە حەرام جیادەكاتەوە، موسڵمان ئەو كارە بەچاك دەزانێت كە پەروەردگاری فەرمانی پێدەكات و بڕواشی بەوە هەیە ویستی خوا لە پشت یاساكانەوەیەو چاكە بە چاكەو خراپە بە خراپە دیاری دەكات.

**حەوتەم:**

دیارترین چەمك و واتای ئیسلام ئەوەیە کە هیچ جیاکاریەك نیە لەنێوان ئایین و ژیان و دنیا و ڕۆژی دوایی و ڕۆح و جەستەو واقیع و میسالدا، ئیسلام بەرپەرچی ئەو جیاکردنەوەی بەرە هزریەیە کە لەنێوان سیاسەت و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاییندا دەکرێت، جەخت دەکاتەوە لە مانەوەی هەموو لایەنەکان لە یەك ئاراستەدا کە بنەڕەەکەی بریتیە لە یەکبوونی دەروونی مرۆیی.

بەوەش زۆربەی ئەو هەڵانە نامێنن کە تووشی بیری هاوچەرخ و دەروونی مرۆیی دەبنەوە کە لە ڕاستیدا سەرچاوەی تەنگژەی نوێیی مرۆیین.

ئەو تەنگژەی ڕاراییەی کە ڕۆشنبیری موسڵمانی ئەمڕۆ بەدەستیەوە دەناڵێنێت دەگەڕێتەوە بۆ یەك بنەڕەت وسەرچاوە کە ئەویش بریتیە لەوەی بنەما و بەها بنەرەتیەکانی وازلێهێناوە.

دیارترین بنەرەت و پاڵپشتە بنەڕەتیەکانی بیری ئیسلامی بریتین لەو توانا بەردەوامەی بەرنگاربوونەوەی هەموو دوژمنکاریەك و دەرکەوتنی هێزی خۆحەشارداوی بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، چونکە تەنانەت لە سەختترین ماوەکانی لاوازی و توانای بەردەوامیدا بە درێژایی هەموو مێژوو بەرنگاری هەموو ئەو شتانە دەبێتەوە کە دژ بەچەمكو واتا و بەهاکانمان دادەنرێن.

**هەشتەم:**

ڕۆح و ڕێبازی ئیسلام کە ئەخلاق و شەریعەتیش پێکەوە کۆدەکاتەوە لە سایەی بیروباوەڕی یەکخواپەرستیدا دژ بە ڕێرەوی شارستانیەت ناوەستێت بەڵکو پاڵنەریەتی بەرەو ئامانجە باڵاکان، بەڵام لەگەڵ ئەو لادانە

نارەوایانەدا نەیارە کە ملهوڕی سەپاندوونی‌و لە پەیامی شارستانیەتدا بە واتا بانگەواز بۆ پێشکەوتن نین، لێرەوە دەکرێت بڵێین ئەوەی دەوترێت ئایین بە گشتی یان ئیسلام بە تایبەت دژ بە شارستانیەتە ئەوە قسەیەکی بەرپەرچ دراوەو وەرنەگیراوە، بەڵکو ئیسلام دژ بە ئەو لایەنەی بێڕەوشتی و ملهوڕی و بیردۆزە ماددیەیە کە بەشێك نیە لە شارستانیەت.

شارستانیەت بە واتای زانستی تەکنەلۆجی و پێشکەوتن لە پێناوەکانی ژیاندا لەگەڵ ئیسلامدا گونجاوە، بەڵام ناکۆکیەکە لە هەوڵی سەپاندنی ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیە بەسەر کۆمەڵگەدا کە لەسەر بنەرت‌و ڕێسای ئایینی حەق‌و بنەرتی ئەخلاق نەوەستاوە.

ناکۆکیەکە لەسەر خاڵێکی بنەڕەتیە کە ئایا ئەخلاق جێگیرە یان گۆڕاوە؟ ئیسلام دەڵێت چەسپاوەو پەیوەستە بە مرۆڤەوە و مرۆڤ بریتیە لە رۆح و ماددەش نەك تەنها ماددە بێت.

ئەگەر واتای شارستانیەت ئەوە بێت ئەوە ئیسلام ئەو واتایەی رۆژئاوای پێ قبوڵ نیەو پێی وایە ئەوە ئەو ڕێبازە نیە کە مرۆڤ بەرەو پێکشەوتنی حەقیقی ببات، ئیسلام پێی وایە هەر شارستانیەتێك جەخت نەکاتەوە لە چاکەو دادپەروەری ئەوە شارستانیەتێکی ساختەو نارەوایە.

شارستانیەتی ئیسلام ئامانجیەتی دەروونی مرۆیی پێشڕەوی پێ بکات‌و لە کۆتی ئارەزووبازی رزگاری بکات تا بیکاتە خاوەن ئامانجی خواپەرستی‌و مۆرکێکی مرۆیی پێ بدات کە لەپێناو خوادا کار بکات‌و هەموان بەرەو چاکە ئاراستە بکات.

ئیسلام دان دەنێت بە بنەمای پێشکەوتندا و مرۆڤ بەرەو بڕێ ئامانجی مەدەنی ئاراستە دەکات کە تا ئەمڕۆ پێی نەگەیشتووە.

**نۆیەم:**

ئیسلام بڕوای وایە بوونی مرۆیی بڕێ سوننەت و ڕێسای نەگۆڕهەن و بەردەوامیش لەسەر سیستمی خۆی کارایە.

**دەیەم:**

ئیسلام ڕازی نیە بەوەی ئایین لە ناوچەی ژیانی کۆمەڵایەتی دوور بخرێتەوە، بەڵکو پێی وایە ئایین پێویستە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی، ئیسلام بیروباوەڕو شەریعەت و ئەخلاق پێکەوە کۆدەکاتەوەو پەیوەندی نێوان خوا و مرۆڤ و پەیوەندی نێوان مرۆڤ و هەموو کۆمەڵگە پێکەوە ڕێکدەخات.

لێرەوە ئیسلام بەرنامەیەکی تەواوکاری داناوە بۆ ئەو هێڵە گشتیانەی کە ڕەفتاری مرۆیی لەژیاندا بەرامبەر بە خۆی‌و خەڵکانی تریش لەسەردامەزراوە، ئەم بەرنامەش نەرم و فراوان و لێبوردەیی هەیەو باری ناچاری و هەر ئەگەرێك قبول دەکات و لێبوردەیی هەیە بۆ هەڵە و ئامانجی لە ڕێسا و سنوورەکانی بریتیە لە پاراستنی خودی مرۆڤ و تواناو کەسایەتی مرۆیی.

ئیسلام ڕۆح و جەستەو عەقڵ و دڵ پێکەوە کۆدەکاتەوەو دان دەنێت بە ئارەزووەکانی مرۆڤ و پێویستیە سروشتیەکانیدا و ڕێی پێ دەدات لە سنوری پاراستنی قەوارەی خۆیدا ئەو ویست و پێویستیانە پەیڕەو بکات بێ ئەوە ببێتە هۆی دوژمنکاری و دەستدرێژی بۆسەر کەسانی تر، پەیامی ئیسلام لە پەیوەستی نێوان ئایین و کۆمەڵگەدا وەك پەیامی ئەو بیروباوەڕانە نیە کە ئایین و کۆمەڵگە لەیەك جیادەکەنەوە.

**یانزەهەم:**

سروشتێکی ئیسلام بریتیە لە توانای ئیسلام بۆ کۆکردنەوەو گونجاندنی نێوان شتە لێکجیاکان بێ ئەوەی ببێتە لایەنگری لایەنێك یان لایەکیان سەربخات بەسەر ئەوی تردا، بەڵکو ئیسلام پاڵپشتی تاکگەرایی و کۆمەڵگەراییشە، ڕۆحگەرایی و ماددیگەراییش پێکەوە دەبەستێتەوە، دەروون و عەقڵی مرۆییش لەخۆدەگرێت.

ئیسلام چەسپاو و بزاوت پێکەوە کۆدەکاتەوە، بزاوت لە بازنەو چوارچێوەی چەسپاودا دادەنێت، لەهەمان کاتدا دەمارگیری قبووڵ نیە، ڕازی نیە بە ئازادی بێ سنوور، دەرفەت دەدات بە ویست و ئارەزووەکان تا ڕێ ببڕن بەرەو بەدیهاتن، بەڵام بڕێ ڕێسای بۆ داناوە کە لە خراپەو بێڕەوشتی دەیپارێزێت.

ئیسلام دژی ڕەهبانیەتو دنیانەویستیە، لە هەمان کاتدا دژی زێدەڕەوی و دنیاپەرستیە.

ئیسلام داوا دەکات لە موسڵمانان تا بجووڵێن و پێناوو هۆکارەکانی ژیانیان بگۆڕن و لە بازنەی بەها و بنەماکانیاندا بێ قوربانیدان بەو بەهاو بنەمایانە هەموو شتێکی نوێ وەربگرن.

**دوانزەهەم:**

دەبێت جیاوازی بکرێت لەنێوان بیروباوەڕ بە بنەرەتە فراوانیەکانیەوە لەگەڵ چالاکی پەیڕەو لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، هەروەها جیاوازی بکرێت لەنێوان قۆناغەکانی هێز و لاوازیدا، بنەما بنەڕەتیەکانی ئیسلام بەردەوام شیاوی پەیڕەون، چونکە نموونەی باڵای ڕەسەنایەتیو واقیعی بوونو لێبوردەیینو تەواو لەگەڵ فیترەتدا دەگونجێنو لەگەڵ سورشتی مرۆییدان.

بێگومان وەستانی و زاڵبوونی ڕێبازەکانی تر بەسەریدا لەم سەردەمەدا بارێکی لاوازی موسڵمانان‌و دەستەوسانیانە لە بەجێگەیاندنی بەرنامەو ڕێبازیاندا، ئەم بارە کاتیەش تووشی هەر گەلێك دەبێت و تەواو دەبێت، دواتر بێداریخوازی هۆکاری بەرێکردنی ئەو لاوازیەیە، بنەماکانی ئیسلام نەرمونیانی و لێبوردەییەکیان هەیە کە بۆ هەموو کۆمەڵگەی مرۆیی شیاون، ئیسلام ڕاسترین چارەسەر بۆ کێشەکانی مرۆڤ پێشکەش دەکات، ئەویش لەرێی بڕوابوون بە خوا و ئەخلاق و بوونی بەرپرسیارێتی تاکەکەسی لە سایەی بڕوابوون بە زیندووبوونەوەی ڕۆژی دوایی و پاداشت وەرگرتنەوە.

بێگومان ڕۆژدوای ڕۆژ مەترسی ئەو لادانە دەردەکەوێت کە تووشی مرۆڤایەتی بووە، بەردەوام هاواری ئەو ناڵەیە بەرزەدەبێتەوە کە پێی دەوترێت تەنگژەی نوێی مرۆڤ، ئەوان دان دەنێن بە تەنگژەکەداو نەیانتوانیوە چارەسەری بکەن، ئیسلام چەندین ڕێی نوێی بۆ داناون کە بریتیە لە دەرفەتی نوێ، دواجاریش دوای چەندین هەوڵ تەنها ڕێبازی ئیسلامیان دەست دەکەوێت، ئەویش ئەو ڕێبازی فیترەتەیە کە لای خواوە دابەزیوە.

**سیانزەهەم:**

بێگومان ئەو قسەی دەڵێت بڕوابوون بە قەزاو قەدەری خوا ڕێی پاڵدانەوەو پشتوێن لێکردنەوەیە لە بنەڕەتدا بانگەشەیەکی ناتەواوو لێکهەڵوەشاوە، چونکە بڕوابوون بە قەزاو قەدەری خوا بەوجۆرەی لە ئایینە ئاسمانیەکاندا هاتووە ئەنجامەکانی بەسەر باوەڕداراندا داناوە نەك پێناوەکان، بۆیە موسڵمانان داوایان لێکراوە پێناوەکان بگرنەبەر و لەسەریان فەرزە هەوڵ بدەن، دواتر داوایان لێکراوە ئەنجامەکان جێبهێڵن بۆ خوای گەورەی کارسازی بوون کە تاك و تەنهایە، لێرەوە بڕوابوون بە

قەزاو قەدەر نهێنی گەورەیی موسڵمانە یەکەمینەکان بوو، چونکە ئەوان پێناویان گرتەبەر و هەموو هەوڵی خۆیان بۆ خستەگەڕ تا فەرمانی خوا بەجێبگەیەنن، ئیتر باکیان نەبووە لە ئەنجامە زیانبەخشە ئازاربەخشەکان و بە قەدەری خوا ڕازی بوون بۆیە هەردوو چاکەکەیان دەست دەکەوت، کاتێ هاوەڵێك دەچوو بۆ جیهادی ڕێی خوا باکی نەبوو ئایا دەرباز دەبێت یان دەمرێت.

ڕۆژگارێ خەڵکی تووشی تەمبەڵیو پشتوێن لێکردنەوە بوون کە پێچەوانەی واتای خۆی بیروباوەڕی قەزاوقەدەریان وەرگرت، بۆیە قەزاوقەدەریان بۆ پێناوەکان دەگرتەبەر، ئیتر لە ئەنجامەکاندا قەزاوقەدەریان لەبیرکرد و ڕازی نەبوون.

بێگومان بڕوابوون بە قەزاوقەدەر پاڵنەری موسڵمانان بوو بۆ پێشڕەویو بەرەو ڕوی مەترسیەکان هەنگاویان ناو نەترسان تا بازنەی خاکی ئیسلام فراوان بکەنو بەدرێژایی سەردەمان بەرگری لەو خاکەو بازنەی ئیسلام بکەن.

واتای حەقیقی ڕوابوون بە قەزاو قەدەر بریتیە لەوەی تاك بڕوای هەبێت بەوەی خوای گەورە جیهانێکی دروست کردووە کە بەپێی سیستمێکی ورد ڕێ دەبرێت، تاك دەبێت بەپێی سروشتی ئەو بوونە ڕێ ببرێت، بۆیە ئەوەی ڕوای هەیە بە قەزاوقەدەر دەبێت بە گرنگی و بڕوابوونەوە کارەکەی بکات و ئەرکی نیە ئەنجامەکان بگرێتە ئەستۆ، چونکە ئەنجام لە قەزاوقەدەری خوایە، بیروباوەڕی نەمری ڕۆح لە گەورەترین ئەو پاڵپشتانە بوو کە موجاهیدانی هاندەدا بۆ مردن و ترس نەبوون لە مەرگو دنیاو خۆشیەکانی ژیانی دنیایان لا بچووك دەبوویەوە.

## چواردەهەم:

کاریگەری ئیسلام لە هەموو ئەو شۆڕشانەدا دیارە کە بۆ لەناوبردنی کۆتی بەندکردنی عەقڵ لەبیرکردنەوە سەریانهەڵداوە، ئەو شۆڕشانەی لەناوبەری ئەو بیرە بوون کە کۆمەڵێکی تایبەتیان دەسەپاند بۆ پاراستنی نهێنیەکان کە هەموو کاروبارەکانیان لەدەستدا بن.

بانگەوازی رزگارکردنی بیری مرۆیی لەبتپەرستی لە ئیسلامەوە سەریهەڵدا، بانگەواز بۆ ماف هەموو مرۆڤێکبۆ تێگەیشتن لە کتێبی خوا بێ بوونی هیچ بەربەستێك دووبارە بەرهەمی ئیسلام بوو، بەهۆی ئیسلامەوە تاکگەیشتە ئەوەی بێ هیچ پەیوەندو نێوەندێ پەیوەندی بکات بە خوای گەورەوە، بانگەواز بۆ رزگاربوون لە سەرکەشی و ستەم و ملکەچ نەکردن بۆ ستەمی ستەمکاران بەرهەمی ئیسلام بوو، بانگەواز بۆ رامان لە بوون و گەڕان بەدوای بەڵگەو نکوولی کردن لە پاشکۆیەتی و بەرپەرچدانەوەی شوێنکەوتەیی باتڵ و ناراستی و رزگاربوون لە بیروباوەڕی باوباپیران بەرهەمی ئیسلام بوو.

لە پەیامی قورئانەوە مرۆڤایەتی لەرووی شارستانیەوە رزگاری بوو لەو کۆیلایەتیەی کە زاڵبوو بەسەر هەموو ژیارە کۆنەکانی فیرعەونی و فارسی و رۆمانیدا، مرۆڤ لەو ژیارانەدا ببوو بە کۆیلەی ژمارەیەکی گەمی فەرمانڕەوا، بەهۆی ئیسلام و قورئانەوە مرۆڤایەتی لە رێبازی رامانی نەزەریەوە چوو بەرەو رێبازی ئەزموونی و ملکەچکردنی کاروبارەکان بۆ توێژینەوەی زانستی.

لە پەیامی قورئاندا بانگەواز بۆ پێوانەکانی بروابوون بە خوا و بەرزتردانانیان لەسەر پێوانەکانی دەمارگیری و رەگەزپەرستی دەرکەوت،

کۆمەڵێك دروست بوو کە پەیوەندی هزرو بیروباوەڕ لە بری خوێن و رەگەز پێکەوەیان دەبەستێت.

لە مەنتیقی قورئانەوە مرۆڤ لەو مەترسیانە رزگار بوو کە لە گەڕان بەدوای خواو بوون و مەرگ و زیندووبوونەوەدا توشی دەبوو، ئیسلام رێبازێکی تەواوکاری پێشکەش کرد کە عەقڵ ناتوانێت پێی بگات، بەڵام دەتوانێت لێی تێبگات،بەمەش زۆربەی ئەو پرسانە چارەسەر بوون کە چەندین سەدە بوو سەرچاوەی ناکۆکی و راجیایی بوون.

**پانزەهەم:**

ناکرێت بە باری مێژوویی یان بەتەنها مەسەلەی ئابووری لێکدانەوە بۆ مێژووی ئیسلامی بکرێت، برێ هۆکاری جیاجیا هەبون کە زاڵ بون بەسەر مێژووی گەلاندا، هەندێکیان ماددی نەبون، مێژووی ئیسلام چەندین هۆکار زاڵ بوە بەسەریدا، لەوانە هۆکاری دەروونیو رۆحی.

**شانزەهەم:**

زانست نەیتوانیوە راڤەیەکی تەواو و کۆتایی بۆ هەموو شتکان پێشکەش بکات، لە ئیسلامدا نەگونجانی نێوان زانست و ئیمان نیە، موسڵمان لە دەستکەوتەکانی زانستدا شتێکی نەگونجاو لەگەڵ زانست بەدی ناکات، بیری رۆژئاوایی جیاکاری دەکات لەنێوان دیدی ئایینی و دیدی عەقڵیو زانستیدا.

**حەڤدەهەم:**

خەباتی نیشتیمانی پێش ئەوەی لەژێر ئاڵای نیشتیماندا بێت لەژێر ئاڵای جیهادی رێی خوادا بووە، لە زۆربەی خەباتەکاندا ئیسلام هێمای

بەرگریکاری ڕۆحی بووە دژ بە داگیرکەر و کۆیلەگیری داگیرکەر، زامنیش بۆ بەردەوامی یەکبوونی زمان و ڕۆشنبیریش بووە، هەموو ئەو بەها پاکانەی لەخۆگرتووە کە لەسایەی داگیرکەردا نەبون.[1]

**هەژدەهەم:**

بزاڤ یاسایەکی ئەم بوونەیە، بەڵام هیچ بزاوتێك نیە دوور بێت لە هەموو کۆتێك‌و هیچ ڕێسا و سیستمێکی نەبێت، لەبەرئەوەی هەمو هەسارەیەك خولگەو بازنەیەکی خۆی هەیە بۆیە ژیانی مرۆییش هەروایەو هەر دەبێت بازنەیەکی چەسپاوی هەبێت و بازنەیەك هەبێت تیایدا بخولێتەوە، ئەگەرنا پشێوی لێدەکەوێتەوە.

**نۆزدەهەم:**

جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت بەرهەمێکی نێردراوی نامۆیەو بەخششی بیروباوەڕی ئەورووپیەلە مەیدانی ململانێی ناو مێژووی دوورودرێژی خۆیدا، ئەوەش بەخششی ئیسلام نیە، بەڵکو ئیسلام لە تەواوکاری‌و پەیوەستی بەهاکاندا هێندە بەخششی هەیە کە ئایین‌و دەوڵەتیش بەتەواوی ڕاگرێت، ئیسلام ئایین و ڕێبازی ژیان و شەریعەت‌و ڕەوشتیشە.

مەسەلەی جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت لەڕۆژئاوادا ئامانجێکی قووڵی ئایدۆلۆجیای تلموودی بوو کاتێ پەیوەندی نێوان کلێساو حکوومەت بەریەستی بەردەم جوولەکەو تێکەڵبوونیان بوو لەگەڵ کۆمەڵگەکاندا، کاتێك ئەو کۆتە نەما دەستیان گرت بەسەر هەموو دەزگاکانداو قەڵەمڕەوی خۆیان سەپاند بەسەریدا.

---

[1] – عن نص لروجية غارودي.

مەسیحیەت بە سروشتی خۆی ڕێبازێکە لەسەر پەرستش و راسپاردەی رەوشتی وەستاوە نەك ئەوەی شەریعەتێك بێت، چونکە پەیامێك بوو بۆ بەنی ئیسرائیل وەك راستدانەری تەورات و تەواوکەری پەیامەکەی نەك نکوولی کەر لە تەورات،بیریارانی رۆژئاوا دانیان ناوە بەوەدا کە ئیسلام سیستمێکی تەواوەو جیاوازیە زۆرەکانی نێوان ئیسلامو ئایینو بیروباوەڕەکانی تریان لەبەرچاوگرتووە.

دەربڕینەکەی جب هاملتو لەو بارەوە روون و راشکاوە(ئیسلام تەنها واتای ئایینێك ینەو بەس، بەڵکو کۆمەڵگەیەکی پێکەیشتوی تەواو کاملە کەلەسەر بنەمایەکی ئایینی دامەزراوەو هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆی لەخۆدەگرێت چونکە لەسەرەتاوە بارودۆخەکەی وای دەخواست سیاسەتو ئایین پەیوەستی یەك بن، دارشتنی قانوونی ئیسلامی و سیستمی کۆمەڵایەتی جەختکردنەوەیە لەو دیدە رەسەنە، لە راستیشدا ئیسلام تەنها سیستمێکی بیروباوەڕو پەرستش نیە، بەڵکو زۆر لەوە گەورەترەو شارستانیەتێکی تەواوە.

ئەو تایبەتمەندیەی ئیسلام کە وایکردووە سیستمێکی کامل بێت ئەوەیە کە برێ بنەما و بنەڕەتی چەسپاوی لە بواری راوێر و دادپەروەری و یەکسانیدا پێشکەش کردووە کە گونجاوە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی پەیوەست و گەشەدانیش جێدەهێڵێت بۆ مرۆڤایەتی، ئەمەش بەپێی جیاوازی سەردەم و بارودۆخەکە دەرفەت دەدات لەبازنەی ئەو بنەرەتانەدا گۆڕانی خۆی بکات، هەر ئەمەیە ناهێڵێت چەقبەستوویی‌و نەگونجان هاودەم بە گۆڕانی کۆمەڵگەکان هەبێت، بەڵام ئەو بنەرەتانە هەر ئەبێت چەسپاو بن و نەگۆڕێن‌و هەرگیزیش ملکەچی گۆڕانی کۆمەڵگەکان نابن،

لەوانە سزای خوا بۆ زیناکار و سووخواردن و مەی و دزی، ئەوانە بنەرەتگەلێکی رەسەنن نەك ئامۆژگاری گشتی یان رەوشتی.

**بیستەم:**

لە پەیامی ئیسلامدا ئازادی ئەوەیە مرۆڤ کۆیلەی ئارەزووەکانی نەبێت‌و بەندەی جگە لە خوا نەبێت و ملکەچی هیچ دەسەلاتێك نەبێت دەسەلاتی خوا نەبێت، نەبێتە کۆیلەی مرۆڤ، ئازادی لە ئیسلامدا ئازادیەکی کۆکاری گشتگیرە کە لەسەر رزگاربوون لە کۆتی نەزانی و خورافەو بتپەرستی و تەقلید وەستاوە، ئیسلام پێش هەموان بانگەواز دەکات بۆ ئەو ئازادیە، ئیسلام مرۆڤی فێرکرد چۆن ئازادی بیر لەگەڵ راوەستاوی ئاییندا بگونجێت.

ئیسلام بەم چەمك‌و واتایەی توانی بیری مرۆیی لەو کۆتانە رزگار بکات کە لە پەرستگاکان و لەبەردەستی کاهینەکاندا پێیان کۆت ببوو، بەوە چوویە ئاستی بەرزی بڕوابوون بە ژیانێك ڕپاش ئەم ژیانە.

ئەگەر هاواری شوێنکەوتوانی رێبازی ماددیگەری بۆی رزگارکردنی بیروهزر بوو لە هەموو نەریت و ئەفسانەیەکی جێماو، ئەوا مەبەستی ئەو داروپەردوە جێماوەیە کە ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا تیایدا دەژیا، بەلام ئیسلام خۆی خاوەنی بانگەوازی ئازادی بووە، ئەوەشی باسی کردووە لەسەروو ئەفسانەو نەریتەکانەوەیە، چونکە ئیسلام ئەو راستیەیە کە دەروون و عەقڵو فیترەتی ساغی مرۆیی پێی ئارام دەگرێت.

ئیسلام ئەو راستیەیە کە جگە لەو راستیەکی تر نیە، خوا دەفەرموێت(قل ماذا بعد الحق إلأا الضلال)، (بڵێ دوای حەق جگە لە گومڕایی چی تر هەبێت)، ئیسلام حەقی بە شێوەیەکی گشتی گشتگیر

ناساندووە بۆ موسڵمان و ناموسڵمانیش، لەکاتێکدا ڕۆژئاوا حەقی بەوە ناساندووە کە لەئەورووپا هەیە، ئەوەی لە داگیرکەکان هەیە جیایە بەڵکو نەگونجاوە لەگەڵ ئەو ڕاستیەی تردا، لێرەوە هەڵوێستی بیری ڕۆژئاویی سەبارەت بە موسڵمانان و ئیسلام هەڵوێستی دوژمنایەتی‌و دەرچوون لە حەق‌و خۆگێلکردنە لەوەی کە بە ڕێبازی زانستی بۆ توێژینەوە ناوی دەبرێت.

موسڵمانان لە پەیڕەوی ئازادی بیردا بەرامبەر هەموو خەڵك ڕاست بوون و ئەو بنەما بنەڕەتیەیان پاراستووە کە دەفەرموێت هیچ زۆرکردنێك لە ئاییندارییدا نیە، وەك سزای جیاوازی هزری خوێنی یەك کەسیشیان نەڕشتووە لەبەرئەوەی تەنها ڕایەکی جیا لە ڕای ئیسلامی هەبووبێت، مەگەر ئەوەی ئەو کەسەی ئەو قسەی کردووە پەیوەندی هەبووبێت بە ناپاکی سیاسیەوە.

ئیسلام وەك ئەوەی بانگەواز دەکات بۆ ڕزگارکردنی بیر بانگەواز دەکات بۆ ڕزگارکردنی جەستەش، ئیسلام ئەو ئایینەیە کە بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی هەنگاوی نا تا سیستمی کۆیلایەتی ناو ئیمپراتۆریەتەکانی فارس و ڕۆم و فیرعەونی نەهێڵێت.

### بیست و یەکەم:

دیارترین بەخششی ئیسلام توانای ژیان بوو لەگەڵ شارستانیت‌و ڕۆشنبیریە جیاجیاکانداو بەردەوامبوونی لە سەردەم‌و بارودۆخە جیاجیاکاندا، ئیسلام توانای هەیە بزاڤی ڕاستکردنەوەی ناوخۆیی هەبێت‌و وەڵامی گومانەکان بداتەوەو مۆرکی مرۆیی و بنەڕەتی خواپەرستی خۆی بە بەردەوامی بپارێزێت.

ئیسلام توانای فراوانخوازی و کرانەوە بەرووی ئاسۆکانی هەیەو دەتوانێت بچێتە ناوچە نوێکانی سەرزەوی بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی خۆی.

تایبەتمەندی ئیسلام لە گشتگیری و کاملبوونیدا ئەوەیە کە ئازادیەکان‌و ڕێساکانی ڕێکخستووە، تاکگەرایی و کۆمەڵبوون و زانست و ئایین‌و عەقڵانیەت‌و ویژدان و ڕۆح و ماددە و سرووش و عقڵ و دنیاو دوارۆژو غەیب‌و بینراو و جێگیر و گۆڕاو و ڕابردووو ئێستاو پارێزگاری و نوێگەری‌و ئیسلام‌و مرۆڤایەتی بەیەکەوە کۆکردوەتەوە، ئەمە ئەو تایبەتمەندیەی ئیسلامە کە جیای دەکاتەوە لە هەموو بیروباوەڕو ئایینەکان.

ئەوە سەرچاوەی توانای باڵایەتی لە بەرنگاربوونەوەی هەموو هەڕەشەو مەترسیەکاندا، ئەمەیە هۆکاری نەمری ئیسلام بە درێژایی سەردەمەکان.

# ناوەرۆك

